

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات

خاوەنی ئیمتیاز
پرۆفیسۆر د. نەرسن موسا رەشید

سەرنوسەر
د. محەمەد عەبدوڵلا کاکەسوور
٤٧٨٠٥٣٨

سکرتێری نووسین
م. فارس قادر فەقێ عەبدوڵلا

دەستەی نوسەران
پ.ی.د. دلێر ئەحمەد (زانکۆی سلێمانی)
پ.ی.د. ئەبەز مەجید
پ.ی.د. موسا مستەفا (زانکۆی دهۆک)
پ.ی.د. سەلام حەسەن خۆشناو (زانکۆی سەلاحەددین)
پ.ی.د. ئەحمەد عەبدولعەزیز مەحمود (زانکۆی سەلاحەددین)
د. حەکیم ئەحمەد مام بەکر(زانکۆی سەلاحەددین)
د. نیشتمان بەشیر محەمەد (زانکۆی سەلاحەددین)
د. فەرسەت مەرعی(زانکۆی دهۆک)
د. ئاکۆبرهان محەمەد (زانکۆی کۆیە)

بەرگ ونەخشەساز
هیمداد محەمەد ئەرگوشی

ژمارە (١٠) سالی سێیەم بەهاری ٢٠٠٩




**راوێژکاران**

پ.د.جەبار قادر(زانکۆی کۆیە)

پ.د. حەسەن جاف

پ.ی.د. حوسامەدین عەلی نەقشبەندی (زانکۆی سلێمانی)

د.شەوکەت عارف(زانکۆی دهۆک)

د.ئیسماعیل حەساف(زانکۆی سەلاحەددین)

♦ گۆڤار : مێژوو

♦ ژمارە : [ ١٠ ]

♦ تیراژ : [ ٧٠٠ ] دانە

♦ چاپخانە : منارە

کوردستان / هەولێر - نزیک دەستەی وەبەرهێنان - کۆڵانی ٥١ - گەڕەکی ٢٠٤ منارە

کۆڵانی بەرامبەر بانکی کرێدیتی عێراقی

g.mezhu@yahoo.com

g.mezhu@hotmail.com

# پێڕست

## ✓ سەروتار  ئامانجمان گەیشتنە بەڕاستی

✔ القسم العربي



✔ کەشکۆڵی گۆڤار

# ئامانجمان گەیشتنە بەڕاستی

سەرنوسەر

ئەمە ژمار (١٠)ی گۆڤاری مێژووە. دەمانەوێ ئاماژە بەوە بکەین کە هەموو ئەو بابەتانەی لەم گۆڤارەدا بلآودەبنەوە، مەرج نییە بەتەواوی ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی ستافی گۆڤارەکە بێت، بەڵکو لە چوارچێوەی بڕوابوون بە ڕاو ڕای بەرامبەر ڕێگا بە ڕاو ڕای بەرامبەر دەدەین بەمەبەستی گەیشتن بەڕاستی. چونکە گەیشتن بەڕاستی خۆی لەخۆیدا کارێکی ئاسان نییە. بەڵکو پێویستی بە خوێندنەوەو گەڕان و بیرکردنەوەو بەراوردکن و شیکردنەوە....تد هەیە. گەیشتن بەڕاستی بەیەك قۆناغیش نابێ بەڵکو پێویستی بە پشوو درێژی هەیە.

لە بواری مێژوودا بەشێوەیەکی وردتر مێژووی کورددا چەندین پرسیاری گرنگ هەن کە نووسەران و مێژوونووسان و مێژووناسان هەریەکە بەگوێرەی تێگەیشتن و ڕۆشنبیری خۆی هەوڵی وەلآمدانەوەیان داون. لەهەمان کاتدا نابێ گرنگی پرسیارکردنیش لەبواری مێژوو بەگشتی و مێژووی کورد بەتایبەتی فەرامۆش بکەین. هەندێ پرسیار گرنگیان لەهەندێ وەلآم پترە، دیارە

پرسیاری نـوێش وەڵامـی نـوێ ی بـەدوادا دێـت، لەئەنجامیـشدا بـواری مێژوونووسـین دەوڵەمەنـدتر دەبـێ. بـەڵام لەهـەمان کاتـدا دەبێ بەرژەوەندییـە نەتەوەییـەکان لەبەرچـاو بگیرێـت. هەرچـەندە بەشـێوەیەکی گـشتی گەیـشتن بەڕاسـتییە مێژووییـەکان لەزۆربـەی کاتـدا لەگـەڵ بەرژەوەندییـە نەتەوەییەکانـدا یەکدەگرنـەوە. بـەڵام لەهـەمان کاتـدا واباشـە ئـەوە ڕەچـاو بکـەین کـە نەکەوینـە داوی ئـەوەی چەواشـەکردنی مێـژوو بـەڕا دابنـدرێت. هەڵـەکردن بـە بۆچوون بخوێندرێتەوە، کەموکوڕییـەکانی خۆمان بەهێرش کردنـە سـەر ئـەوی دی پـەردە پـۆش بکـەین. گـەورەیی خۆمـان لـە بچوککردنەوەو سوکایەتی کردن بەنەتـەوەو پەیڕەوکـەرانی ئایین و ئـاینزای جیـاواز ببەسـتینەوە. باهـەمووومان بـەدوای ڕاسـتییە مێژوووییەکاندا بگەڕێین، ئەگەر یـەکێك پرسیاری کرد بەباش گـوێ ی لێ بگـرین و لـەناو وەڵامەکانـدا باشـترینیان هەڵبـژێرین. کـاری دەستە جەمعی لەکاری تاکەکەسی باشترە. بەتایبەتی کە ئێستا ڕوون و ئاشـکرایە کـە هەنـدێك کـەس کـە بانگەشـەی خزمـەت کردنـی مێژووی کورد دەکەن، لەڕاستیدا ئەو مێژووە ئەتك دەکەن، بۆیـە لـە کۆتاییـدا دەڵـێین بابەیەکـەوە کـار بکـەین ئەگـەر ڕاسـت دەکـەین، چونکە بەڕاستی کارێکی ئاسان نییە گەیشتن بەڕاستی.

# بەڵێنماندا و وا جێبەجێی دەكەین

پ.د.ارسن موسی رشید

لـەكۆنگرەی یەكـەمی كۆمەڵـەی رۆشـنبیری مێـژوویی كوردسـتان لـە ٢٠٠٨/٤/٣ بەڵێنم دابوو كە كۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی كوردستان زنجیرە نامیلكەیەك لەسەر ناودارانی كورد بڵاوبكاتـەوە، لەپاڵ دەرچـوونی گۆڤـاری مێژوو بە شێوەیەكی وەرزی بـەپێی توانا نامیلكـەو كتێبـیش بڵاوبكەینـەوە، چەند رۆژێـك پـێش دەرچـوونی ژمـارە (١٠)ی گۆڤـاری مێـژوو، ژمـارە (١)ی زنجیرەی ناودارانی كورد بەناونیشانی " صفاءالدین عیسی البندنیجی، حیاتـە وآثارە ١٢٠٣-١٢٨٣هـ/١٧٨٨-١٨٦٦ز" لە نووسینی پ.د.عماد عبدالسلام رؤوف چاوی بە رۆشنایی چاپدا هـەڵهات و كەوتـە نێـو كتێبخانـەی كـوردی و دیـدی خوێنـەران، بـە پـشتیوانی خـوای گـەورە چـەندین كتێبـی تـریش لـە ئەجێندای كۆمەڵەدایە كە زۆرترینیان دەربـارەی نـاودارانی كـوردە سـەرەڕای كتێبی دیكە دەربارەی مێژووی كورد بەگشتی.

لـەو كـۆڕو سـیمینارانەی كـە كۆمەڵـەی رۆشـنبیری مێـژوویی كوردسـتان ئەنجامی دەدات یان بەهاوبەشی لەگەڵ لایـەنی تـر پێـی هەڵدەسـتا زۆر جـار رووبەرووی ئەو پرسیارە دەبووینەوە، كە ئەگـەر برێـك لـەو نووسـینانەی كـە تایبەتن بە مێژووی كـورد بەشـێوەیەكی نازانـستیانە نووسـراون و لـە هەڵـەی مێژوویی بەدەر نین، دەبێ خوێنەر چۆن لە ڕاستییە مێژووییـەكان بگـات و چ جۆرە نووسینێك بخوێنێتەوە، لەوەلامـدا دەڵـێین، گۆڤـاری مێـژوو و زنجیـرە بڵاوكراوەكانی كۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی كوردستان بابـەتی خوێندنـەوەی سەرەكیتان بـێ بـۆ پەیـدا كردنـی رۆشـنبیری مێـژوویی هـەنگاوێكی چـالاك و

جیدییە بەو ئاراستەیەدا، چونکە بەشێوەیەکی زانستی نووسـراوون و خـەڵکی پسپۆڕ سەرپەرشتیان دەکەن.

لەم ڕووەوەش چەندین ناوی نوێ وەکو نـاودارانی کـورد بـە خوێنـەران دەناسێنین کە لەوانەیە پێشتر کەم کەس هەر ناوی بیستبن، لـە کاتێکدا کـە خزمەتی زۆریان بـە مێـژوو و شارسـتانیەتی کـورد کـردووە، بـەڵام لەکاتێکـدا ڕۆشنبیرانی کورد هەر ناویشیان نەزانن ئەوە بێگومان دەکرێ بڵـێین لەلایـەن کوردەوە هەقیان نەدراوەتێ .



# پرســیارێك

د.نیشتمان بەشیر محمد

نووســەری میـسری (جمــال الغیطـانی) لەكـەناڵی ئاسمـانی (دریـم ٢) بەرنامەیەك پێشكەش دەكات تیایدا سەردانی شوێنەكانی خـودا پەرستی لـە میـسر دەكـات و لـەڕووی مێـژوویی و هونەرییـەوە گرنگـی ئـەو شـوێنانە بەدیاردەخات، لەیەكێك لـە ئەلقـەكانی بەرنامەكـەدا سـەردانی پەرسـتگایەكی جووەكـانی كـرد لـە قـاهیرەی پایتــەختی میـسرو ئامـاژەی بـەوەدا كـە دە پەرستگای جوو لەقاهیرە ماوەتەوە. ئەمە لەكاتێكدا كە میسرییەكان چەندین شەڕیان لەگەڵ ئیسرائیلدا كردووە. لێرەدا پرسیارێكم لا دروست بـوو، بۆچـی لەهەولێری پایتەختی هەرێمی كوردستان كە ژمارەیەكی بەرچاو جووی تیـادا ژیاوەو پەرستگایان هەبووە، ئێستا تەنیا یەك پەرستگای ئەوان لـەم شـارەدا نەماوەتەوە لەكاتێكدا كە ئەمە بەشـێكە لـە مێـژوو و شارسـتانیەتی هـەولێر، هەروەها ئەم پرسیارە پرسیاری تریشی لێبووەوە، ئایا حكومەت پەرسـتگای جووەكانی تێك داوە یان خەڵك؟ ئایا ئەگەر یەكێك لەم دوولایەنـە كارەكـەیان كردووە بۆچی لایەنەكەی تر ڕێگای لێ نەگرتووە؟ دوایـی بـۆم دەركـەوت ئـەم ڕەووشـە هـەر تایبـەت نییـە بـە هـەولێر بـەڵكو لـەدهۆك و سـلێمانیش هـیچ پەرستگایەكی جووەكان نەماوەتەوە. ئەمە لە كاتێكدا كـە بـاس لەبەیەكـەوە ژیانی ئایینە جۆر بەجۆرەكان لە كوردستان دا دەكرێ !

لـە ڕاسـتیدا نـەمتوانی وەڵامـی ئـەم پرسـیارەو لقـە پرسـیارەکانی تـر بدەمەوە، بەلام پێم وایە کە شایەنی وەڵام دانەوەن، بۆیـە داواکـارم کـە هـەر کەسێك زانیاری هەیە دەربارەی ئەم بابەتە بەشداری بکات لـە وەڵامدانـەوەی ئــەم بابەتــە. چــونکە لــە ئەنجامــدا ئەمــە نەهامەتیەکــە بەرامبــەر بــە شوێنەوارەکانی کوردستان کراوە. ئاینیش پاساو نییە بۆ ئـەم شـتە، چـونکە لەزۆر شارە ئیسلامییە جۆربەجۆرەکان شوێنی پەرستنی ئاینی تر ماونەتەوە لەوانەیە باشترین نموونەش هەر ئەو نموونەی سەرەوە بێ شاری قاهیرە، کـە سەنتەری زانکۆی ئەزهـەرە کـە گـەورەترین دام ودەزگـای ئیـسلامی سـونییە بەڵام پەرستگای جووی تیادایە.

# دەربارەی ناوەکانی نیشتمانی کورد- کوردستان

د.زرار سدیق تۆفیق
زانکۆی دهۆك

تا ئێستا ساغ نەبۆتەوە لە کەنگێ پـەیڤی کوردسـتان بۆ یەکـەمجار دەرکەوت و بووە ناوێکی باوو بڵاو وناژانرێت یەکەم پەرتووك یان نووسرا وکامەیـە ئـەم پەیڤـەی تێـدا هاتبێـت، لەڕاسـتیدا کـارێکی ئاسـتەنگە بۆچوونێکی ڕەها وڕەوان لەمەڕ ئەم پرسە بخرێتەڕوو، وەلێ ئەوەی بۆتـە ڕاستیەك وهیچ گومانێکی لەسەر نـەماوە ئەوەیە کـە لـەنیوەی دووەمـی سەدەی حەفتەمی کۆچی/سێزدەهەمی زایینـی بـەملاوە کوردسـتان وەك نـاوێکی جـوگرافی فـەرمی وناسـراو بـەردەوام وبـێ دابـڕان لـە زۆرینـەی سەرچاوە جوگرافی ومێژوویی وئەدەبییـەکان –نەخاسمـە فارسـیەکان– بەرچاو دەکەوێت.

لەنووسـینەکانی رشـیدالدین فـضل الله همـدانی (م٧١٨ك/ ١٣١٨ن) گەڕۆکی ئیتالی مارکۆ پۆلۆ (م٧٢٣ك/١٣٢٣ن) و وصـاف (٧٢٨ك/١٣٢٨ن) و حمـدالله مـستوفی قزوینـی (م٧٥٠ك/١٣٤٩ن) بـە ڕاشـکاوی پـەیڤی کوردستان تۆمارکراوە.

هەرچەندە ووشـەی کوردسـتان وەك فـۆرم و وەك نـاوێکی جـوگرافی درەنـــگ دەرکـــەوت وهاتـــە ئـــاراوە وتـــا ســـەدەی حەفتـــەمی کۆچی/سێزدەهەمی زاینی دواکەوت، وەلێ هەر لە مێژەوە ولەسەردەمانی پـێش ئیـسلامەوە لەلایـەن خـەڵکانی دیـەوە هەسـت بـەوە دەکـرا کـە دەڤەرێکی جوگرافی بوونی هەیە وزێد ونیشمانی کوردانە تایبەتـە بـەوان وزۆربـەی هـەرە زۆری دانیـشتوانی پێکدەهێنن وبەچـەند ووشـە وچـەمك ودەسـتەواژەیەك گوزارشـتیان لێ کـردووە، کـە لـە نووسـراوە سـریانی وکەنەسـبەکان و لـــە ژێـــدەرە ئیـــسلامیەکان ئامازەیـــان پێـــدراوە وکوردسـتانیان پـێ نـاوزەدکراوە، لـە چەشـنە مـاڵی کـوردان، چـیاکانی کوردان، شوێن کوردان، خاکی کوردان، دەڤەری کـوردان، کـە هـەموویان مەبەست وواتای کوردستان دەگەیەنن.

- چیاکانی کوردان (جبال الأكراد) :

لەبەرئەوەی کوردستان وولاتێکی شاخاوییە چەند زنجـیرە چـیایەکی بلنـد ودرێـژ ئەگرێتـەخۆ، لەسـەردەمانی پـێش ئیـسلامەوە نـاوی کـورد بەچیاوە لکاوە، دوای پرۆسـەی فـەتحی ئیـسلامیش، کوردسـتان یەکـەم وولاتـی چـیایی بـوو لەبـەرەی رۆژهەلاتـەوە کـە عەرەبـە موسـوڵمانەکان پێیان نایە ناوییەوە لەبەرئەم هۆیە و لەژێر کاریگەری ئەدەبیاتی ساسانی و وەك وەرگێرانێك بۆ ناوی (کهستان– قوهستان– کویستان)، نیشتمانی کورد لای عەرەبە کان پتر بە (جبال الأكراد) دەناسرا.

شـــاعیر بەشـــاری کـــورِی بـــرد (٧٧- ١٦٧ك/ ٦٩٦- ٧٨٤ن) لـــە شیعرێکدا دەبێژێت :

جونَ الرُبی مثل جبال الكُرد          مُنبَعقِ القصف هَزيمِ الرَعدِ

لە شعرێکی دیدا هاتووە :

جبالٌ بها الأكراد صُم صخورها

(ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٢/ ٤٩٢)

هەروەها لە دابەشکردنی گۆی زەوی بەسەر هەرێمەکاندا، کوردستان کەوتۆتە هـەرێمی چوارەم سەربە بـورجی گـا (بُـرج الثـور) بـە (الأكـراد الجبليون) ناوزەدکراوە (معجم البلدان، ٣٣/١).

لەلایـــەکی تـــرەوە مێژوونووســـان وجوگرافیـــاوان وگـــەڕۆکانی موسوڵمانیش بەهەمان چەشـن کوردستانیان بـە (جبـال الأكـراد- جبـل الكرد) وەصفکردووە:

- جبـل الكـرد "الـشريف الادريـسي (م٥٦٠ك/١١٦٥ن)، نزهـة المـشتاق، ٣٥٣/١".
- الجبال- دار الأكراد "اليعقوبي (م٢٩٣ك/٩٠٦ن)، البلدان، ص٦".
- جبال الأكراد "ابن العديم (م٦٦٠ك/ ١٢٦٢ن)، زبدة الحلب، ٥٦١/١".
- جبال الأكراد "ابن عسا (م٥٧١ك/١١٧٥ن)، تأريخ دمشق، ٢١٦/٢٣".

دوای دەرکـەوتنی نـاوی کوردســتانیش وتـا ســەردەمی مـەملوکی و ســەدەکانی دواتــر، سەرچـاوە مەملوکیـەکان هــەر (جبــال الأكــراد)یـان بــەکاردەهێنا، بۆنموونــە شــێخ خــدری مــەهرانی (م٦٧٦ك/١٢٧٧ن) لــە

گوندی (المحمدية) لە (جبال الأكراد) هاتۆتـە دنیـاوە. (العمري، مسالك الأبـصار، ٢٦٧/٨" المقريـزي، المقفى الكبير، ٧٥١/٣) وکاتێـك خـانی مـەغول غـازان (٦٩٦- ٧٠٣ك/ ١٢٩٦- ١٣٠٣ز) پـەیامێکی بـۆ سـوڵتانی مـــەملوکی محەمـــەدی کـــوڕی قـــلاوون (٦٩٤- ٧٤١ك/١٢٩٥- ١٣٤٠ز) نووسی لەکۆتایی نامەکەدا هاتووە:

"كُتـب في العـشر الأوسـط مـن شـهر رمـضان سـنة سـبعمائة [٧٠٠هـ/ ١٣٠٠م] بجبال الأكراد" (النويري، نهاية الأرب، ٣١/ ٢٦٦).

ئەمە ولەچەند بابەت وپرسی تردا ئاماژە بۆ (جبال الأكراد) کراوە کە هەموویان مەبەست کوردستانە، بڕوانە:

- مسالك الأبصار، ١٢٥/٣ (مخطوط).
- ابن الحجر العسقلاني، الدرر الكامنة في أعيان المئة الثامنة، ١٤١/٦.
- القلقشندي، صبح الأعشى، ٣٧٣/٤.

لەپاڵ (جبال الأكراد) لەسەرچاوەکاندا چەند دەستەواژەیەك بەرچاو دەکەوێت کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ مەبەست لە کوردستانە:

- ناحية الأكراد (السلفي، (م٥٧٦ك/ ١٠٧٢ز)، معجم السفر، ١٦١/١)
- أرض الأكـراد (الكاشـغري (٤٦٦ك/١٠٧٣ز)، ديـوان لغـات أتـرك (لـة نةخشةكدا)).
- موضع الكرد (البكري، المسالك والممالك، ٢٦١/١.
- بلاد الأكراد (ابن عربشاه (م٨٥٤ك/١٤٥٠م)، عجائب المقدور، ص٣٠٠" السخاوي (م٩٠٢ك/١٤٩٧ز)، التحفة اللطيفة في تأريخ المدينة الشريفة،

٤٦٨/٢" الضوء اللامـع، ١٩٤/٨" تـأريخ ابـن خلـدون، ٣٣٣/٤، ٣٥٨، ٦٠٥/٤...)

ابــن البيطــار(م٦٤٦ك/١٢٤٨ن) لــە ناســاندنی ڕووەكێكـدا دەڵێــت: باشـترین جـۆری ڕەنـگ سـورەكەیەتی كـە لـە وولاتــی كـوردان (بــلاد الأكراد)ەوە دەهێنرێت (د. عماد عبدالسلام رؤوف، جغرافية ابن البيطـار، ص٥٣).

- بـلاد الكـرد: قـازی عـەیاز (القاضــي عيـاض ٤٧٦- ٥٤٤ك/١٠٨٢-١١٤٩ن) لــە زاردەفــی یــەكێك لــە هەڤاڵانیــەوە دەگێڕێتــەوە كــە عبدالوهاب بن نصر المالكي (م٤٢٢ك/١٠٣١ن) چۆتە گونـدی أسـعرد-سێرت لە وڵاتـی كـورد نزیـك چیای جـودی (فهـرس شـيوخ القاضـي عياض، ص١١٤- ١١٥).

ئەم وڵاتە (بلاد الكرد) لای زوهـری (ابـي عبـدالله محمـد بـن أبـي بكـر الزُهري) (سەدەی ٦ك/١٢ن) زیاتر ناسرلوە وسنوور وتـوخیبی تاڕادەیـەك ڕوون ودیـارە، وا دەردەكـەوێت لەسـەردەمی خەلیفـە المـأمون (١٩٨-٢١٨ك- ٨١٤- ٨٣٣ن)ەوە ئەم دەستەواژەیە لەئارادابووە وهاوكـات لـە پـاڵ (جبـال الأكـراد)دا كوردسـتانی پــێ هاتۆتـە ناسـین، (الزهـري) لـە دەستپێكی پەرتووكەكەیدا ڕایدەگەیەنێت:

" أما بعد احمـد الله تعـالى، فـأني نـسخت هـذه الجغرافيـة مـن نـسخة نـسخت مـن جغرافيـة الغـزاري [أبـي عبـدالله محمـد بـن ابـراهيم الغُـزاري المتوفى قبل سنة ٢١٦هـ/٨٣١م التي نسخت من جغرافيـة أمـير المـؤمنين عبدالله المأمون بن هارون الرشيد التي اجتمع عليهـا وعلـى عملـها سـبعون رجـلاً مـن فلاسـفة العـراق، فوضـعوها علـى صـنعة الأرض...". (كتـاب الجغرافية، ص١) بەگوێرەی پەرتووکی جوگرافیا دەڤەری سێهەم (الصقع الثالـث) سـێ وڵاتـی دەگرتـەوە: (الـصقع الثالـث : بـلاد الكـرد والـدَيلم والأنبـار) و وڵاتـی کـوردان دەکەتـە ڕۆژئـاوای ئـەرمينيا وبازێـك کـەناوی بەدروست ڕوونوس نەکراوە بارەگای موڵکی کوردان بوو.

"وكذلك مما يلي هذه المدينة [أرمينية] لناحية المغرب مدينة جاجـل [رجـال- رجـاجير] (؟) وهـي مـن بـلاد الكـرد وهـي دار ملكهـم (كتـاب الجغرافية، ص٦٥).

- لە شوێنێکی تردا لە ناساندنی (بحـر الـديلم) واتـە دەریـای خـەزەر- دەریای قەزوین دەڵێت "وينصب الى ناحية الجنوب على بلاد الكُرد ثم ينعطف على بلاد الديلم". (كتاب الجغرافية، ص١٣٣)

وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا ئاستەمە بزانرێت کەی پەیڤی کوردستـان دەرکـەوت، لـە ماسـتەرنامەکەمدا (سـاڵی ١٩٩٤) گوتومـە بـەکارهێنانی کوردستان لە مێژەوە لەناو خەڵکی کورد ولەناوخۆی کوردستان بـاوبووە

پێش ئەوەی بکەوێتە بـەرگوێ کەسـانی بیـانی ولـە پـەرتووك ونووسـینە ناکوردیەکاندا یاداشت بکرێت.

ئەوەی تا ئێستا خۆیایە کۆنترین دەق لـەم بارەیـەوە بریتـی یـە لـە شیعرێکی فارسی شاعیری ئێرانی (الحکیم جنتي بیا) کە نووسەری ناودار (نورالدین بن محمد بن یحیی بن طاهر بن عثمان العـوفي البخـاري الحنفـي) ناسـراو بـە (محمـد عـوفي) لـە پـەرتوکی (تـذکرة لبابـة الألبـاب) تۆمـاری کردووە.

بـەپێی دیڤـچوونی زانـای ئێرانـی محمـد عبـدالوهاب قـزوینی، محمـد عـوفی کتێبەکـەی لـە دەوروبـەری سـاڵی ٦٣٠ك/١٢٣٢ز دانـاوە. (بڕوانـە پێشەکی لباب الألباب، ١/٤٣- ٤٦).

سەبارەت بە شاعیر (جینتی بیا) دەکرێت بلێین لـە نیـوەی دووەمـی سەدەی ٦ك/١٢ز وسەرەتای سەدەی ٧ك/١٣ز لەوولاتی ئەوبـەری ڕووبـار (ماوراء النهر) ژیاوە، محمد عوفی لەدەروازەی یازدەهەمی پەرتوکەکەیدا لەژێرناونیشانی: "شعراء آل سلجوق بعد أز عهد معزی وسـنجری (مـاوراو النهر)، (جنتی بیـا)ی ناسـاندووە، واتـا ئـەم شـاعیرە لـەپاش سـەردەمی سوڵتان سەنجەری سەلجوقی (٥١١-٥٥٢ك/ ١١٧-١١٥٧ز) ژیاوە:

چـــو آرد لـــــب دلبر پیالـــه کند لعلش پر أز شکر پیاله
تو گوئی أز صراحی کردستانـی بجـــامی آب پـــر آذر پیالـه

زمـــی أز عکس رخسارت گرفتــه          فـــروغ لالەء أحمد پیـــالـه

(لباب الالباب، ٢/٢٩٥)

ئەمە لە سەرچاوە فارسیەکان، کەچی لە سەرچاوە عەرەبیەکان ئەوەندەی من ئاگاداریم مێژوونووسی میسری النویری (م٧٣٣ك/١٣٣٣ز) یەکەم کەسە ناوی کوردستانی هێناوە، لە ڕووداوەکانی ساڵی ٧٢٨ك/١٣٢٨ز دەڵێت "وقتل أيضاً ولد لجوبان بكردستان" (نهاية الأرب في فنون الأدب، ٣٣/١٩٢)، بەڵام ئەمە بە ڕێکەوت بووە وژێدەرە مەملوکیەکان تا کۆتایی سەردەمی مەملوکی دەگمەن نەبێت ناوی کوردستانیان بەکارنەهێناوە.

# شارستانی و بیناسازی کوردە ئەیوبیەکان لە یەمەن

پ.د. أرسن موسی رشید

بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان خەڵکی یەمەن کاتی خۆی هانایان بۆ خەلیفەی عەباسی (الناصر) دژی عبدالنبی بن مەهدی (دوا سوڵتانی دەوڵەتی مەهدییەکان لە یەمەن) بردووە، لە وەڵامیشدا خەلیفەی عەباسی فەرمانی بە بە سەڵاحەدینی ئەیوبی داوە کە بە فریای خەڵکی یەمەن بکەوێت، ئەویش لەلایەن خۆیەوە (توران شا)ی برای کە نازناوی بە (الملك العظم فخرالدین) دەرکردبوو ڕەوانەی یەمەن کرد و توانی دەسەڵات بەسەر هەموو وڵاتدا بگرێت و دەوڵەتی ئەیوبی دابمەزرێنێت، بەڵام توران شا تەنیا یەك ساڵ لە یەمەن مایەوە پاشان داوای لە سەڵاحەدینی ئەیوبی کرد کە بگەڕێتەوە میسر ئەوەبوو لە ساڵی (٥٧٠ك) گەڕایەوە میسر و لەجێگای ئەویش (الأمیر سیف الدولة مبارك بن كامل) دانرا.

دوای تێپەڕبوونی ٩ ساڵ سەڵاحەدین (سیف الاسلام طغتكین)ی برای لەساڵی ٥٧٩ك ڕەوانەی یەمەن کرد بۆئەوەی کرداری چاکسازی بکات.

طغتكین توانی تەواوی دەسەڵات بەسەر یەمەندا بگرێتەوە بەڵام لە کۆتاییدا بە ژەهراوی بوون کۆچی دوایی کرد.

دوای ئەو کوڕەکەی (المعز اسماعیل) حوکمڕانی یەمەنی کرد ئەوانەی لە داوییدا حوکمیان کرد (الناصر بن طغتکین) و (الملك مسعود یوسف "آتسز") بوون. شایەنی باسە لە ساڵی (٦٢٩ک/ ١٢٢٩ن) لەسەر دەستی ڕەسولیەکان دەوڵەتی ئەیوبی لەناوچوو. ئەو سوڵتانە ئەیوبیانەی کە لە یەمەن حوکمیان کردووە ئەوانەن:

١- السلطان المعظم توران شاه (٥٦٩- ٥٧١ك).

٢- السلطان سيف الإسلام طغتكين (٥٩٠- ٥٩٩ك).

٣- المعز اسماعيل بن طغتكين (٥٩٩- ٦١١ك).

٤- الناصر بن طغتكين (٥٩٩- ٦١١ك).

٥- سليمان شاه تقي الدين عمر (٦١١ك).

٦- الملك المسعود صلاح الدين بن الكامل (آتسز) (٦١٢ك).

شارستانی وبیناسازی کوردە ئەیوبییەکان لە یەمەن.

١- شار :

طغتکین کوڕی ئەیوب شارێکی بەناوی (المنصورە) لە یەمەن دروست کرد کە نزیکەی ١٢کم بەرەو باکور لەشاری (الجند) دوور بوو، ئەوشارەشی کردە پایتەخت وهەر لەوێ کۆچی دوایی کرد.

نووسەری کتێبی مێژووی یەمەن دەڵێت شاری (المنصورە) دەکەوێتە نێوان (الجند) و (الجبلە). ئەو شارەش ئێستا تەنها شوێنەوای ماوە. هەروەها مەلیك (المعز) شارێکی تری بەناوی (الميلين) لە نزیك (زبيد) دروست کرد.

٢- شورە :

سوڵتانە ئەیوبیەکان ژمارەیەکی زۆریان لە شورەکانی وولاتی یەمەن نوێ کردەوە و هی تریشیان دروست کرد بۆ پاراستنی لایەنی شارستانی و ئاسایشی ئەم وولاتە. لەشاری (زبید) شورەیەکی نوێ دروست کرا هەروەها شاری (صفاء)یش شورەی بۆ کرا.

٣- قەڵا :

دوای ئەوەی ئەیوبیەکان گەیشتنە یەمەن گرنگیەکی زۆریان دا بە دروستکردنی قەڵای سەخت، (سیف الإسلام طغتكين) چەند قەڵایەکی دروست کرد لەوانە قەڵای (التعكر) و (خدد) و (تعز). ئەوەش نیشانەیەکی ئاشکرا بوو بۆ ئەوەی کە ئەیوبیەکان لەم وولاتەدا بەتەواوی جێ پێ ی خۆیان جێگیر کردبوو.

٤- کۆشك :

لەو کۆشکانەی کە ئەیوبیەکان لە یەمەن دروستیان کرد، کۆشکێکی گەورەبوو کە لەلایەن طغتكين لەساڵی ٥٧٢ك لەشاری (المنصورە) دروست کرا، هەروەها لەنزیك کۆشکەکەش گەرماوێکی دروست کرد.

٥- مزگەوت و قوتابخانە :

ئەیوبیەکان گرنگییەکی زۆریان بە مزگەوت و قوتابخانەکان دەدا، بەڵگە بۆ ئەو ڕاستیە ئەوەبوو کاتێ (الملك المعظم توران شاه) گەیشتە یەمەن گووتی (ئێمە نەهاتووینە ئەو ئەو وولاتە بۆ وێرانکردنی، بەڵکو بۆ ئەوەی ئاوەدانی بکەینەوە) سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن ئەیوبیەکان چەندین مزگەوتیان دروست کردوە، لەوانەش دروست کردنی مزگەوتی (القديم)

لەشاری زبید لەلایەن (المبارك بن كامل بن منقذ) ی جێگری توران شاه. هەروەها مزگەوتی (المناخ)ی لەشاری زبید دروست كرد، وێڕای ئاوەدان كردنەوەی چەند مزگەوتێكی تر لەم شارە لەگەڵ ئاوەدانكردنەوەی مەنارەكەی. جگە لەمانە مزگەوتی (المعربە) لە قەلأی (تعز) دروست كرا و مزگەوتی (الجند) ئاوەدان كرایەوە.

ئەوەی پەیوەندی بە قوتابخانەكان هەبوو ئەیوبیەكان گرنگیەكی تایبەتیان پێدا (الملك المعز بن طغتكین) یەكەم كەس بوو كە قوتابخانەی (السیفیە) ی لە یەمەن دروست كرد، ئەویش بەناوی (سیف الاسلام)ی باوكی بوو، هەروەها قوتابخانەی (المیلین) ی لە شاری (المیلین) دروست كرد كە تایبەت بوو بە ڕێچكەی شافیعی، بەڵام دوای كوژرانی (المعز) قوتابخانەكەی لەلایەن (سیف الدین الاتابك مسفر) كە تورك بوو، درایە فەقێیە حەنەفیەكان، چونكە بەخۆی حەنەفی بوو، هەروەها قوتابخانەیەكی گەورەش لەشاری زبید دروست كرا بەناوی (ابن دحمان).

بایەخی سوڵتانە ئەیوبیەكان بە شعرو زانست

بەگوێرەی نووسینەوەی مێژوونووسەكان، سیف الإسلام طغتكین گرنگیەكی زۆری بەلایەنی ڕۆشنبیری و زانستەكانی قورئانی پیرۆز داوە، هەروەها هەوڵی داوە یەكسانی و دای كۆمەڵایەتی لەنێو خەڵكدا بڵاوبكاتەوە.

لەم بوارەدا طغتكین زۆر ڕێزی لە شاعیران گرتووە و لەوانەش (شرف الدین بن یمنی) كاتێ لە شام گەیشتە یەمەن یادداشت كرا ئەویش لە بەرامبەردا ستایشی سوڵتانی كرد.

لایەنی كشتوكاڵ و چاكسازی كشتوكاڵی

کاتێ ئەیوبیەکان دەسەڵاتیان بەسەر یەمەندا گرت بایەخێکی زۆریان بە بواری کشتوکاڵ و ئاوەدانکردنەوەی زەوی دا بەتایبەتی سوڵتان (طغتكين) کە گرنگی بە چاندنی دار خورما داو، باجێکی زۆری دەخستە مل ئەوانەی کە دەیچێنن و پارەکەشی دەخستە (بيت المال).

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە (طغتكين) هەوڵی ئەوەی دا هەموو زەوییە کشتوکاڵیەکانی یەمەن بکاتە موڵکی دەوڵەت، بۆ ئەو مەبەستەش خەڵکی زۆری تەرخانکرد بۆ کڕینەوەی ئەم زەوییانە بۆ دەوڵەت، بێگومان ئەو هەنگاوەی (طغتكين) یەکەمجار بوو لە جیهانی ئیسلامی جێ بەجێ بکرێت، بەڵام نەیتوانی بەتەوای زەوییەکان بکڕێت و کۆچی دوایی کرد، ئەو سوڵتانانەی کە دوای ئەویش هاتن وەکو (سليمان بن تقي الدين عمر بن شاهنشاه) و (الملك المسعود) نەیانتوانی بەردەوامی بە دەسەڵاتی ئەیوبیەکان بدەن، بەهۆی لاوازی و خەریك بوونیان بە ڕابواردنی دونیا.

سەرچاوەکان :

١- تاج الدين عبدالباقي اليماني، تأريخ اليمن، تحقيق مصطفى حجازي، مصر، ١٩٦٥.

٢- عبدالرحمن بن علي الربيع، تأريخ مدينة زبيد، تحقيق محمد عبدالله بن الحبشي، صنعاء، ١٩٧٩.

٣- الجراخي، المقتطف من تأريخ اليمن، القاهرة، ١٩٥١.

٤- ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، بيروت، بدون تأريخ.

٥- عبدالله نور، هذه هي اليمن، بيروت، ١٩٧٩.

٦- ابن واصل، مفرج الكروب، تحقيق جمال الدين شيال، القاهرة، ١٩٥٣.

٧- ابن تغري البردي، النجوم الزاهرة، القاهرة، ١٩٣٦.

# چەوا شیعەتی ل کوردستانێ بەلاڤبوویە

د. فرست مرعی

لسەر دەمێ خەلیفێ راشدیێ دوویێ (عومەریێ کوریێ خەتابی)ل سالا(١٦) کۆچی موسلمانکرنا جڤاکێ کوردی دەستپێکر.هەر چەندە گەلەک کوردو مەزنێن وان هەڤبەر ڤێ ڤەکرنا ئیسلامێ بۆ وەلاتێ راوستیان، لێ هێزا خورتا بەلاڤبوونا ئیسلامێ ل وی سەردەمێ زوی جهێ خۆ کر" ژ ئەگەرێ نەبوونا بەرخۆدانەکا کوردییا رێکخستی بزاڤێن وان یێن نەرازیبوونێ ددرێژاهیا دەمیدا زوی ژناڤچوون، و تەنها بەرگیریکرن دچارچووڤێ دەڤەرێن (شەهرەزوور ـ لۆر ـ خۆزستان)دابوو.

(طبري و ابن الأثير) بۆ هندێ دچن کو ئەو کوردێن نەبووینە موسلمان بەرگریا موسلمانان کریە ل دەمێ بسەرداگرتنا بازێرێن وان.

هەر چەوا بیت کوردان باوەری ب ئیسلامێ ئینا و پاشی بوونە بنگەهەکێ موکم بۆ موسلمانان کو پشتا خۆ پێ گەرم بکەن، ژبەرکو کورد ب دلێریێ و وێرەکیێ و سیار چاکیێ ب ناڤ و دەنگن و درێژە بڤێ رەوشێ هاتەدان تا چەرخێ عەباسی یێ دوویێ و سییێ (چەرخێ بووەبهیا)کو ئەو سیستەمێ ناوەندی ئەوێ عەباسیا دانای هێدی هێدی بەرەڤ هەلوەشیانێ چوو، و دئەنجامدا هندەک دەولەت و میرگەهێن فارس و کوردو تورکا پەیدابوون، وان دڤیا هەبوونا خۆ خۆیا بکەن.

ئـەڤ فرەیی‌یـا نەتـەوەیی بـۆ سـتوینەکا سـەرەکی بـۆ ئاڤاکرنـا شارستانیەتا ئیسلامی و پێشڤەبرنا وێ ل سەدێ چوارێ و پێنجێ کۆچی.

چونکە پرانیـا کـوردان دگـەل رێـچا سـوننی رێـچا دەولـەتا عەباسـی بوون، ئەڤ چەندە ژی بۆ پالپشتیەکا ب هێز هەڤبەر رەوتێن دینێ ئیـسلامی و ژیەر هندێ قەدرگرتن و رێزگرتنا کوردان بباشی دهاتە ل قەلەم دان.

هەمی ناسناڤێن خیلافەتا عەباسـی داینـە میرێـن(بووەیهیـا)و یـێن دیـتر، لایەنێ ئوولی بۆ وان پلەیان نەبوو، ژبلـی ناسـناڤێ مـیر(بـدر ناصـر الدولـە و الدین).

ل وی دەمـی خـەلیفێ عەباسـی (القـادر بـالله) یـێ ب نـاڤ و دەنـگ تۆنـدرەویا خـۆ یـا ئاشـکرا بـۆ سـوننی‌یا دیـارکر. هـەر چـەندە دژێـدەرێن مێژووناسادا رۆیێ رێچا میرگەها (حەسنەویا) کوردی ئاشکرا نەکریە.

لێ دژێدەرێن بەرنیاسێن سوننی‌یا دا بەحسێ کوردان ب باشی هاتیـە کرن وەکی پەرتووکا(المنتظم)[1] و (البداية و النهاية)[2].

ڤەکۆلەرەکێ کوردان لسەر شیعەتیا(بـدر بـن حـسنویە) و شـیعەکرنا هۆزا وی (بەرزیکان)[3] دزڤرینتە دوو ئەگەران:

١. کۆشـتن و ڤەشـارتنا تـەرمێ وی ل کووفـە (نەجـەفا نوکـە) ژلایـێ زەلامێن قومانداریێ کورد(حوسێنێ کورێ مەسـعوودێ کـوردی) سـەر ب هـۆزا (گۆران)[4]ڤە، وێ چەندێ ئاشکرا دکەتن کو ئەو کەسـێن دهێنـە ڤەشـارتن ب رەخ مەزارێ (عەلیێ کورێ بابێ تـالبی)[5]ڤـە خـودێ ژێ رازیبیـت ب(شـیعە) دهێنە هژمارتن. لێ لسەر ڤێ بۆچوونێ هندەك حالەت هەبووینە کو سوننە ژی ل (نەجەف) هاتینـە ڤەشـارتن، سـەرەرای کـو مـیر(بـدر) ب ئـەمرێ هەڤدژێ

وی(حوسێنیێ کوڕێ مەسعوودیێ کوردی) ل ویڕێ هاتیە ڤەشارتن، بێ ی رازیبوونا وی و مالا وی کو ل ویڕێ بهێتە ڤەشارتن[٦].

٢. یاکو ڤەکولەرێ کورد پشتا خۆ پێ گەرم کری لسەر شیعەتیا(بدر بن حسنویە) و عەشیرەتا وی(بەرزیکان) ئەو گۆتنا وییە یا کو دبێژیت:" عەشیرەتا بەرزیکان باوەری ب رێچا شیعی هەبوو[٧]، کو ئاکنجیێن ڤێ عەشیرەتێ ژ لۆرستانێنە ئەو هەرێما کو پرانیا خەلکێ وێ رێچا شیعەتیێ گرتبوو ژ ئەنجامێ هەڤدەر و تێکهەلێن هندەك کائیفێن دینێ شیعی وەکی لۆر و گۆران"[٨].

دبیت ڤەکولەری پشتا خۆ ب چ ژێدەرێن عەرەبی یان فارسی گەرم نەکربیت بۆ راستیا شیعەکرنا دەڤەرا عەشیرەتا (بەرزیکان)و دەوروبەرێن وێ ل (هەرێما چیای). بەلکو پتر ڤەکولەر یێ کەفتیە ژێر تەخمین و عاطفیا خۆ.

هەر چەندە تشتەکێ ئاشکرایە کو هندەك قولاچکێن شیعەتیێ ل هەرێما چیایی هەبوون، بەلێ ئەڤە ژی وێ چەندێ ناگەهینیت کو ئەو پەرێ بەلاڤکرنا وان هەمی دەڤەر گرتبیت.

(یاقوت الحموی)[٩] لسەر ڤێ چەندێ دبێژیت:" شیعەتی ل باژێرێ(قوم) ل وەختەکێ نێزیك (٨٣ کۆچی /٧٠٢ز) بەلاڤبوویە" هەروەسا (الاصطخري)[١٠] دبێژیت:" خەلکێ قوم هەمی شیعەنە" لێ ((القزوینی))[١١] دبێژیت:" باژێرکێن(بولیدە) شیعێن تۆندرەون" هەروەسا (النجاشی)[١٢]دبێژیت: " شیعە ل (کووفە) و لایێ رۆژئاڤایێ بەغدا(کەرخ) و هندەك جهێن دی ل جیهانا ئیسلامی هەنە" (مەسعوودی)[١٣] دبێژیت:" بزاڤێن بەلاڤکەرا بۆ رێچا ئیسماعیلی ل سالا(٢٦٠ کۆچی/٨٧٣ز) ژلایێ مەلایێن شیعیێن زەیدی

دەستپێکر، بۆ دامەزراندنا کیانەکێ سیاسی ل هەرێما طە برستانێ ل باکوورێ دەریا خەرز (قەزوین) هەر ژ سالا(٢٥٠ کۆچی / ٨٦٤ز) و تا (٣١٦ کۆچی /٩٢٨ز) ب دویماهیك هاتی"[١٤]

بێگومان، ئەوان گەلەك دەڤەر ئێخستنە ژێر بیاڤێ شیعەتیێ، پشتی کو بشێوەیەکێ رەها ندەستێ سوننیادا بووین.

سەرکردێن عوبەیدیا(الفاطمیون) گەلەك هەوڵدان کرن و شیان مەزاختن ژ پێخەمەت پەلاڤکرنا هزرو بۆچوونێن خۆ دژێکا بەلاڤکەرادا، وەکی(المعز العبیدی) (٣٦٥ / کۆچی ٩٧٥ز)[١٥]کو د دوانزدەریەکا خۆدا یا کو ئاراستەی (حەسەنێ قرمتی) کری دبێژیت" دسەر ڤێ چەندێ ژیرا چ هەرێم یان چ گزیرتە ل سەر رۆیێ ئەردی نینن مرید و بەهانە لێ نەبن کو ئاماژێ ب رەوانبێژیا زمانێ مە ددەن، و دهەمی هەرێم و گزیرتەیاندا کەسانێن بسپۆر و رەوانبێژ هەنە کو خەلك زانینێ ژێ وەردگرن[١٦]" ئاماژەکرنا وەزیرێ سەلجۆقی(نظام الملك)[١٧] لسەر بزاڤ و چەولیەتیا پەیدابوونا رێچا (الباطنیة) کو (عبدالله کورێ مەیموونی) خەلك پاڵدا بۆ باوەری ئینانێ بڤێ رێچێ ل کوهستانا ئیراقێ(هەرێما چیایی)کو زەلامەك لدویف خۆ هێلا دگۆتنێ (خەلەف)[١٨] و گۆتە وی" هەرە ل رەخێ بازێرێ ریێ و بێژە ئەز شیعەمە، چونکە خەلك ل ریێ و قوم و کاشان هەمی شیعەنە(رافضة) و دێ لدویف بانگەوازیا تە هێن و سەنگ و بوهایێ تە دناڤ واندا دێ بەرز بیت"[١٩].

و ژلایەکێ دیڤە دەسەلاتداریا عوبەیدییا ل هەرێمێن دەولەتا عەباسی بەرفرەهـ تر لێ هات ژ ئەنجامێ پشتەڤانیا بووەیهیا بۆ رێچا شیعەتیێ ئەڤەژی بۆ ئاسانکرنا وێ ئارمانجا بەلاڤکەرێ(عوبەیدی موسا کورێ عمرانێ شیرازی)

جهەکێ پایە بەرز ل دەف وەزیر(فخر الملك) هەبوو. و چەندین جارا سەرەدانا وی ل مال کریە.

پشتی بەلاڤکەرێ عوبەیدی چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ کورێ وی(هبە اللە الشیرازی) جهێ وی گرت و پلا (حجە فارس) وەرگرت و ناسناڤێ خۆ کرە لایەنگرێ دینێ خودێ(المؤید لدین اللە) و(هبە اللە الشیرازی) شیا میرێ بوویهی(ابو کالیجار) (٤١٥-٤٤٠ کۆچی/ ١٠٢٤-١٠٤٨ز) بکێشیتە لایێ خۆ بۆ پشتەڤانی ل بانگەوازیکرنا رێچا (ئیسماعیلی) پشتی کو فێری بنەما و رێکێن بانگەوازییا ئیسماعیلی کری.

دنامەکا بەرسڤێدا بۆ(هبة اللة الشیرازي)[20] کو دبێژیتێ" ئەز داردەستێ تەمە و هەر چ تشتەکێ تو بکەی دگەل تەمە" ئەڤە ژی گرۆڤێ چوونا (ابو کالیجار)یە بۆ ناڤ رێزێن رێچا ئیسماعیلی[21].

بزاڤێن بەلاڤکەرێن عوبەیدیا ل ئیراقێ و فارس و باشووورێ ئیرانێ زێدەباری نامێن (اخوان الصفا)[22] ل بەسرە، و چالاکیێن سۆفیگەریێ کو تێکهەلی فەلسەفێ کرینە، تاکو غەزالی ب (سۆفیگەریا فەلسەفی)[23] ناڤ لێ ئینایە نێزیك بوونا وان دگەل شیعا لسەر بنیاتێ هەبوونا هندەك بنەمایێن وەك یەك کو نێزیکیەکا شیعەتی و سۆفیگەری دکەسایەتیا(عەلیێ کورێ بابێ تالبی)دا هەبوو.

ئەڤە هەمی بوونە زەمینە خۆشکرنەك بۆ پەیداکرنا بزاڤێن تۆندرەوێن(باطنیا)یێن تێکهەل ب شیعەتیێ و سۆفیگەریا فەلسەفی لژێر ناڤێن جودا جودا وەکی:(حروفیە)[24]و (بابائیە)[25] و (بەکتاشیە)[26]و(مشعشعیە)[27].

لێ پشتی مەغۆلا خیلافەتا عەباسی ژ ناڤبری، رێدا سۆفیگەریێ وەراریێ دبیروباوەرێن خۆدا بکەت، سۆفیگەریا ژی هزرا یەکبوونا هەبوونێ(وحدە الوجود) ل جهێ وان هەمی هزرێن پرت و پەلاڤە دانا. دەربارەی شیعا ژی دانپێدانا وەکی رێچەکا قەومیا دەولەتێ لسەر دەمێ سۆلتانێ وان (اولجایتو خدابندە) سالا(٧٠٩ کۆچی/ ١٣٠٩ز).

ئەڤە ژی بۆ ئەگەرێ بەرفرەهیا هزرو بیرێن وان کو بیاڤەکێ بەرفرەه ژ هەرێمێن رۆژهەلاتا ئیسلامی بگریت: وەکی "خوزستان (عەرەبستان)و فارس و هەرێما چیایی و ئەزەربێجانێ و طبرستانێ" ڤێ چەندێ ژی ئارمانجا بزاڤا سەفەوی[28] ب سەرکردایەتیا( شاه ئیسماعیلێ سەفەوی)[29] (٨٩٣ ـ ٩٣١ کۆچی / ١٤٧٨ـ ١٥٢٤ز) ئاسانتر لێ کر. کو شیعەتی ب هێزا ئاگری و ئاسنی بەلاڤکری[30]، تاکو پرانیا هەرێمێن ئیرانێ بووینە شیعە هە ژ سالا(٩٠٨ کۆچی / ١٥٠٢ز) و رەنگڤەدانا وان لسەر هەرێمێن کوردا و بتایبەتی دناڤ بانیا ئیرانێدا.

کو دئەنجامدا کێمەکا کوردا بوونە شیعە، و ئەڤ کێمە دئاکنجی بوون ل باشوورێ رۆژ هەلاتا کوردستانێ و ب تایبەتی دەڤەرا" لۆریا" و ئەو کوردێن لسەر رێکا بەغدا و کرمنشاه دژین[31].

بۆچی کورد بوونە شیعە؟.

١.وەختێ(نبوخذ نصر) کو پاشایی بابلیا بوو، (جوهی) دەربەدەرکرن ژ فلستینێ بۆ دەڤەرا میزۆبۆتامیا سالا(٥٨٦) بەری زایینی و گەلەک ژوان(جوهیا) چوونە دەڤەرێن کوردان و تێکهەلی دناڤ واندا پەیدا بوو، تاکو ناڤێن کوردی بووینە ناڤێن جوهی وەکی(داود ـ سلێمان).

(راولنسۆن) کو زانا و ئەفسەرو گەرۆکەکێ بریتانییە لدۆر شیعەتیا کوردان ل وان دەڤەرا دبێژیت "هێشتا کارتێکرنا وان جوهیایە ئەوێن(نبوخـذ نـصر)ی هنارتینە دەڤەرێ. چونکە شیعەتیا زێدە رۆیی یا ژ زەرادەشتیێ و جوهیاتیێ و ئیسلامەتیێ هاتی".

٢. ئەڤ دەڤەرێن بەری نها مە دیارکرین، ئیسلامێ جهێ پێ خۆ باش خۆش نەکربوو، ژ ئەگەرێ کو ئوولێ زەرادەشتی گەلەك یێ بەر بەلاڤ بوو، کو تا نهـۆ ژی پەرستگەهێن زەرادەشتیا ل وان دەڤەرا ماینە. و گەلەك گەرۆکێن ئـەرەبا باسێ ڤێ چەندێ کریە.

٣. دیارە کو هندەك رێچێن(مانەوی)و (میترائی) کارتێکرنا خـۆ هـەبوو بـۆ شـیعەکرنا کـوردان، چـونکە شـیعەتی دارسـتیا خـۆدا رێـچەکا هەماهـەنگیێ (توافقی) نە وەکی ئیسلاما سوننی گرتیـیە.

٤. هندەك رێچێن (حروفی ـ بابائی، مشعشعی) ل هندەك دەڤەرێن نێزیکی کوردان ب تایبەتی(لۆرستان، خۆزستان، کۆهستان) بەلاڤبوون.

٥. زۆلم و زۆرداریـیا شـاهێن سـەفەوی(ئیـسماعیل سـەفەوی‌و عـەباس سـەفەوی) کـو یـێ دووێ گەلـەك کـوردێن مـوکری کۆشـتن و گەلـەك ژێ دەربەدەرکرن.

ژێدەر و پەراوێز

١. ابن الجوزي: المنتظم،١٠٦-١٠٤/١٥.

٢. ابن كثير: البداية،٣٥٢/١١، ٣٥٤.

٣. النقشبندي: الكرد في بلاد الدينور،١٦٨، هامش (١).

٤. گۆران: لدویڤ شەرەفنامێ ئێك ژ هەر چوار پشکێن پێك ئینانا گەلێ کوردە، بەرێخۆ بدە(بەدلیسی: شەرەفنامە، ٢٠)" ڤەکۆلەرەکێ کورد بۆ پەیڤا گوران دوو رامانا دیاردکەتن یا ئێکێ جووتیار یا دوویێ ناڤێ هۆزەکێیە ل لایێ رۆژهەلاتێ ل زەهاو(سەربیل زەهاب) دژین ل سنۆرێ رۆژهەلاتێ دناڤبەرا ئیرانێ و عیراقێدا. بەرێخۆبدە(مینورسکی: الاکراد ملاحظات و إنطباعات، ترجمة و تعلیقات معروف خزندار، ص٥ هامش٣)" لێ ژلایەکێ دیڤە هندەك رۆژهەلاتناسا ب ئێك ژ هۆزێن عیراقا فارسی هژمارتن ب گروڤێ نێزیك بوونا زمانێ هەردووکان. بەرێخۆبدە(سون: رحلة متنكرة الى بلاد ما بين النهرين،٦٦٣).

٥. مقدسی دبێژیت: خەلەك ل دۆر ڤەشارتنا تەرمێ(عەلیێ کورێ تالبی) ب گومان بوون کا ل کیرێ هاتیە ڤەشارتن، هندەکا دگوت کو ل (الغری) هاتیە ڤەشارتن، هندەکێن دی دگوت ل (کوفە) هاتیە ڤەشارتن و جهێ وی بەرزەکریە، هندەکێن دی دگوت تەرمێ وی کریو دتابوتەکێدا و ل سەر پشتا حێشترەکێ بەرەڤ (مەدینێ) دچوون، تاکو هۆزا(طهی)(هۆزەکا عەرەبییە)ئاکنجیێن باکورێ مەدینێ)نە دەستەسەرکری ب هزرا هندێ کو گەنجینەکا زێرییە، وەختێ دیتی کو(تەرمە) هەر ل دەڤ خۆ ڤەشارتن و یا دروست خودێ دزانیت. بەرێ خۆ بدە(المقدسي: المطهرين طاهر: كتاب البدء و التاريخ، بيروت، دار صادر عن نسخة مصورة صادرة عن باريس سنة(١٨٩٩م)، ج ٥،ص٢٣٣).

٦. خواند میر، غياث الدين بن هام الدين الحسني/ تاريخ حبيب السير في اخبار افراد بشر (باللغة الفارسية)، طهران مطبعة الحيدري(١٣٣٣) شمس ١٩٥٥م،٤٣٩/٢، مجمل التواريخ و القصص،٤٠١.

٧. ئەڤ گۆتنە بۆ ئەڤرۆکە دروستە، پرانیا خەلکێ ڤێ هەرێما ئیرانێ ژ شیعەیێن توندرەون(عەلی خودێ دهژمێرن هەر وەکی نە سیریا(العلویە) و ئیسماعیلیا و بەهرە و ئاغا خانیا) لێ ل سەدێ چوارێ و پێنجی کوچی ئەڤ هزرە نەما.

٨. النقشبندی: الکرد فی الدینور، ١٦٨، هامش(١).

٩. معجم البلدان،٤/٢٩٧،٣٩٨.

١٠. المسالك و الممالك، ١١٩،ابن حوقل: كتاب صورة الارض.

١١. اثار البلاد،٢٨٢،(بلید ئابە) باژێرەکە دکەڤیتە نێزیکی(ساوە) رۆژ هەلاتێ باژێرێ هەمەدانێ.

١٢. كتاب الرجال،٢/٤٢٣، هەژی گۆتنێیە کو خەلکێ قاشان(کاشان) شیعەیێن ئیمامیێن توندرەون، بەرێخۆ بدە( القزوینی: اپار البلاد،٤٣٢).

١٣. التبنیە و الاشراف،٣٩٥.

١٤. المقدسی : احسن التقاسیم ٣٦٧.

١٥. موعزێ عوبەیدی: خەلیفێ چوارێ یێ عوبەیدیا بوو. ل سالا(٣٤١ کوچی/٩٥٣ز) جهێ بابێ خۆ گرتیە، قاهیرە دامەزراندیە یا کو بوویە پایتەختێ عوبەیدیا(الفاطمین)، و باژێرێن گرابلس و بیروت ستاندینە و شکەستن ئێخستیە ئمپراتوریەتا بیزنگی(یوحنا بن شمشق). ل سالا٣٦٥کوچی/٩٧٥ز چوویە بەردلوڤانیا خودێ. بەرێخۆ بدە(المنجد فی اللغە و الاعلام،٥٣٧).

١٦. المقریزی: تقي الدین احمد بن علي : محمد بن علي: إتعاظ الحنفا بأخبار الملوك و الخلفاء، القاهرة ١٩٤٨، تحقیق الدكتور جمال الدین الشیال، ص٢٦.

١٧. نظام الملك: قوام الدین ابو علي الحسن بن اسحاق الطوسي، باژێرێ مەزن ل بەغدا و ئێکی دی ل (طوس) ئاڤاکریە، گرنگی ب زانستێ دایە، مرۆڤەکێ خێرخواز و جوامێر بو رێزگرتنەکا زێدە. بۆ مرۆڤێن چاك دگرت، دەما هاتیە کوشتن یێ ب رۆژی بوو دەهیڤا رەمەزانێ دا سالا(٤٨٥ کوچی/١٠٩٢ز) ل سەر دەستێ باگنی، بەرێخۆ بدە(الذهبي): سیر اعلام النبلاء،٢/٤٤٩.

١٨. جمال الدين، محمود السعيد: دولة الاسماعيلية في ايران، القاهرة، مؤسسة سجل العرب(١٩٧٧، ص٤٤، هامش٢.

١٩. نظام الملك، الطوسي: سياسەت نامە(سير الملوك).٢٣٣.

٢٠. هبة الله الشيرزاي: مذكرات داعي دعاة الدولة الفاطمية، تحقيق عارف ثامر، بيروت، ١٤٠٣ه /١٩٨٣،ص ٦٧،٦٨.

٢١. هبة الله الشيرازي: المصدر نفسه،ص٦٧.

٢٢. إخوان الصفا: ناسناڤیّ گرۆپەکیّ روناکبیرە هەلگریّن روییەکیّ فەلسەفینە دبیّژن ئەم ژ شیعەییّن ئیسماعیلیێنە، یەکەم پەیدابوونا وان ل نیڤا دوویێ ژ سەدیێ چواریێ کوچی ل بەسرا بوو. ریّکخستنا وان ب نهیّنیەکا رەها بوو هەمی کەس وەرنەدگرتن. هزرا وان یا تیّکهەل بوو ژ فەلسەفا یونانی و ئوولیّن یەهوودی و نسرانی و ئیسلامەتییێ. گەلەك نامە لدویف خۆ هیّلان، بەریّخۆ بدە(غالب، مصطفى: اخوان الصفا، بيروت، دار مكتبة الهلال.١٩٧٩،ص١٥و بیّن دديڤدا.

٢٣. الغزالي: ابو حامد محمد بن محمد: رسالة معراج السالكين من فرائد اللالي، القاهرة ١٣٤٢ ه/١٩٢٤،ص٧٦.

٢٤. الحروفيە: گرۆپەکیّ سوفیگەرییە بنیاتیّ نیاسینا خودیێ ب بیژەییّ (لفظ) و دەربرینا رامانا ویّ ب تیپا(الحروف) دهیّتە کرن و ئەڤ گرۆپە باوەریا خۆ یا سەرەکی ژ پیتیّن هژمارەیی(الحروف الرقمية) وەردگرن و پاشی دەستکارییێ د هژمارا دکەن. دامەزرینەریێ ڤیّ گرۆپیّ(فضل الله الحروفي)یە ل ئستراباد سالا(٧٠٤ کوچی/١٣٠٤ز)ژدایك بوویە و ل سالا(٨٠٤ کوچی /١٤٠١ز هاتیە کوشتن، ئەوی دگۆت ئەژی خەلیفیّ خودیێ مە و هەر وەکی (ادم و عیسی و محمد) سلاڤ ل سەر هەمیان بن) ژبەر ڤیّ چەندیێ خەلکی هیّرش برنە سەر تاکو رەڤی چوویە دەڤ(میران شاه کوریێ تەیمووری) و ب دەستیێ وی هاتیە کوشتن بەریّخۆ بدە(الامين، شريف يحيى، معجم الفرق الاسلامية، بيروت، دار الأضواء، الطبعة الاولى، ١٤٠٦ ه /١٩٨٦م، ص ٩٥).

٢٥. البابائیە: گرۆپەکێ سوفیگەرییە بۆ(بابا اسحاق الکفر سودی الترکمانی) ل سەدێ حەفتێ کوچی دزڤریت دویکەفتیێن وی دگۆت کو پێغەمبەرێ خودێیە و دگوتنێ (بابا) و دگۆت(لااله الا الله البابا ولی الله)بەرێخۆ بدە(الامین: معجم الفرق الاسلامیه،٤٧).

٢٦. البکتاشیە: رێکەکا سوفییە بۆ(السید محمد رضوي) دزڤریت، یێ ب ناڤ و دەنگ لدەف مێژوناسا ب (الحاج بکتاشی)ئەڤە هەڤچەرخێ سولتانێ ئوسمانی (ئورخان)بوو. سەرۆکێ پایە بەرزێ بەکتاشیا ل بازێرێ(بیر اوی) نێزیکی قەیاسرە(بازێرەکە ل نیڤا تورکیا ئەڤرۆکە) کو دهێتە نیاسین ب (شێخێ مەزن) هندەک دبێژن ئەڤە

.٢٧

٢٨. گرۆپەکێ شیعانە، پرانیا وان دیکەفتیێن ڤی رێکێ ل تورکیا و ئەلبانیا دبەر بەلاڤن. بەرێخۆ بدە(الامین: معجم الفرق الاسلامیة" المنجد في القاموس و الاعلام، ١٣٢)،( الخطیب: معجم المصطلحات و الالقاب التاریخیة،١٤).

٢٩. المشعشعیە: بزاڤەکا تێکهەلە ژ سوفیەتیێ و شیعەتیێ بۆ محمدێ کورێ فەلاحێ مشعشعەی دزڤریت یێ کو ل ناڤەندا عیراقێ ژ دایك بووی. و ل سالا(٣٨١ کوچی/١٤٥٧ز) هاتیە کوشتن. (الشعشعیە) رامانا وێ ب ژالەبوون خو ب روناهیێ ڤە گرێدەت و ژ وێ تیرۆژکێن وێ بژالە دبن، بەرێخۆ بدە(الشیبي: الصلة بین التصوف و التشیع ٢٧٠و٢٧٩و٢٨٥و٢٨٦).

٣٠. بزاڤا سەفەوی: بزاڤەکا سوفییە بۆ(الشێخ صفی الدین الاردبیلی) یێ کو لسالا(٣٣٥ کوچی/١٣٣٤ز) باپیرێ مەزنێ شاە ئیسماعیلێ سەفەوی دزڤریت و ناڤێ بزاڤا خۆ هەر ژ ڤی ناڤی وەرگرتیە. ڤێ بزاڤێ رەهەندەکێ سیاسی ل سەر دەمێ(جنید) باپیرێ شاە ئیسماعیلی بخۆڤەگرتیە و شیعەتیا توندرەو چوویە دناڤ سیاسەتا واندا و ئیسماعیل ب هاریکاریا دیکەفتیێن خو شیا خێزانا بەرخێ سپی(الخروف الابیض) ژ ناڤ ببەت، و چوویە دناڤ تەبریزا پایتەخت دا لسالا(٩٠٧

کوچی/١٥٠٢ز). بەرێخۆبدە الشیبی: الصلة بین التصوف و التشیع، ٣٥٦، ٢٦٠ ٣٦٦، الخطیب: معجم المصطلحات التاریخیة، ٣٩٢.

٣١. ئیسماعیل الصفوی: دامەزرێنەرێ دەولەتا شیعی یە ل ئیرانێ. کورێ حەیدەرێ کورێ جونیدە، ل (ئەردەبیلێ) سەرب هەرێما ئەزربیجانێ ڤە ژدایك بوویە. پەنا بۆ هۆزێن تورکی بریە ژبۆ داگیرکرنا ئەزربیجانێ و شیا خێزانا بەرخێ سپی(الاق قوینلو) ژناڤ ببەت، تەبریز کرە پایتەختێ خۆ و شیعەتی ل ئیرانێ فەرزکر، ناسناڤێ(شاه)ب ناڤێ خۆ ڤەکر. دماوێ دەستهەلاداریا وی‌دا گەلەك کریار کرن ژ وانا بەلاڤکرنا ئایردەیێن نووی بو شیعەتیێ ب شێوەکێ سوفی، خورتکرنا شیعەتیێ ل ئیرانێ و رێکخستنا ئاهەنگا ب بیرەوەریا شەهیدبوونا(الحسین) وەکی ڤێ گاڤێ لسەر دچن هەروەسا زێدەکرنا دەستەواژەیا (اشهد ان علیاً ولی الله) ل سەر دقێ بانگێ خودێ و باوەریا ئیسلامێ. بەرێخۆ بدە (الشیبی: الصلة بین التصوف و التشیع،٣٧٢، نقلاً عن تاریخ شاه اسماعیل، ورقة ٤١)(المنجد في اللغة و الاعلام،٤٧).

٣٢. بەرێخو بدە: تاریخ ایران بعد اسلام، عباس اقبال، ترجمة السباعي محمد، القاهرة، ص ٦٤٦ص٧٤٦، هەر وەسا بەرێخو بدە (هویدی، محمد عبداللطیف: الحروب العثمانیة الفارسیة و اثرها في انحسار المد الاسلامي عن اوروبا، ص٤٤).

٣٣. فرست مرعی الدهوکی: التغلغل الایراني في کردستان العراق، مجلة السنة العدد الثاني و السبعون کانون الثاني ١٤١٨هـ ١٩٩٨م، مرکز الدراسات الاسلامیة برمنجهام ص ٧٦ص٧٨.

# قەیسەری هەولێر
## لیکۆڵینەوەیەکی مەیدانی شوینەواریی بیناسازییە

شوینەوارناس: ئاراس اسماعیل خضر

سەرەرای ئەمەی کە شوێنەوارەکان دیاردەی ڕووکاری شارستانی هەموو نەتەوەیەك دیاردەکات . شارو شارۆچکەکانی کوردستان زەمینەیەکی دەولەمەندی ناسنامەی میللەتەکەمانە لەرووی پاشماوە شوێنەوارییەکانی کە تائێستا بە زیندوویی مابێتەوە . کاتێك جوگرافی زانی گەورە ( یاقووتی حەمەوی ) جۆرە بەراوردێکی لە نێوان جوگرافیای هەولێرو ناوچەی حەلەب لە سوریای کردووە . کە شاری هەولێر بە باشتر دەزانێت لە رووی جوگرافیای بازرگانی ناوچەکە دا چونکە ( یاقووتی حەمەوی ) ماوەیەکی باش تەمەنی لە حەلەب بەسەر بردووە . دووجاریش سەردانی شاری اربلی کردووە ، کە جارێکیان لە سالّی (٦١٣ کۆچی ١٢١٦ زاینی ) بووە کە لە حەلەبەوە هاتووە بۆ موصل دواتر بۆ اربل دواتر بەرەو خوراسان و خوارەزم . جاری دووەمیش لە سالی( ٦١٧ کۆچی ١٢٢٠ زاینی) . سەردانی ناوچەکە دەکات [١]. مێژوو نووسی هەولێر ( ابن الاشعری شاگردی ) باسیان کردووە . کە( ابن خلکان ) ی مێژوو نووس ( بازرگانیی هەولێری بە ئابووری هەموو حکومەتێکی دەسەلاّتدار داناوە ) [٢].

بەلام سەبارەت بە بازرگانی شاری هەولێر قەلای هەولێر اربل و بازارەکەی وەکو خۆیی ماوەتەوە ، گۆرانکاریشی بەسەر دانەهاتووە گۆررانیش لە دام و دەزگا ئیدارییەکان دروست نەبووە لە سەردەمەکانی کۆن . چونکە بازارە دووەمی قەیسەری هەروەکو بازارە کۆنەکەی قەیسەری دروست کراوە کە بوونیان شایەتحالی واقعە .

ئەگەر ئەم هۆکارە نەبووایە ئەوا خانووەکانیش و شوێنەکەشی گۆرانی بەسەر دا دەهات [٣]. چونکە لەسەر رێرەوەکەیان دەریایەك دروست نەبووە هەروەها چیاکانی کوردستان دەوری نەدلوە بەلکو زۆر دووربووە . ئەم شوێنەش لەبەر ستراتیژی ناوچەکە ناو ونازناوی قەلای هەولێر هەروەکو خۆیی ماوەتەوە کە بەدرێژایی رۆژگاری مێژوو گرنگی خۆی هەبووە . وەکو لەسەردەمی ئەتابیکدا شاری هەولێر شارێکی تەواو پر لە دوکان و بازارێکی قەرەبالغی ئەم سەردەمە بووە بەلام نەك بازاری ئیستای قەیسەری بەلکو بازارێکی تر هەبووە لەو سەردەمەدا [٤]، لەگەل کۆمەلێك خانوو کە شوێنەوارەکانی ئەم شارەگەلێك پاشماوەی نەماوەتەوە چونکە ئەگەر شوێنێك بازرا بوو بێت بەدلنیاییەوە خانووی تێدا دروست کراوە هەروەکو شوێنگەیەکی ژیانی کاسب کارەکانِ کە گرنگتنیان قەلایی هەولێر و مزگەوتی گەورەی بازار ( مزگەوتی حاجی داود ) و بازاری قەیسەری و خانووە کەلەپووریەکانی سەعدووناوە و خانەقا و تەعجیلن[٥] . لەگەل ئەمەش لەسەردەمی ئەتابیکدا یەکەم قوتابخانەی زانستی لە هەولێر هەبووە کە لەلایەن ئەتابکییەکان ( مظفرالدین الکوکبری) لە سەدەی پێنجەمی کۆچی دروست کراوە بۆ مەبەستی ئاینی [٦]. چونکە شوێنیکی گرنگی

دەسەلاتدارەکانی ئەو سەردەمە بووە . ئەم شارە کۆنە لەگەل دروست بوونی پلانی شارو دانیشتوانەکەی لە ماوەی دەسەلاتی هەر سەردەمێك سیمایەکی کۆنی شارستانی تایبەت بە فەرمانرەوایی هەبووە . ئەمەش بریتین لە پاشماوەکانی کۆشك* ( خانووی احمد چەلەبی ) لە قەلای هەولێر کە مێژووەکەی بۆ سەردەمی عوسمانییەکان دەگەرێتەوە .

شوێنەوارە ئاینیەکان وەك مزگەوتی قەلای هەولێر و تەکیەی شێخ عبدالله لە قەلایی هەولێر . کە ئیستا وەکو (مەبانی ) بینایی شوێنەواری ماوەتەوە* . ئەمەش وەکو دۆکۆمێنتێك دیارە لە شاری هەولێر کە ئەمەش مێژووی شارستانی کۆنی پێوەدیارە [7].کە مێژووەکەیان دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی عوسمانیەکان [8]. لەسەدەی هەژدەهەمی زاینی .

بازاری قەیسەری نمونەیەکی گرنگ و زیندوویی کۆنی ئەم سەردەمەبووە کە تائیستا کاری سەربەخۆی هاولاتیانی تێدا ئەنجام دەدرێت بروانە وێنەی ژمارە (١) ، چونکە یەکێکە لە دۆکۆمێنتە شارستانیەکانی شاری هەولێر ، قەیسەری گەورە لە شاری قەلاو منارە تایبەتمەندیەکی بازرگانی خۆی هەبووە لە سەردەمی مزەفەرەدین کۆکبری [9] و سەردەمی عوسمانیەکان . بازاری قەیسەری لە کۆنەوە تائێستا بە یەکێك لە بنەما بازرگانیەکانی و ئالوگۆرکاری کەل وپەل دەناسرێت . کە مێژوو شایەت حالی ئەم بازارە یە . ئەم بازارە لە ناوجەرگەی شاری هەولێردایە کە شوێنێکی ستراتیژی تایبەتی خۆیی هەیە چونکە لە ناوەندی شارێکی تەمەن ٧٠٠٠ سال لەمەوبەرە [10] کە کۆمەلێك لە دەسەلاتدارانی وەك سومەرییەکان و بابلییەکان و ئاشووریەکان تا دەگاتە فەرمانرەوایی عوسمانیەکان . کە

پاشماوەی شوێنەوارەکان لە شاری هەولێر ماوەتەوە ، بەلام سەبارەت بجوگرافیایی ناوچەکە دەکەوێتە باشووری پارێزگایی دهۆك و بەشی باکوری شاری کەرکوك و بەشی رۆژهەلاتی شاری موصل [١١].

نەخشەی ژمارە (١)

پارێزگای هەولێر لەماوەی سالأنی(١٩٧٥-١٩٨٨)



سەرچاوە/ ئامادەکراوە بە پشت بەستن بە :

١- ئەمین قادر مینە، ئەمنی ستراتیجی عیراق و سێکوچکەی بەعسیان، تەرحیل - تەعریب ،نەخشەکانی ژمارە (١٣ و ١٦ و ١٨).

٢- خلیل اسماعیل محمد، مؤشرات سیاسە التعریب والتهجیر في اقلیم کوردستان العراق، ، خارگە رقم (٥)، ص٢٧.

ناوچەیەکی چوار وەرزی تەواوی هەیە بە پێی ئەندازەی فەلەك ناسی . هەروەها ناوچەیەکی کشتوکالی زۆری تێدا دەکرێت هەموو بەرووبوومەکانی هەر لەم بازاڕەدا دەفرۆشرا .ئەم بازارە بە یەکێك لە تەلاری بازرگانی سێ نهۆمی کەلتووری سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم دەژمێردرێت . کە ئەمەش بۆ پێشکەوتنی لایەنی بازرگانی دەستێکی بالآی هەبووە هەر لە کۆنەوە تاوەکو ئەمرۆ . ئەم بازارە لە هەموو سەردەمێك ستانداردیکی تایبەتی خۆیی هەبووە لە سەردەمی عوسمانیەکان هەرچەند گرنگییشیان نەداوە بە بازاری قەیسەری . ئەمەش چونکە بۆ ئەوان شوێنێکی ستراتیژی دەسەلاتی نەبووە . بەلام زۆربەی بازرگانەکان شوێنیکی تایبەتیان هەبووە سەبارەت بە شوێنی پشوودان لە دەوروبەری قەیسەری کە پێدەوترا خان ( یان دیوەخان ) ئەم دیوەخانەی کە هەبووە بەرامبەری مزگەتی قەیسەری ئێستا بووە . کە دەکاتی شوێنی ئیستا بازاری سیروان [١٢] . کە هەموو کاروانچیان لەم شوێنە پشوویان دەدا تا سالانی ١٩٥٠ _ ١٩٥١ پاشماوەی ئەم دیوەخانە هەر مابوو . **بازرای قەیسەری** / بازاڕی قەیسەری تاکە بازاریکی کۆنی شاری هەولێربووە. ووشەی قەیسەری کە بۆ ئەم بازارە بەکارهاتووە . تاوی قەیسەری بۆ

کۆمـەلێك بـازاری کـۆنی شـارو دێهـاتی تـر ی جیهـانی بـەکارهاتوە .نـاوی قەیسەری لە ناوە راستیەکەیەوە بریتیە لـە بـازرای کـۆنی قەیـسەری رۆم لـە ئەستانبۆل .کە ئەم ووشەیە دەگەرێتەوە بۆ امبراتـۆر قەیـسەر کـە لـە شـاری قوسـتەنتینیە فـەرمانرەوایی کـردووە . ئـەم بـازارە ئێـستاش پاشماوەکـە ماوەتـەوە کـە پێـی دەلـێن ( قپـاتلی چارشـو ) [١٣].دواتـر عەرەبـەکان ئـەم ووشەیان بەکارهێناوە بۆ بازارەکانی خۆیان کە وەکو بازاریکی داخراو وابوون . هەروەها یونانیەکان ئەم ووشەیان بەکارهێناوە بۆ بازارەکانی خۆیـان. هـەر بۆیـە ئـەم نـاوە تـا ئێـستاش بـە قەیـسەری ناودبرێـت لـە شـاری هـەولێری .قەیسەری لە هەموو ولاتانی دۆنیا ئەگەر هەبێت پێك دێت لە بازارێکی داخراو کە لە چەند دووکانێك کە رِارەوێکـی درێـژ هەیـە لـە سـەر شـێوازی کـۆلآنێکی تەسك لەسەر یەك شێوازی بیناسازی بنیاتنراوە [١٤]، بروانە وێنەی ژمارە (٢).

نەخش و نیگارەکانی بیناسازی قەیسەری لەیەك دەچن وە هەروەها لە سەر یەك شێواز و یەك بنەمای کەرەستەی بیناسازی دروست کراوە کە پێکهاتەی ئـەم بـازارە بریتیـە لـە خـشت و گـل و گـەچ . لـە ناوەراسـتی هەنـدیك لـە بازارەکانی قەیسەری لە وولآتانی عەرەبی گۆرەپانێکی گەورە هەیە . ئەمەش بۆ داگرتنی ئەم کەل وپەلانەی وەك بازرگانی و ئالوگۆرکردنی بـەکارهاتووە . لەم گۆرەپانـە عـەمبار دەکرێـت . وەلـە هەنـدێك بـازاری قەیـسەری شـێوازی جیاوازی هەیە کە بریتین لە ژمارەی یەك ژووری بچووك کە بەکارهاتووە بـۆ پشوودانی بازرگانەکان یان خاوەن کالآکانی ئەم سەردەمە بووە .

ئـەم شـێوازە ی بیناسـازی بـازاری قەیـسەری لـە ولاتـانی تـری دونیـا دەبینرێت . وەك بازاری قاهیرەو و بازاری حەمیدیە لە دیمەشق یان بـازرای

کۆنی شام . هەروەها بازاری قەیسەری لاسایی بیناسازی بازاری موصل و بازرای شام کراوەتەوە [١٥]. بازارەکانی قەیسەری کە ناوێکی گەورەی سەردەمیانە بووە . بۆپیاوانی دەولەمەند و خاوەن بازرگانی گەورە بەکارهاتووە لەگەل ئەمەش کە بازارێك قەیسەری بوو بێت ، بازارێك بە تەنیشتیەوە بوووە کە پێی دەوترا قەیسەری بچووك ، کە هاولاتیان و دانیشتوانە هەژارەکان کەلکیان لێ وەردەگرت . قەیسەری گەورەی هەولێر لە سالی ١٨٢٠ – ١٨٣٠ زاینی لە لایەن بەریزان حاجی قادر دباغ و حاجی حوێز مامە پیرس دروست کراوە [١٦]. لە ئەنجامی ئەمە هاتووە کە هەردوو بەرێزان سەردانی مالی خوای گەورەیان کردووە بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج لە گەرانەوەیان بە وولاتی شام گەرانەوە سەردانی بازاری حەمیدیەیان کردووە . بۆیە هەمان بیرۆکەی دروست کردنیان خستەبەر بۆ دروست کردنی هەردوو بازارەکە ، لە نزیك ئەم بازارە بازارێکی تر هەبووە کە پاشماوەی شوێنەوارەکەی نەماوە کە لە سالی ١٢٥٠ زاینی کە لەلایەن مزەفەری گوگبوری دروست کرابوو ، ، بەلام ئەم بازارەی کە ئیستا دەبینرێت بازاری سەردەمی عوسمانیەکان بووە ، قەیسەری هەولێر پێك دێت لە دوو بازاری گەورەی کۆنی شوێنەواری کە یەکێکیان ناسراوە بە قەیسەری گەورە یان گومرگی کۆن واتە هەموو کەل وپەلەکان دەهێنرایە ئەم شوێنە ، ئەم بازارە هەر لە کۆنەوە وەکو شوێنێکی بازرگانی و گومرگ کردنی کەل و پەلەکان دەست نیشان کراوە . هەر بۆیە حاجی قادر کە دەکاتە باپیرەی ( اسعد چلبی ) لە سالی ١٨٧١ زاینی دامەزرێنەری ئەم بازارە بووە سەرپەرشتی ئەم بازارەی کردووە . کە دواتر لەلایەن موسەوییەکان نۆژەن کرایەوە واتە نوێ

کرایەوە لە لا یەن جووەکان . کە پێی دەڵێن بازاری جوولەکان کە لەساڵی ١٩٠٩ – ١٩١١ نوێکرایەوە .

بەڵام ئیستا جاریکی دیکە بازاری قەیسەری دووچاری وێران بوون دێت وە بازاری دووەم بریتییە لە قەیسەری بچووك کە لە سەر شێوازی قەیسەری گەورە دروست کراوە وە دامەزرینەری ئەم بازراە بریتی بووە لە حاجی حوێزی کوری مامە پیرس [١٧]. ئەم بازراە تەواوکەری بازاری قەیسەری گەورەیە بۆ فرۆشتن کەل و پەلەکان بە خەلکانی هەژار .. بازاری قەیسەری پێك هاتوە لە بازارێکی داخراوی چوار دەرگای سەرەکی هەیە کە شێوازی دەرگاکان بریتین لە پێوانەی ٨٠ ، ٤ مەتر بەرزە و ٢٠، ١ مەتر پانی دەرگایی سەرەکیە[١٨]. بروانە وێنەی ژمارە (٣) .

ئەم دەرگایانە لە ماددەی دار دروست کراوە رووپۆشی دەرگاکان بە ماددەی ئاسن و بزماری ئاسنینی داپۆشراوە ، ئەمەش جۆریکە لە نەخش و نیگاری بیناسازی دەرگاو پەنجەرەکانی بازاری قەیسەری . ئەم دەرگایە بەشی سەرەوەی لەسەر شێوازی عەقدێکی شێوە قوچەکی و هێلکەیی دروست کراوە کە لە هەموو پاشماوە شوێنەوارییە ئاینیەکان بوونیان هەیە [١٩]. ئەم شێوازە زیاتر لە سەردەمی عەباسیەکان باوبووە . پێکهاتەی ئەم دەرگایە دوو راگری بەردینی لە لای راست و چەپی دەرگاکە دەبینرێت کە لە ماددەی مەرمەر دروستکراوە . کە ئەمەش کە لە دەوروبەری شاری هەولێر هاتووە بۆ لایەنی بیناسازی دەرگاکە و راگیرکردنی ، کە بریتیە لە داریکی درێژ سەرەکی کە پێی دەڵێن بەشی سەرەکی دەرگاکە کە بەشی خوارەوەی وەکو نووکیکی تیژ دەچەقێنرایە ناو بەردێکی کون کراو بۆ زیاتر کردنەوەو

جولانى دەرگاكە ، لە دەرگاى سەرەكى دەرۆينە ناو بازارەكە كە مەمەرێكى راست و كۆلانێكى رێك كە كۆمەلێك دوكان لە خۆ دەگرێت ، كە لە سەر يەك شێواز بە كار هاتووە و دروست كراوە. بروانە وێنەى ژمارە (٤) .

بەلاّم سەبارەت بە پێكهاتەى بازارەكە لە سێ نهۆمى كەلتوورى پێك دێت . كە نهۆمى يەكەم واتە نهۆمى خوارەوە بريتييە لە سەرداب،، واتە ژێر زەمين بە واتا ناوەخۆيەكەى وە نهۆمى دووەم كە نهۆمى ناوەراستە بريتيە لە دوكانەكان ، بەلام سەبارەت بە نهۆمى سێيەم كە بريتيە لە شوێنى داگرتن و عەمبار كردنى كەل و پەلەكانى ئەم بازارە . چونكە ئەم بازارە وەكو كۆگايەك بەكارهاتووە لەم سەردەمەدا [٢٠] . هەروەها لە سەقفى بازارەكە ديارە كە سەقفێكى نيوە بازنەيى داخراوى درێژە .بروانە ژمارە ( ٥) . بەلام لە هەندێك شوێن پاشماوەى نەماوە دارماوە . لە ئەيوانى ئەم مەمەرە دەبينرێت چەندين كونى شێوە چوارگۆشە و لاكێشە هەيە كە ئەمەش بۆ رووناكى بەكارهاتووە ،وە هەنديك كونى شێوە لولەكى هەيە كەشوێنى ئەم دارانە بووە كەبۆ ساترى يان بەلەكۆنى ناوەكى بەكارهاتووە . بەلام سەبارەت بە پێكهاتەى بيناسازييەكەى بريتيە لە ماددەى گلّ و گەچ و خشتى سوور كە لەهەولێر پێى دەوترێت كەرپووچ . كە هەردوكانێك لە ماددەى كەرپووچ دروست كراوە شێوەى دوكانەكان بە پێى شوێنى بازارەكە دەگۆرێت ، كە هەنديكيان چوار گۆشەن و هەنديكيان لاكيشەن ، بەلام سەيرى ناواخنى هەر دوكانێك دەكەين رووبەريكى بچووكى هەيە ، كە ئەمەش بۆ فرۆشتنى كەل و پەلى نموونەيى بەكار هاتووە . بەشێوەيەكى تاك بەلام بەكۆمەل لە ناو كۆگايەكە دەهێنرايە دەرەوە دەدرا بە كريارەكان . ئەم

بازارە لەسەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم باوبووە کاری مامەلەگەری تێدا کراوە . بەلام دیواری دوکانەکان کە کە پێوانەکەی ۸۰-۹۰ سەنتیمەتر بوو لە بەشی سەرەوە دەرگای دووکانەکان حەلقەیەکی بازنەیی هەیە کە ئەمیش بۆ راگرتنی ئەم دەرگایە بووە بۆ دووکانەکان ئەو سێ بەشەی کە دەرگای دووکانەکانی داخستوە بریتی بووە لە بەشی یەکەم کە خوارەوەیە دەبوو بە مێزی بەردەمی دوکانەکە بەلام بەشی دووەم کە ناوەراستی دەرگا دارەکەیە دەچوە سەرەوەدەبوو بە ساتری‌دووکانەکە [21] واتە سێبەری دووکانەکە بەلآم سەبارەت بە عەقدی دووکانەکە هەموویان لەسەر یەك شێواز بوون لە ناوەخنی دووکانەکە گومبەتێك یان گومەزەیەك هەبووە کە نیوە بازنەیی بووە ئەمەش جۆرێکە لە هونەری بیناسازی ئەم سەردەمە کە لەسەردەمی ئەمەوییەکان و عەباسیەکان بە شێوازێکی جوانتر بە کارهاتووە [22] ئەم عەقدەی دووکانەکانی پێك هێناوە لە ماددەی مەرمەر دروست کراوە کە لە شاری موصل هێنراوە بۆ بنیات نانی قەیسەری کە تائێستا بەردی حەللان لە موصل زۆر باوە و بەکاربێت کە ئەمەش یەکێك بووە لە توخمە سەرەکیەکانی بیناسازی سەردەمی ئیسلام هەر وەکو لە دەرگا و میحراب و کۆلآنەکانی بازاری قەیسەری دەبینرێت بروانە وێنەی ژمارە ( ٦)

بەلآم سەبارەت بە زەوی ناو کۆلآنەکانی بازاری قەیسەری بریتی بوو لە فەرش کراوی خشتی سوور کە ئێستا بە ماددەی موزائیك رووپۆش کراوە.بەلآم سەبارەت بە نهۆمی سێ یەم لەگەڵ هەر ڕیزە دووکانێك رێگایەك هەبووە دەرۆیشتە بەشی سەرەوە کەنهۆمی سێ یەمە . پێکهاتەی نهۆمی سێ یەم

بریتی یە لەکۆمەڵێك ژووری شێوە چوار گۆشە و لاکێشە کە ئەمانە وەکو کۆگاو شوێنی پشوو دانی بازرگانان بەکارهاتووە. پەنجەرەکانی ئەم ژوورانە لە سەر شێوەی میحراب دروست کراوە کە بە ماددەی دار داخراوە وە هەروەها لە بەشی دەرەوەی پەنجەرەکان بە ماددەی ئاسن رووپۆش کراوە کە لە سەر شێوەی شەبەکەیەکی ئاسنی دروست کراوە کە هەندێکیشیان نەخشکراوە وەهەندێکیان بێ نەخشن ئەندازەی بیناسازییە [22]. براونە وێنەی ژمارە (٧)

.لە بەشی دەرەوەی دەبینرێت کۆمەڵێك (طاق) شێوە نیوە بازنەی دەبینرێت لە ناوەراستی نهۆمی سێ یەم لە بەشی دەرەوەدا هەر وەکو دیارە.لەم نهۆمەدا تارمەیەکی لەدار دروست کراو هەیە کە وەکو بەلەکۆن بۆ ئەم سەردەمە بەکارهاتووە کە سیاجێکی لە دار دروست کراو وەنەحشێنراوە[24].جوانکارییەکانی بازاری قەیسەری لە رادە بەدرە بووە بەلام بۆ سەردەمانی ئێستا هیچ بایەخێکی نیە لەبەر ئەوەی وێرانی و رووخانی بە خۆیەوە بینیوە بۆ چارەسەری ئەم کێشە لەلایەن کۆمەڵێك لیژنەی شوێنەواری بیانی هونەری نۆژەنکردنەوەی بۆ دارێژراوە بەلام تا ئێستا کارەکان ئەنجام نەدراوە .




وێنەی ژمارە (١): بازاری قەیسەری لە ساڵی ٢٠٠٧ ، کە تائێستا کاری بازرگانی هاوڵاتیان تێیدا بەردەوامە .
وێنەی / توێژەر : اراس اسماعیل خضر




وێنەی ژمارە ( ٢) : بازاری قەیسەری لە رووی بیناسازیەوە
وێنەی / توێژەر : اراس اسماعیل خضر



وێنەی ژمارە ( ٣):
یەکێك لە دەرگاکانی قەیسەری
گەورە لە شاری هەولێر /
وێنەی/ توێژەر : اراس اسماعیل خضر



وێنەی ژمارە (٤):
یەکێك لە کۆلانە سەرەکیەکانی
بازاری قەیسەری شاری هەولێر
وێنەی/ توێژەر : اراس اسماعیل خضر



وێنەی ژمارە (٥ ):
یەکێك لە ئەیوانی کۆڵانە سەرەکیەکانی بازاری قەیسەری شاری هەولێر
وێنەی / توێژەر : اراس اسماعیل خضر



وێنەی ژمارە (٦):
یەکێك لە پێکهاتەی دوکانەکانی بازاری قەیسەری شاری هەولێر
وێنەی / توێژەر : اراس اسماعیل خضر




وێنەی ژمارە (٧):
یەکێك لە پێکهاتەی پەنجەرە و تاقەکانی بازاری قەیسەری شاری هەولێر .
وێنەی / توێژەر :
اراس اسماعیل خضر

پەراوێزەکان:

[١] یاقوت الحموی : شهاب الدین ابی عبدالله بن یاقوت بن عبدالله الحموی الرومی : ت٦٢٦هـ – /١٢٢٨م ، معجم البلدان ، مجلد الاول ، ط٢ ، بیروت ، ١٩٩٥ ، ص ٤٣٨ .

[٢] حسین: محسن محمد : اربیل فی العهد الاتابکی ، مطبعة ، الاسعد ، بغداد ، ١٩٦٥ . ص١٠١ .

[٣] الباحث : زیارة میدانیة ومقارنة بالاقوال السابقة حول سوق اربیل ( قیصری هتولێر ) .

[٤] حسین: د محسن محمد . نفس المصدر ، ص ١١٤ .

[٥] دراسة الباحث حول الاثار المجاورة الباقیة لحد الان ، المصادف ٢٣/١٢/ ٢٠٠٧ .

[٦] حسین:، نفس المصدر ، ص ١١٤ .

♣ دەتوانین بلێن کۆشك بە خانووەکەی(احمد چەلەبی و خانووی رشید اغا ) چونکە سەبارەت بە خانووەکانی تر رووبەرێکی گەورەتر و لە دوونهۆمی پیاو ماقولەکان دروست کراوە

♣ المبانی الاثریة : مانایی هەموو پاشماوەکانی کە خانوو بەرەو مزگەوت و کۆشك و تەلار و کلێساو دیر و تەکیەو قەلاو لە خۆ دەگرێت .

[٧] اسماعیل حجارة : التنقیب فی قالینج اغا ( اربیل ) الموسم الرابع . ١٩٧٠ ، مجلة السومر ، عدد ٢٩ ، ص ١–٢ ، مدیریة الاثار العامة ، بغداد ، ١٩٧٣، ص ١٢–٣٤ .

(٨) زوبیر بلال اسماعیل ، اربیل فی ادوارها التاریخیة ، مطبعة النعمان ، النجف الاشرف ، ١٩٧١ ، ص٤٥ .

(٩) د محسن : نفس المصدر ، ص ١١٢ .

(١٠) زوبير بلال اسماعيل ، اربيل في ادوارها التاريخية ، مطبعة النعمان ، النجف الاشرف ، ١٩٧١ ، ص ٦١-٦٢ .

(١١) حسب الخارطة اربيل شكل رقم ( ١) ،

(١٢) الباحث ولقاء مع الاهلي السوق . المصادف ، ٣٤ /١٢ / ٢٠٠٧ .

(١٣) هذه الكلمة ماخوذة من المصطلحات اللغوي التركية ، لقاء مع الاستاذ المساعد ، د عبدالله حداد ، من جامعة صلاح الدين ، المصادف ٢٣/ ١٢ / ٢٠٠٧ .

(١٤) حسن ، زكي محمد ، الفنون و الاسلام ، القاهرة ، ١٩٤٨ ، ص ٥٤ .

(١٥) زيارة الباحث : الى سوق الحميدية بسوريا ، المصادف : ٥/ ٨/ ٢٠٠٦ . مع وفد قسم الاثار .

(١٦) لقاء مع د عبدالله حداد ، المصادف /٢٠٠٧/١٢/٢٣ .

( ١٧) لقاء مع الكاسب ، حاجي خليل و يعمل في هذا السوف من السنة ١٩٣٤ ، حتى الان.

( ١٨) الجمعة ، احمد قاسم الجمعة : العناصر و الميزات المعمارية في المدرسة الستنصرية ،المراحل التاريخية للمدرسة المستنصرية ، محمد المشهداني ، اسامة ناصر النقشبدندي ، ١٩٨٦٧ ، بغداد ، ص ٤٢.

(١٩) رجب : غزي : العمارة العربية في العصر الاسلامي في العراق ،. بغداد ،. ١٩٨٩ ، ص ٢١٠ -٢١٦ .

(٢٠) الباحث : اخذت المعلومات من الاهالي السوق .

(٢١) دراسة ميدانية / حول الموضوع بقلم الباحث :

(٢٢) الاعظمي : خالد خليل : المراحل التاريخية للمدرسة المستنصرية ، محمد جاسم ، اسامة النقشبندي نفسس المصدر ، ص ١٩ .

(٢٣) الاعظمی ، خالد خليل ، الزخارف الجدارية فی اثار بغداد ، بغداد ، ١٩٨٠ ، ص٧٢ .

(٢٤) الحداد : محمد حمزة اسماعيل ، موسوعة العمارة الاسلامية فی العصر من الفتح العثمانی حتی عهد محمد علی ، مطبعة قاهرة . ١٩٩٨ ،، ص١٥٩ .

# داهێنان و دروست كردنی مۆری لوولەیی لە لایەن سۆمەریەكان

ئارام جلال حسن هموندی
ی. توێژەر: لە بەشی شوێنەوار
زانكۆی سەلاحەددین

دوای ئـەوەی كـە مـرۆڤ لـە كۆتـایی چـاخی بـەردینی ناوەراسـت (Mezolithic )* بەشێوەیەكی سەرەتایی و سنووردار فێری كشتوكاڵ بوو [١]. ئەوا لە چاخی بەردینی نـوێ (Neolihtic)** كـشتوكاڵ بـووە بناغـەی ژیانی ئابووری مرۆڤ . كشتوكاڵ رۆڵێكی سەرەكی هەبوو لـە گەشەسـەندن و پێشكەوتنی مرۆڤ . بەجۆرێك كە گۆڕانێكی گەورەی لـە ژیـانی مرۆڤـی كـۆن دروست كرد ، لە دیارترینی ئەو گۆرانكاریانەی كە بەهۆی كـشتوكاڵ ڕوویانـدا ئەمانەن: بەخێوكردنی ئاژەڵ و چاك كردنی زەویەكان بەمەبەسـتی كـشتوكاڵ كردن ، لەو سەردەمەدا(چاخی بەردینی نوێ )مرۆڤ بەیەكجارەكی نیشتەجێ بوو دوای ئەوەی كە لە چاخەكانی پێشتر مرۆڤ گەرۆك بـووەو خـۆراكی خـۆی تەنها بە كۆكردنەوە ئامادەكردووە نەك لە رێگەی كشتوكاڵەوە . هەروەها لەم چاخەدا ( چاخی بەردینی نوێ ) مرۆڤ خێزانـی پێكهێنـاو دواتـر كۆمەڵگـەش بەشێوەیەی سەرەتایی دروسـت بـوو ، ئەمـە سـەرەرای ئـەوەی كـە چـەندین گۆرانكاری تری گرنگ لە ژیانی مرۆڤ روویدا [٢]. مرۆڤ لـە چـاخی بـەردینی نـوێ پـشتی بەهـەردوو سەرچـاوەی كـشتوكاڵ كـردن و بـەخێوكردنی ئـاژەڵ

بەستا بۆ رێکخستنی کاروباری ژیانی رۆژانە و بارودۆخە ئابوورییەکەی. دوای ئەوەی کە مرۆڤ بەیەکجارەکی نیشتەجیٚ بوو ئەوا سەرەتای خاوەندارییەتی تاکە کەس ( الملكيه الفرديه ) سەریهەڵدا ، ئەمەش لە سەرهەڵدانی مۆری رووتەخت ( Stamp Seal ) دەردەکەوێت و رەنگ دەداتەوە[٣]، ئەمەشیان لە ئەنجامی زۆربوون و جۆراوجۆری بەرووبوومە کشتوکاڵی و ئاژەڵییەکان دەرکەوت[٤] ، بەم جۆرەش بەرهەمە کشتوکاڵی و ئاژەڵییەکان لەپێداویستی مرۆڤەکان زۆرتر بوون و وای کرد کە مرۆڤی کۆن هەڵیگرێت و لەکاتی پێداویستی بەکاری بهێنێت ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بەروبوومە زیادەکانی لای لەگەڵ ئەو کەل وپەل و ماددانە دەگۆرییەوە کە لەلای خۆی و ژینگەکەی دەوروبەری بەدەست نەدەکەوت ، وەك بەدەستهێنانی هەندێك جۆری بەرد کە ئامێر و کەل و پەلە کشتوکاڵییەکانی خۆی لیٚ دروست دەکرد ، ئەمەش بەسەرەتایەکی سەرهەڵدانی بازرگانی و گەشەی ئابووری دادەنرێت [٥]، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە لەکاتی کنەو پشکنینە شوێنەوارییەکان چەندین کۆگا دۆزراونەتەوە کە بۆ کۆکردنەوەو هەڵگرتنی کەل و پەلەکان و بەرووبوومەکان دروستکرابوون ، ئەم کۆگایانە لە هەریەکە لە گوندە سەرەتاییەکانی وەك : حەسونە [٦] ، ئوم دەباغیە [٧] ، گردی سەوان [٨] دۆزراونەتەوە، ئەم کۆگایانەش لە شێوەی حەوزی بازنەیی و گۆزەی قەبارە گەورەی دەردەکەوتن و لە قوری سورنەکراوە دروست کرابوون (وێنە ١) .

هەندێك لەم کۆگایانە قەبارەیان زۆر گەورەبوو ،کە رەنگە وەك کۆگایەکی گشتی وابێت کە لەلایەن گشت خەڵکی ناوچەکە بەکارهاتووە و تایبەت نەبووە بە تەنها یەك خێزان [٩] ، شایانی باسە ئەم کۆگایانەش لە

ڕووی دەرەوە بە قیر داپۆشرابوون [١٠] .کۆکردنەوەو هەڵگرتنی ئەم گۆزە و کەلو پەلانە لە کۆگایەکی گشتی بەم جۆرە دەبێتە هۆی تێکەڵ بوونیان بەیەکتری و ناتوانرێت کەل و پەلەکانی کەسێك بە ئاسانی لە هی یەکێکی تر جیابکرێتەوە ، کە ڕەنگە زۆر جار کێشەی لە سەر دروست ببێت ، ئەمەش پاڵی بەمرۆڤی وولاتی دوو ڕووبار نا بۆ ئەوەی هۆکارێك دابهێنیت تا لەم جۆرە کێشانە رزگاریان بکات و بەدووریان بخاتەوە ، ئەم داهێنانەش بریتی بوو لە مۆر [١١] ، مۆرەکان لە سەرەتادا بەشێوەیەکی ڕووتەخت بەدەرکەوتن *** ، مۆری ڕووتەخت بریتیە لە پارچە بەردێکی شێوە ئەندازەیی ( بازنەیی ، هێلکەیی ، لاکێشەیی ) کە لەسەر ڕوویەکی یان هەردوو ڕوو چەند هێڵێکی ڕاست و ئەریب یان یەکتربڕ هەڵکەندراون ، بۆ یەکەم جار ئەم جۆرە مۆرە لە چینی دووەمی گردی حەسوونە ( ٥٤٠٠ پ.ز ) لە کوردستانی عێراق(باکوری عێراق) دۆزراونەتەوە [١٢] ، بەهەمان شێوەش لە گردی سەوانیش دۆزراونەتەوە [١٣] ، کە ئەمەشیان مێژووەکەی بۆ هەمان سەردەمی حەسوونە دەگەڕێتەوە [١٤] ، دواتر ئەم جۆرە مۆرە لە کوردستانی سووریا ( باکوری سووریا ) و کوردستانی تورکیا ( ئەنادۆل ) سەریان هەڵداوە [١٥] ، بەڵام هەندێك لە توێژەرەکان دەڵێن مۆری ڕووتەخت بۆ یەکەم جار لە سەردەمی حەلەف لە هەزارەی پێنجەمی پێش زاین سەری هەڵداوە [١٦] . (وێنە ٢ )

چۆنیەتی بەدەرکەوتن و داهێنانی ئەم جۆرە مۆرە شتێکی لەناکاو نەبووە ، بەڵکو بەچەند قۆناغێك تێپەر بووە ، ئەمەش لە نەخش و نیگارەکانی سەر ڕووی گڵێنەکانەوە دەردەکەوێت **** . چونکە ئەو نەخش و نیگارانە بە سەرەتایەکی هەوڵەکانی مرۆڤ دادەنرێت بۆ ناسینەوەو

جیاکردنـەوەی بەرهەمـە دروسـتکراوەکانی خـۆی لـەوانی تـردا ، بـەڵام ئـەم رێگەیە پێویستی بە کارێکی زۆر هـەبوو ، هـەروەك ناتوانرێـت هـەموو کاتێـك هـەمان جـۆری نـەخش و نیگارەکـان وەك خـۆی لـە سـەر ڕووی گڵێنـە جـۆر بەجۆرەکان وەك یـەك دروسـت بکاتـەوە ، هـەروەها دروسـتکردنی نـەخش و نیگارەکان پێویستی بەکاتێکی زۆر هەبوو ، ئەم کێشانە وایان کرد کە مـرۆڤ هەڵستێت بە هەڵکۆلینی نەخش و نیگارەکان یان هێماکـانی تایبـەت بـەخۆی لەسەر ڕووی بەردێك ، دواتر بـە ڕووی بـەردە هەڵکۆڵدراوەکـە فـشار دەخاتـە سەر ڕووی گڵێنەکە لەوکاتەی کە هێشتا تەڕەو تەواو ووشـك نەبۆتـەوە، بـەم جۆرە نەخش و نیگارەکان یان هێماکانی سەر ڕووی بەردەکـە هـەموو کاتێـك وەك خۆی لەسەر ڕووی گڵێنە جۆربەجۆرەکان دەردەچێتەوە ، یـان بەفـشار خـستنی ڕووی بەردەکـە بـەو تاتـە قـوڕەی کـە دەرچـەی گۆزەکـان و گڵێنـە جۆربەجۆرەکانی پێ دادەخرا . بەم جۆرە بەشێوەکی ئاسان و هەموو کاتێـك نەخش ونیگارەکان و هێما جۆربەجۆرەکان بەهەمان شێوە وەك خۆی لەسـەر ڕووی گڵێنە و تاتە قوڕەکـان دووبـارە دەکرایـەوە . ئەمـەش لـە دوو ڕووەوە سوودی هەبوو :

یەکـەمیان : ناسـینەوەی کـەل وپەلـەکان لـەلای خاوەنەکـەی بەشـێوەیەکی ئاسان و بێ گرفت و پاراستنی لە دزین و تێکەڵاوی به کەلوپەلی کەسێکی تر، ئـەویش بـەهۆی ئـەو نـەخش و نیگـار و هێمایانـەی کـە لەسـەر ڕووی کـەل و پەلەکان مۆرکرابوون بە هۆی مۆرەکەوە .

دووەمیان : ئەم داهێنانە کاتێکی باشی بۆ مرۆڤی کۆن گەڕاندەوە ، چونکە پێش ئەم داهێنانە مرۆڤ ناچاربوو خۆی نەخشەکان لەسەر ڕووی یەکە یەکەی

گلێنـەکان بکێـشێت ، ئەمـەش زەحمـەتی و کـاتێکی زۆر دەخایـەنێت، بـەڵام بەهۆی داهێنـانی مـۆر ، مـرۆڤ تـەنها بـە ڕووی مۆرەکـە فـشار دەخاتـە سـەر گلێنەکان لەحاڵەتی تەریدا ، کـە دەبێتـە هـۆی دەرچـوونی هـەمان نـەخش و نیگار و هێما لەسەر ڕووی گلێنەکە .

ئەم جۆرە بەردە ڕوو هەڵکەندراوەش بە مۆری ڕووتەخت ناودەبرێت ، هەندێك لە توێژەرەکان سەرهەڵدانی مۆر زیاتر بـۆ لایـەنی بیروبـاوەری ئـاینی مرۆڤەکانەوە دەگەڕێننەوە و دەڵێن مۆرەکان لـە نووشـتەوە سـەری هەڵـداوە ***** ، بەجۆرێك کە دەتوانرێت ئەو مۆرەی کە لەسەر ڕووەکەی هێمای پیرۆز هەڵکەندراوە بە داگرتنی لەسەر ڕووی قورێك یان گلێنەیەك لە حاڵەتی تەریـدا هەمان هێمـای پـیرۆز دەردەچێت، بەمـەش ئـەم هێما پـیرۆزەی سـەر ڕووی مۆرەکە بەهەمان شێوە دەگوازرێتەوە بۆ سـەر ڕووی گڵێنەکـە یـان قورەکـە بەپێی بیروباوەری مرۆڤی کۆن ، بەم پێیەش ئەو تاتـە قـوڕەی کـە دەرچـەی گۆزەکانی پێ داخراوە یان ئەو گڵێنانەی کە مۆری هێمـا پیرۆزەکـانی لەسـەر کـۆپی کـراوە ،دەبێتـە هـۆی گواسـتنەوەی هێـزی جـادوویی نووشـتەکە (مۆرەکـە)بـۆ سـەر گڵێنـە و گۆزەکـە، بەمـەش هەریـەکێك بیـەوێت قـەپاغی قورینـەی دەرچـەی گڵێنـە و گۆزەکـە بـشکێنێت بەمەبەسـتی دزینـی کـەل و پەلـەکانی نـاوی ئـەوا تووشـی ئـازاری هێمـا پیرۆزەکـانی سـەر مۆرەکـە (نووشتەکە) دەبێت ، ئەمەش وا لـە کەسـەکە دەکـات کـە ترسـێك بیگرێـت و نەوێرێت قەپاغەکە بشکێنێت [١٧] ، هەروەك هەندێك لە توێژەرانی تـر پێیـان وایە کە کۆنترین جۆرەکانی مۆر لەو ملوانکانەی (pendants) کـە لەبـەردی سەوز (ستیتایت Steatite) و ئەو بـەردە بازنەییـە بـچووکانەی کـە لەسـەر

ڕووەکەی هێلی ڕاست و یەکتربڕ هەڵکەندراون بریتین لە کۆنترین جۆری مۆری ڕووتەخت[١٨] ، مۆری ڕووتەخت بە بەردەوامی لە سەردەمەکانی دوای سەردەمی حەسونە بەکارهاتووە ، وە لە هەردوو سەردەمی حەلەف و عوبێد مۆری ڕووتەخت بەشێوەیەکی فراوانتر تەشەنەی کرد و زۆرتر بەکارهێنرا .بابەتە هەڵکەندراوەکانی سەر مۆرەکانی سەردەمی حەلەف بەزۆری ئەندازەیی بوو ، بەڵام مۆری سەردەمی عوبێد بریتیە لە جۆرە مۆرێکی ڕووتەختی نیمچە بازنەیی، کە وێنەکانی سەر ڕووی مۆرەکە تاراددەیەك ئالۆزی پێوە دیارە و زۆر لایەنی گرنگمان پیشان دەدات ، گرنگترین وێنە هەڵکەندراوەکانی سەر ڕووی مۆری ڕووتەختی سەردەمی عوبێد ئەمانەن : ئاژەڵی شاخدار ، سەگی ڕاوکردن ، وێنەی مرۆف کە دەمامکێکی لەسەر دەم وچاوی داناوە ،یان وێنەی دوو مرۆف دەردەکەوێت کە لەحالەتی جووت بووندان[١٩] ( وێنەی ٣ ) .

هەروەها جۆرە مۆرێکی ئەم سەردەمە کە لەگردی تەپەگەورە دۆزراوەتەوە کە مۆرکی تاکە کەسی و ئاینی پێوە دیارە [٢٠] . (وێنە ٤)،هەرچی مۆری لولەییە کە دوای مۆری ڕووتەخت سەری هەڵداوە ،کە مێژووی سەرهەڵدانی بۆ نیوەی دووەمی سەردەمی وەرکا دەگەڕێتەوە ، کە بۆ یەکەم جار لە چینی ( ٤ب )شاری وەرکای سۆمەری لە دەورووبەری ٣٥٠٠پ.ز دۆزراوەتەوە [٢١] .

مۆری لوولەیی : بریتیە لە پارچە بەردێکی شێوە لوولەییی ، کە بەشێوەی درێژی لە ناوەڕاست کونکراوە بەمەبەستی هەڵواسینی بە ملەوە لەرێگەی داوێك یان پەتێك یان زنجیرێکی کانزایی ، لەسەر ڕووی مۆرە

لوولەییەکان وێنەکان بە یارمەتی ئامێرە جۆربەجۆرەکانی هەڵکۆڵین بەشێوەیەکی پێچەوانە ( معکوس ) هەڵدەکۆڵران ، ئەمەش بۆ ئەوەی لە کاتی داگرتنی بەسەر ڕووی تاتە قوڕەکان وێنەکان بەشێوەیەکی تەواو وەك خۆی دەربچێت ، واتە بەم جۆرەی کە خاوەنەکەی ویستوویەتی دەربچێت[٢٢] . ( وێنەی ٥ ) .

شێوەی مۆری لولەیی یارمەتی خاوەنەکەی دەدات لە مۆرکردنی ڕووبەرێکی بێ کۆتا مادەم مۆرە لوولەییەکە لەسەر ڕووبەری تاتە قورە دەخولێنرێتەوە ، بەڵام وێنەکان بەشێوەیەکی دووبارەکراوەیی دەردەچن و دووبارە دەبنەوە[٢٣] ، لەبەر ئەوەی شاری وەرکا تاکە شوێنە کە کۆنترین جۆری مۆری لوولەیی تیایدا دەرکەوتووە ، بۆیە داهێنانی مۆری لوولەیی بۆ دانیشتوانی شاری وەرکای سۆمەری دەگەڕێتەوە واتە بە یەکێك لە داهێنانەکانی سۆمەریەکان دادەنرێت[٢٤] .

شێوەی مۆری لوولەیی گونجاوە لەگەڵ سروشتی کارەکانی مرۆڤی سۆمەری جا سەرهەڵدانی ئەم شێوە لوولەییە لە ناکاو بێت یان بە قۆناغ قۆناغ سەری هەڵدابێت، هەرچۆنێك بێت داهێنانی مۆری لوولەیی لە پاڵ داهێنای نووسین بەیەکێك لە داهێنانە شارستانیە گرنگەکانی سۆمەریەکان و عێراقی کۆن دادەنرێت[٢٥] .

هەرچی شێوە و قەبارەی مۆری لوولەییە ئەوا بەشێوەیەکی گشتی لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر جیاوازی هەبووە ، هەندێکیان قەبارەکەیان یەکجار گەورەیە ، ئەمەش وەك مۆرە لوولەییەکانی سەردەمی وەرکا(٣٥٠٠ ـ ٣٠٠٠پ.ن)[٢٦] ، بەڵام هەندێکیان یەکجار درێژ و تیرە باریکن ،

ئەمــەش وەك مــۆرە لوولەییــەکانی ســەردەمی بەرەبــەیانی بنەماڵــەکان ، بەتایبــەتی ســەردەمی گزنگــی بنەماڵـەکانی یەکـەم [٢٧](٢٩٠٠ ـ ٢٨٠٠ پ.ن) هەنـدێکیان قــەبارە بــچووکن وەك مــۆرە لوولەییــەکانی ســەردەمی بــابلی کۆن(٢٠٠٠ ـ ١٥٣٩ پ.ن) ، ئەمە سەرەرای بوونی مۆری شێوە رووچاڵ ( مقعر ) و قۆقز ( محدب ) و مۆری ستاندارد ( نموونەیی )[٢٨] .(وێنە٥).

هەرچـی ئـەو ماددەیـەی کـە مـۆری لوولـەیی لـێ دروسـت دەکرێـت ئـەوا بەشـێوەیەکی گـشتی بـەردە ، وە لەهـەر سـەردەمێك بـەکارهێنانی جـۆرێکی دیاریکراو لە بەرد لە دروسـت کردنـی مـۆر بـاوبووە، لـە چـاخەکانی سـەرەتا (سـەردەمی وەرکـا) زیـاتر ئـەو بەردانـە بـەکار دەهـاتن کـە ناسـك بـوون و کارتیـاکردن و هـەڵکۆڵینیان ئاسـان بـوو ، وەك بـەردی کلـس ، ئەلابەسـتر ، بەردی سابوونی و بەردی جیری ، بەڵام لە سەردەمی ئەکەدی و دواتر بـەردی بەهێز و رەق بەکارهاتووە لە دروست کردنی مۆردا ، وەك بەردەکانی دیورایت ، لازوورد و عەقیق ، بەللوری شاخاوی [٢٩] ، بەکارهێنانی ئـەم جـۆرە بـەردە رەقانە بۆ سێ هۆکاری سەرەکی دەگەرێتەوە کە ئەمانەن :

١- پێشکەوتنی ئامێرەکانی تایبەت بە درووست کردنی مۆر بـە جۆرێـك کــە توانــای هــەبوو ئــەم جــۆرە بــەردە رەقانــە هــەڵبکۆڵێت و نەخشەکانی لەسەر دروست بکات .

٢- تواناو لێهاتوویی وەستا لە بەکارهێنانی ئەم بەردانە لە کارەکانی دا

٣- گرانی نـرخ وجـوانی ئـەم بەردانـە وای کردبـوو کـە داواکـاری گـشتی لەسـەر بێـت ، چـونکە ئـەم بەردانـە بـە ئاسـانی تووشـی دارمـان

وداخوران نابن بە جۆرێك کەوای لێ بێت وێنەکانی سەر مۆرەکە لە پاش ماوەیەکی کەم بخورێت و ڕەشبێتەوە.

سەرەرای ئەمانەی سەرەوە ئەوا هەندێك مۆری لوولەیی هەیە کە لە قوری سوورکراوە ، سەدەف و گوێچکە ماسی و شاخی فیل ( عاج ) هەویری قەرت ، کانزای وەك زێرو زیو و مس درووست کراوە ، بەڵام ئەگەر مۆرەکە لە کانزا دروست بکرێت ئەوا ناواخنەکەی لە دار یان قیر دروست دەکرا [٣٠] ، هەروەها هەندێك جۆری مۆری لوولەیی هەیە کە هەردوو جەمسەرەکەی بە ماددەیەکی کانزایی وەك زێر یان زیو داپۆشراوە ئەم بەرگە کانزاییەش نەخشی ئەندازەیی جوانی لە سەر هەڵکەندراوە [٣١] . بەکارهێنانی ئەم جۆرە مۆرانە بەپێی بەرزی پلەی کۆمەڵایەتی کەسەکە بوو ، بۆ نموونە تاکە هەژارەکانی ناو کۆمەڵگەی سۆمەری مۆرەکانیان لە بەردی بێ نرخ یاخود لە قور درووست دەکرا ، بەڵام کەسێکی پایە بەرزی ناو کۆمەڵگە مۆرەکەی لە بەردی بەنرخ دروست کراوە .

ئەم جۆرە بەردانەی کە لە وڵاتی دوو رووبار بەکاردەهاتن لە درووست کرنی مۆردا بە شێوەیەکی گشتی کەم بوون ، هەربۆیەش ئەم بەردانەیان لە ناوچەکانی دەوروبەری وڵاتی دوو رووبار دەهێنران [٣٢] ، زۆر جار بەردەکان لە گەڵ کەل وپەلی تر بە ئامادەکراوەیی لە ناوچەی بەردەکە خۆی دەهێنران [٣٣] ، بۆ نموونە بەردی لابس لازولی لە چیای سەری سەنگ (Sarisang)****** لە دۆڵی بەدخشان لە وڵاتی ئەفغانستانی ئێستاوە بۆ وڵاتی دوو رووبار دەهێنرا [٣٤] ، هەروەها عەقیق و لازورد لە وڵاتی هیند و ناوچەکانی کەنداوی عەرەبی دەهێنران [٣٥] .

هەرچی ئەو ئامێرانە بوون کە لە دروووست کردنی مۆردا بەکار دەهاتن ، ئەوا لە قۆناغەکانی سەرەتا ئەم ئامێرانە لە بەردی رەق و بەهێز دروست دەکران وەك بەردی سەوان و ئۆبزیدی کە لەسەر شێوەی چەقۆو برەر ( مقاشگ ) دروست دەکران [36]، بەلآم بە دۆزینەوەی مس لە کۆتایی هەزارەی چوارەمی پێش زاین ئامێرەکانیان لە مس دروست دەکرد [37] ، دواتر لە سەردەمی ئاشووری لە کانزای برۆنز و پاشان ئاسن دروست دەکران [38] ، ئەو ئامێرانەی کە لە دروست کردنی مۆر بەکاردەهاتن لەسەر شێوەی کونکەرو چەقۆو برەر و تاشەر و مەورەد دروست دەکران [39] ، هەروەها ئامێرێکی تری پێشکەوتوو هەبوو کە لە دروست کردنی مۆر بەکاردەهات ، ئەم ئامێرەش پێکدەهات لە کەوانەیەك و پەتێکی توندکراو بە هەردوو جەمسەری کەوانەکە ، کە لەناوەراستی پەتەکە ئامێرێکی نووك تیژی وەك ( سومبە ) یان چەقۆیەکی بچووکی پێوەبوو، کە بەهۆی ئەم ئامێرەوە رووی مۆرەکەی پێ نەخش ئەکرا ئەویش بەهۆی سوورانەوەی ئەم چەقۆیە (سومبە) بەیارمەتی پەتەکە لە سەر رووی مۆرەکە ، رەنگە ئەم ئامێرەش لە ئامێری کونکەری خولاوەی دەستی ( المثقب اليدوي الدوار ) گەشەی سەندبێت و کە لە سەردەمەکانی پێش تر بەکاردەهات [40]، بەلآم لە سەردەمی کاشیەکان (١٥٩٥ ـ ١١٥٧ پ.ز) پەپکەی خولاوە بەکاردەهات بۆ دروست کردن و هەلکۆلینی بابەتەکانی سەر رووی مۆرە لوولەییەکان، ئەم ئامێرەش بریتیە لە پەپکەیەك کە بەخێراییەکی زۆر دەخولێتەوە بەردی مۆرەکەی لێ نزیك دەکرێتەوە ، ئەمەش دوای ئەوەی کە نەخشەی یان پلانی ئەو وێنانەی کە دەمانەوێت هەلیکۆلین لە سەر رووی مۆرەکە دیاری دەکرا ، کاتێك مۆرەکەی

لێ نزیك دەکرێتەوە بەری دەکەوێت و هەڵی دەکۆلێت و وێنەکەی لە سەر نەخش دەکات[٤١] .

لە گرنگترین شێوازەکانی نەخشاندن و هەڵکۆلینی دیمەنەکانی سەر ڕووی مۆری لوولەیی ئەمانە :

١ ـ شێوازی برین ( cutter style ) :

ئەمەش بریتیە لە کۆنترین شێوازی دروست کردنی مۆری لوولەیی ، کە تیایدا ئامێرێکی تیژ بەکاردێت بۆ برینی ئەو بەشەی کە دەمانەوێت نەخشەکەی لە سەر هەڵبکۆلین ، ئەمەش بە پەستانی ئامێرەکە لە سەر ڕووی بەردەکە بە مەبەستی برینی ، بەم ئامێری برینەش بە زۆری لە بەردی بەهێز و ڕەق لەسەر شێوەی چەقۆ و کەتەر دروست دەکرا[٤٢] .

٢ ـ شێوازی داماڵین ( تحزیز ) :

لەم شێوازە دا ئامێرێکی نووك تیژ بەکاردێت ، ئەو وێنەیەی کە نەخشەی بۆ کێشراوە لەسەر ڕووی بەردەکە ( مۆرەکە ) بە شێوەیەکی بەردەوام لێی دەخشێنرێت و بەهێواشی بەشە دیاریکراوەکەی ڕووی بەردەکە دادەماڵێت هەڵی دەکۆلێت ، بەم جۆرە بە شێوەیەکی بەردەوام ئامێرەکە لەسەر شوێنی پێویست دەخشێنرێت تاکو وێنەکە دەگاتە قوڵی پێویست [٤٣] .

٣ ـ شێوازی کونکردن/ درێل ( Drilling ) :

لەم شێوازە دا ئامێرێکی کونکەری نوك تیژ بەکاردێت ، لەسەر ڕووی مۆرەکە هەندێك بەشی سەرەکی وێنەکە دیاری دەکرێت هەڵدەکۆلرێت ، بۆ نموونە : بۆ دروست کردنی وێنەی مرۆڤێك لە سەر ڕووی مۆرەکە ،

سەرەتا چەند خاڵێکی دیاریکراوی وەك سەر ، قۆڵ ، سنگ ، قاچەکانی ،هەڵدەکۆڵرا ، ئەم خاڵە سەرەکیانە لە سەرەتادا بە شێوەیەکی نیمچە بازنەیی دەردەکەون ، پاشان ئەم خاڵە نیمچە بازنەییانە بەشێوازی برین و داماڵین بەیەکی دەگەیەنن و دیمەنی مرۆڤێکی ئاسایی دەردەچێت [٤٤].

بۆ هەرجۆرێك لە نەخش و دیمەنەکان شێوازی تایبەتی هەیە لە هەڵکۆلینی ، بۆ نموونە وێنەکانی سرووشت و ژیانی ڕۆژانە کە پێویستیان بە ووردی و دیقەتێکی زۆر هەیە ئەوا بەهۆی ئامێرەکانی وەك ، کونکەر و مەورەد و کەتەری دەستی ( ازمیل ) دروست دەکرێت ، بەلام بۆ هەڵکۆلینی نەخشە ئەندازەی و هێل و شێوە هێماییەکان ئەوا ئامێرە پیشکەوتووەکانی وەك کونکەری خولاوەو ( المثقب الدوار ) و پەپکەی خولاوە بەکاردەهات [٤٥]، ئەم شێوازەی بەکارهێنانی ئامێرەکان زۆر جار یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی بزانین کە ئەم مۆرانە لە چ سەردەمێك دروست کراون ، چونکە لە هەر سەردەمێك جۆرە شێوازێکی هەڵکۆلین و دیمەنی دیاریکراو باوبووە ( مودیل بووە ) کە لەگەڵ سەردەمێکی تر جیاوازی هەیە [٤٦].

هەرچی وەستای دروست کردنی مۆرە لوولەییەکانە ئەوا زانیاری کەممان دەربارەی هەیە ، بەلام هەندێك لە تێکستە مێخیەکان و پاشماوە شوێنەواریەکان تەئکید لەسەر بوونی وەستای تایبەت بۆ درووست کردنی مۆری لوولەیی دەکەنەوە.

وەستای دروست کەری مۆری لوولەیی لە زمانی سۆمەری بە( بور — گوڵ / BUR – GUL ) ناودەبرێت بەلام لە زمانی ئەکەدی بە (پور —

كوللو / purkullu ) ناودەبرێت ، ئەمەش بەم مانایانە دێت : دروست كەری بەرد ، بەرد هەڵكۆڵەر ، نەحت كردن و نەخش كردنی مۆر[٤٧]، هەروەك هێماكەی لە نووسینی سۆمەری لە قۆناغی وێنەیی زۆر لە ئامێری كونكەر دەچێت [٤٨].

لەیەكێك لە خانووەكانی گردی ئەسمەر ( تل أسمر ) لە ناوچەی دیالە ، كە بۆ سەردەمی ئەكەدی (٢٣٣٤ ـ ٢١٥٤ پ.ز) دەگەرێتەوە لەكاتی كنەو پشكنینەكاندا هەندێك ئامێرو كەل وپەلی تایبەت بە دروست كردنی مۆری لوولەیی لەگەڵ ئامێرەكانی تایبەت بە دروست كردنی مۆر لەگەڵ هەندێك مۆری لوولەیی تەواو دروست كراو و هەندێكی تر كە هێشتا تەواو نەكرابوو گشتیان لە ناو گۆزەیەك دۆزرانەوە [٤٩] ، بەهەمان شێوە لە كۆشكی ماری قاپێكی گڵێنە دۆزرایەوە كە چەندین شت و مەكی گرنگی لەژێر دروستكراوی تێدا بوو ، كە لەبەر گرنگی كەلوپەلەكانی ناو ئەم گۆزەیە ئەمرۆ بە ( زێری ئوور ) ناو دەبرێت ، ئەم كەل وپەلانەی ناو ئەو قاپە بە دیاریەكی شاری ئوور لە باشووری وولاتی دوو رووبار دادەنرێت كە بۆ شاری ماری ( لە كوردستانی سووریا ) رەوانە كرابوو. ئەمەش چونكە زۆربەی كەل وپەلەكانی ناوقاپەكە لە دروستكراوەكانی شاری ئوری سۆمەری بوون ، لەنێوان كەل و پەلەكانی ناو قاپەكە ( ١٤ ) مۆری لوولەیی بەكارنەهێنراو هەبوو ئەمە سەرەرای بوونی چەندین شتی تری بەنرخی وەك بازن ، خەناوكە ، ملوانكە ، گەوهەرێك كە لە لازورد دروست كرابوو ، كە لەسەری نووسینی مێخی هەڵكەندرابوو

سەرەڕای بونی سێ پەیکەری بچووك و جووتێك دەمبوزی جل وبەرگ لەزێر دروستکراو [50] ، ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە لە سەر بوونی شوێنی تایبەت بە وەستای درووست کردنی مۆری لوولەیی لە وولاتی سۆمەر ، بە جۆرێك کە ناوبانگیان بە وولاتانی دەوروبەر وەك مەملەکەتی ( ماری ) ******* گەیشتووە ، هەروەها بوونی ژمارەیەکی زۆری مۆری لوولەیی لە نێوان خشل و گەوهەرەکان و پەیکەرەکان بەڵگەیە لەسەر گرنگی مۆر لە شاری ماری ، ئەمەش چونکە لەبەرهەمی شاری ئوور لە باشووری وولاتی دوو رووبارە .

سەرەرای ئەوەی کە وەستای دروستکەری مۆری لوولەیی بە ( بور ــ گول ) ناسراو بووە ، بەلام چەندین ناوو نازناوی تر هەبووە کە لە سەردەمە جیاوازەکاندا وەستای دروستکەری مۆری لوولەیی پێ ناسراوە ، لەوانە ناوی ( زا ــ دم / ZA – DIM ) کە لەسەردەمی بنەماڵەی ئوری سێهەم زۆر باو بووە لە بەکارهێناندا ، بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە ناوەکانی وەستای دروست کەری مۆری لوولەیی و ئەو ئامێرو کەل وپەلانەی کە لەدرووست کردنی مۆردا بەکارهاتووە ، ئەمە سەرەرای هێماکانی نووسینی مێخی پەیوەست بەم لایەنە سەیری (خشتەیی کۆتای ئەم بابەتە بکە ) .

بەم شێوەیە مۆری لوولەیی گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە لە ژیانی مرۆڤی کۆنی وولاتی دوو رووبار تەنانەت گرنگیەکەی گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە خوداوەندی تایبەت بە خۆی هەبێت .

داهێنانی مۆری لوولەیی بە داهێنانێکی سۆمەری دادەنرێت ، وەرێگەکانی درووست کردنی مۆر لە وولاتی دوو رووبار بە سەرکەوتووترین رێگاکانی دروست کردنی مۆر دادەنرێت ، هەرچەندە دواتر لەناوچەکانی تری کوردستانی سووریا و کوردستانی تورکیا و عیلام و مصر مۆری لوولەیی دروست کراوە بەڵام لە رووی بابەت و جوانی نەخشە و وێنەکانەوە نەگەیشتە جوانی مۆرە لوولەییەکانی وولاتی میزۆپۆتامیا .

ئەمرۆ مۆری لوولەیی بە یەکێك لە گرنگترین داهێنانە شارستانیەتەکانی تایبەت بە شارستانیەتی وولاتی دووروبار دادەنرێت . کە گرنگیەکی زۆری هەیە چ لە بەکارهێنانی رۆژانە لە وولاتی عێراقی کۆن (میزۆپۆتامیا) و چ بۆ شوێنەوارناسانی ئەم سەردەمە دەتوانین گرنگترین سوودەکان و بوارەکانی بەکارهێنانی مۆری لوولەیی بەم شێوەییەی خوارەوە بخەینە روو

مۆری لولەیی لە مۆرکردنی ئەو قوڕانە بەکاردەهاتن کە دەرچەی گڵێنە و گۆزەکانی پێ دادەخرا بۆ ئەوەی لە شکان و دزین بپارێزرێت ، ئەم کارەش لە هەزارەی سێهەی پێش زاین ئەنجام دراوە[51] ( وێنە٦)

ئەمە سەرەرای ئەوەی کە مۆرەکان لە مۆرکردنی تابلۆکانی نووسینە مێخییەکانی تایبەت بە کاروبارەکانی رۆژانە ( بازرگانی ، دارایی ، ئابووری ، یاسایی، سیاسی ) هەروەك لە تۆمارەکانی تایبەت بە پەرستگاکان دەردەکەوێت(، مۆرکردنی تابلۆ مێخیەکان بۆ مەبەستی بە یاسایی کردنی بووە ، چونکە ئەگەر تابلۆ مێخیەکانی تایبەت بە بواری بازرگانی مۆری خاوەنەکەی لەسەر نەبێت ئەوا بە یاسایی دانانرێت[52]. هەروەها ئەمغەی مۆرەلوولەییەکان لە قوفل کردنی دەرگای مالەکان بەکاردەهات ، ئەمەش

کاتێك خاوەن ماڵەکان ماڵی خۆیان بەجێ دەهێشێت ئەوا هەڵدەستان بە بەستانەوەی سنارەی دەرگاکە بەهۆی پەتێك پاشان تۆپەڵە قوڕێکیان پێ دادەدا و ئینجا خاوەنی ماڵەکە بە هۆی مۆرەکەیەوە تەمغەی مۆرەکەی لەسەر دەکرد وەکاتێك دەگەڕایەوە دەزانێت کەسێکی بێگانە چۆتە ماڵەکەی ئەویش لە ڕێگەی شکانی ئەو قورەی کە سنارەی دەرگاکەی پێ داپۆشراوە[٥٣]

زۆربەی نامەکان ( بەتایبەتی نامە نێو دەولەتیەکان ) ئەوا دەبوایە تەمغەی مۆری پاشا یان حاکمی دەسەڵاتداری پێوە بێت بۆ ئەوەی بە یاسایی لە قەلەم بدرێت[٥٤]

تەمغەی مۆری لوولەیی زۆر گرنگ بووە کە لە گشت کاروبارێکی ژیانی رۆژانەی وەك کرین وفرۆشتن و بەکرێدان و قەرز وەرگرتن و قەرزدان بەکار دەهات . بەکارهێنانی مۆرەکان لەم جۆرە مامەڵانە زەروور بووە چونکە ئەگەر تەمغەی مۆری خاوەنەکانی لەسەر نەبووایە ئەوا ئەم تابلۆیەی کرین و فرۆشتن بە نایاسایی دادەنرا ، لەم حالەتە دا ئەگەر لایەنێك زەرەرمەندبووایە ئەوا تەنها خۆی بەرپرسیار دەبێت . ئەمەش هەروەك لە یاسای حەمورابی لە مادەی ١٠٤ و ١٠٥ روونکراوەتەوە کە دەڵێت :

ماددەی ١٠٤ / {ئەگەر بازرگانییێك گەنم یان صوف یان هەر شتێکی تر بە قەرز بدات بە فرۆشیارێکی گەڕۆك بەمەستی فرۆشتن ، ئەوا لەسەر فرۆشیارە گەڕۆکەکە پێویستە سەرەتا نرخەکەی دیاری بکات و بیدات بە بازرگانەکە ، لە بەرامبەریشدا فرۆشیارەکە دەبێت پسوولەیەکی مۆرکراو وەرگرێت کە تیایدا ئاماژە کرابێت بە وەرگیرانی نرخی کەل و پەلەکان} .

مادەی ١٠٥/ {بەڵام ئەگەر فرۆشیارە گەڕۆکەکە کەمتەرخەمی کرد و نرخی کەل وپەلەکانی واسل کرد بەڵام پسولەی مۆرکراوی وەرنەگرت ئەوا ئەو برە پارەیەی کە واسل کراوە بێ وەرگرتنی وەصل لە حیساباتەکان ناژمێردرێت . واتە ئەگەر بازرگانەکە بلێت پارەی نەداوە ئەوا فرۆشیارە گەڕۆکەکە هیچ بەڵگەیەکی پێ نیە بیسەلمێنی کە پارەکەی داوە بۆیە دەبێت دوو بارە پارەی شتەکان بدات بە بازرگانەکە}[55]. لەم دوو ماددە قانوونیە بۆمان دەردەکەوێت بوونی ئەمفەی مۆرەکان زۆر زەروور بووە لەسەر تابلۆ مێخیەکانی تایبەت بەگشت لایەنەکانی ژیان چونکە سیفەتی قانوونی پێ دەبەخشێت .

بەکارهێنانی مۆرەکان بەشێوەیەکی نایاسایی کاریگەرییەکی زۆر خراپی لەسەر کۆمەڵگەی دانیشتوانی کۆنی وولاتی نێوان دوو رووبار هەبووە هەر بۆیەش ئەگەر کەسێك مۆرەکەی خۆی لێ وون ببایە ئەوا دەبووایە سەرەتا ئەنجوومەنی پیران (مجلس الشیوخ ) ئاگادار بکاتەوە ، ئەمەش لە ترسی ئەوەی کە مۆرەکەی لە لایەن یەکێکی تر بەناوی خاوەنەکەیەوە بەکاربهێنرێت بەم پێیەش ئەنجوومەن هەڵدەستا بەئاگادار کردنەوەی خەلکی ناوچەکە بەوەی کە مۆری فلانە کەس وون بووە ، دوای ئەوەی هەر کەسێك مامەلە بەم مۆرە بکات خۆی بەرپرسیار دەبێت ، ئیتر خاوەنی بنەرەتی مۆرەکە بەرپرسیار نیە لە خراپ بەکارهێنانی مۆرەکە لەلایەن یەکێکی ترەوە ، ئەمەش چونکە پێشتر ئیعلانی وونبوونی مۆرەکەی خۆی کردبوو ، ئەمەش بەواتای مۆرە وون بووەکە سیفەتە یاساییەکەی لە دەست داوە . بەڵام ئەگەر مۆرەکە دۆزرایەوە و گەڕاندرایەوە بۆ خاوەنی سەرەکی مۆرەکە ئەوا دەبێت

بەشێوەیەکی فەرمی جارێکی تر لە لایەن ئەنجوومەنی پیران ئیعلانی دۆزینەوەی بۆ بکرێت واتە مۆرەکە سیفەتی قانوونی بۆ گەڕاوەتەوە[٥٦].

مۆری لووولەیی لە بواری ئاینیەوە ڕۆلێکی گرنگی هەبووە لە بیروهۆشی مرۆڤی کۆنی وولاتی نێوان دوو ڕووبار ، ئەمەش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە هەندێك نووسراوە مێخیەکان ئاماژەی پێکراوە ، کەدەلێت مۆری لوولەیی وەك نووشتە ،یان بۆ بەتاڵ کردنەوەی سیحر بەکارهاتووە [٥٧].

سەرەرای گرنگی مۆری لووولەیی لە ژیانی دانیشتوانی کۆنی عێراق ئەوا بەهەمان شێوە مۆری لوولەیی گرنگیەکی یەکجار زۆری هەیە بۆ شوێنەوارناسەکان و توێژەرەکان چونکە پشت بەستن بە پەیکەرە داتاشراوەکان و هەلکۆڵدراوەکانی تر بەتەنها بیرێکی ڕوون نادات سەبارەت بە هونەری وولاتی نێوان دوو ڕووبار (میزۆپۆتامیا) ، بەلأم نەخش و وێنە هەلکۆلدراوەکانی سەر مۆری لوولەیی زانیارییەکی تەواوی پێ بەخشیوین سەبارەت بەگشت لایەنێکی ژیانی دانیشتوانی کۆنی وولاتی نێوان دوو ڕووبار ، هەربۆیەش زاناکان و شوێنەوارناسەکان زیاتر پشت بە مۆری لوولەیی دەبەستن بۆ شارەزا بوون لە شارستانیەتی میزۆپۆتامیا[٥٨] دەتوانین سوودەکانی مۆری لوولەیی لە بەدەرخستنی دیاردە شارستانیەکانی وولاتی نێوان دوو ڕووبار بەم شێوەی خوارەوە بخەینە ڕوو :

١. بەهۆی نەخشە هەلکۆلدراوەکانی سەر مۆرە لوولەییەکان توانیمان شێوەی کۆنترین جۆری پەرستگا لە عێراقی کۆن بزانین(٥٩) (وینە ٧ )
٢. توانیمان جۆری ئەو ئاژەلانەی کە مرۆڤ لەوکات بەخێوی دەرکرد و هەروەها ئەو ئامێرو کەل وپەلانەی کە ژیانی ڕۆژانەی خۆی دروستی دەکرد وبەکاری دەهێنا بزانین(٦٠) .

٣. زانینی دیمەنی خوداوەندەکان و هێماکانیان و روون کردنەوەی چەند دیمەنێك و لایەنێکی مەراسیمە ئاینیەکانی ئەو کات ، کە تیایدا پاشاو کاهن و کۆیلە و خزمەتکارەکان هەر یەکەیان بە پێی بەرزی و پلەی کۆمەلآیەتی بەدەردەکەوتن(٦١) .(وێنە ٨)

٤. بەدەرخستنی هەندێك لایەنی تایبەت بەئەفسانەکانی کۆنەکان ،وەك ئەفسانەی سەرکەوتنی (ئیتانا) بۆ ئاسمان بە مەبەستی بەدەست هێنانی رووەکی بەپیتی بۆ ئەوەی منداڵی ببێت ، وە ئەفسانەی دزینی تابلۆی چارەنووس (الواح القدر ) لە لایەن بالندەی (زوو)(٦٢) ، ئەمە سەرەرای ئەوەی کە وێنەی ئەو ئاژەڵە ئەفسانەییانەمان پیشاندەدات کە مرۆڤە کۆنەکان باوەریان بە بوونی هەبوو(٦٣) .(وێنە٩)

٥. پیشاندانی هەندێك دیمەنی جەنگی نێوان خوداوەندەکان و چەندین دیمەنی تر(٦٤).(وێنە ١٠)

٦. بەدەرخستنی شێوازی جل و بەرگ و کەل وپەلەکانی تری ئەو سەردەم ، چونکە هەریەکە لە خوداوەندەکان و پاشا و کاهن و کۆیلەو ئافرەتەکان جلی تایبەت بە خۆیان هەبووە(٦٥) ئەمە بێجگە لە دەرکەوتنی شێوەی کەشتی و چەك و عارەبانەی جەنگی و کورسی خوداوەندەکان چەندین شتی تری گرنگ کە زانیاری تەواوی لە بارودۆخی ئەو سەردەمی پێ بەخشین(٦٦).

٧. هەندێك دیمەنی درووست کردنی زەققورە لەسەر رووی مۆرەکان تۆمار کراوە ، کە ئەمەش سوودێکی زۆری هەبوو ، چونکە پێش ئەوەی زەققورە لە عیراقی کۆن بدۆزرێتەوە وێنەکەیمان بەدەست گەیشتبوو

بــەهۆی مــۆرە لولەییەکانــەوە ، ئەمــەش بــووە ڕێخۆشــکەرێك کــە شوێنەوارناسەکان بتوانن دواتر بیدۆزنەوە(٦٧) (وێنە ١١).

لە کۆتاییدا دەتوانین بلێین مۆری لوولەیی بە یەکێك لە گرنگترین دیاردە شارستانیەکانی تایبەت بە وولاتی نێوان دوو ڕووبار دادەنرێت کە بەدرێژای شارستانیەتی میزۆپۆتامیا بەردەوام بەکارهاتووە ، ئەوەی شایانی باسە ئەم دیاردە شارستانیە گرنگە بەگشت ناوچەکانی تری ڕۆژهەلاتی کۆن بلاوبووەوە وەك : وولاتەکانی : ئیلام ، ئەنادۆل ، سووریا ، فەلەستین ، میسر و تەنانەت گەیشتۆتە دوورگەکانی ئیجە و ناوچەکانی کەنداوی عەرەبیش بەلام لەڕووی جوانی نەخش و وێنەکانەوە ناگەنە ئەوانەی عیراقی کۆن

## وێنەکان



وێنە ـ ١ ـ

وێنەی کۆگاکانی ناوچەی حەسوونە



وێنەی -٢-

مۆری رووتەخت





وێنەی -٣-

مۆری رووتەختی سەردەمی عوبێ کە دیاردەی جووتبوونی نێوان دوو کەس پیشان دەدات



وێنەی -٤-

چەند دانەیەك لە مۆری رووتەختی ناوچەی تەپەگەورە



وێنەی -٥-

چەند نموونەیەکی تەمغە و شێوەی مۆری لوولەیی لە سەردەمە جۆریەجۆرەکانی وولاتی نێوان دوو رووبار



وێنە ٦

چۆنیەتی داپۆشینی دەرچەی گۆزەکان بە قوڕ و و مۆر کردنی بەهۆی مۆری لوولەیی



وێنە ٧

دەرخستنی شێوەی پەرستگا لەسەر مۆری لوولەیی لە سەردەمی وەرکا ( ٣٥٠٠ ـ ٣١٠٠ پ.ز)




وێنە -٨- أ

دیمەنێكی خوداوەندی رۆژ كە پێشوازی لە پەرستراوەكانی دەكات




وێنە - ٨ب ،جـ -

دیمەنێكی سرووشت و ئاژەلی شاخدار و چۆنیەتی راوكردنیان پیشان دەدات




وێنە ٩ - أ -

دیمەنی چەند بوونەوەرێكی ئەفسانەیی



وێنە ٩ ـ ب ـ

دیمەنی بەشێك لە ئەفسانەی چوونی ( ئیتانا ) بۆ ئاسمان



وینە ٩ ـ ج ـ

دیمەنی دەست بەسەر کردنی پیاوی ـ بالندە ( زوو) کە تابلۆی چارەنووسی دزیبوو لەم دیمەنە بەرەو لای خوداوەند ( انکی ـ ایا ) ی دەبەن بۆ ئەوەی دادگایی بکات



وێنە ٩ ـ د ـ

دیمەنێکی ئەفسانەیی کە ئاژەڵ تیایدا مۆسیقا دەژەنێت



وێنە١٠ـ أ ـ

دیمەنی بەدەرکەوتنی خوداوەندی رۆژ ( خۆرهەڵاتن ) پیشان دەدات سەرەرای بوونی چەند خوداوەندێکی جیاجیای وەك ( خوداوەند عەشتار ، خوداوەند ئەنکی لەگەڵ وەزیرەکەی خۆی بەناو ( ئوسمۆ ) کە خاوەنی دوو دەم وچاوە ،



وێنە ١٠ ـ ب ـ

دیمەنێکی شەری نێوان خوداوەندەکان پیشان دەدات



وێنەی ـ ١١ ـ

دیمەنێکی دروست کردنی زەققورە کە لەسەر مۆرێکی لوولەیی نەخش کراوە کە بۆ سەردەمی بەرەبەیانی بنەماڵە سۆمەریەکان دەگەڕێتەوە .

خشتەیەك بە ناو ی دروست کەری مۆر و کەل و پەل و ئامێرە بەکارهاتووەکان لە بواری دروستکردنی مۆر

| ژ | هێما میخییەکەی | خوێندنەوە سۆمەرییەکەی | خوێندنەوە ئەکەدییەکەی | ماناکەی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | | $^{lú}$BUR.GUL | pa / urkullu | دروستکەری مۆر ، هەڵکۆڵەری بەرد ، وەستای دروستکردنی مۆر |
| ٢ | | ZA.DÍM | zadimmu | گەوهەرساز ، هەڵکۆڵەری بەردی گرانبەها ، |
| ٣ | | ZA.DÌM | zadimmu | پەیکەر ساز ،نووشتەکەر ، |
| ٤ | | ALAN-GÙ ALAN-ZÚ | ———— | وەستای دروستکردنی مۆری لولەیی |
| ٥ | ———— | PEŠ.KAD | ———— | وەستای دروستکردنی مۆری لولەیی |
| ٦ | | $^{lú}$KAB-SAR(SAR) | kabšarru | گەوهەر ساز ، ئاسنگەر ، وەستای دروستکردنی کەل وپەل لەئاسن |
| ٧ | | $^{lú}$SAB-TUR | Šamallu | وەستا ، مەشق پێکراو ، شاگرد |
| ٨ | ———— | $^{d}$NIN. ZA.DÍM | ———— | ( نەن زا دیم ) ناوی خوداوەندی بەرپرس لە مۆر |

| ژ | هێما مێخییەکەی | خوێندنەوە سۆمەرییەکەی | خوێندنەوە ئەکەدییەکەی | ماناکەی |
|---|---|---|---|---|
| ٩ | | ZÁKIŠIB | kunukku | مۆری لوولەیی |
| ١٠ | | RA | barāmu | مۆر |
| ١١ | | KIŠIB.GAL | kišibgallu | خاوەنی مۆر |
| ١٢ | | ZÁ | abnu | مۆر |
| ١٣ | — | É- ZAKIŠIB-BA(K) | bit-kunukki | کۆگایەکی مۆرکراو ، خانوویەکی دەرگا مۆرکراو |
| ١٤ | | ZÁIM-KIŠIB | kunukku | تابلۆیەکی مۆرلێدراو ، تابلۆیەکی مۆرکراو |
| ١٥ | | KUD , $KU_5$ | paraşu | بڕین ، جیاکردنەوە |
| ١٦ | | $ŠA_5$( $ŠA_5$) | ĥaşaşu | بڕین |

| ژ | هێما مێخییەکەی | خوێندنەوە سۆمەرییەکەی | خوێندنەوە ئەکەدییەکەی | ماناکەی |
|---|---|---|---|---|
| ١٧ | | È | Škaku | کونکردن |
| ١٨ | | GİR-TUR | uşultu | چەقۆ ، ئامێری هەڵکۆڵین |
| ١٨ | | ŠAB , ŠAB-BA | baqāmu | برین ، پارچەکردن |

## لیستی سەرچاوەکان

* ئەم چاخە لە هەزارەی دەیەمی پێش زاین دەست پێدەکات و لە هەزارەی هەشتەمی پێش زاین کۆتایی دێت

** ئەم چاخە لە دەوروبەری هەزارەی هەشتەمی پێش زاین دەست پێدەکات و لە ٥٦٠٠ پ.ز کۆتایی دێت

(١) الدباغ ، د. تقي : مقدمة في علم الآثار ، ( بغداد : ١٩٨١ ) ، ص٤٨ .

(٢) فارس ، د.شمس الدين ، د.سليمان عيسى الخطاط : تأريخ الفن القديم ، ( بغداد : ١٩٨٠ )، ص٢٣ ـ ٢٤ .

(٣) الهاشمي ، د.تغريد جعفر ، حسن حسين عكلا : الأنسان تجليات الأزمنة تأريخ حضارة بلاد الرافدين والجزيرة السورية ، ( دمشق : ٢٠٠١ ) ، ص ١٣٣ .

(٤) (٤) الدباغ ، د. تقي الدباغ : (( الثورة الزراعية والقرى الأولى )) في حضارة العراق ،ج١ ، ( بغداد : ١٩٨٥ ) ،ص ١١١ ـ ١٤٣ .

(٥) الدباغ : د. تقي ، د.وليد الجادر : عصور قبل التاريخ ، ( بغداد : ١٩٨٣ )، ص ١٣٦ـ١٣٩

(٦) باقر ، طه : مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ، ج١ ، ( بغداد : ١٩٧٣ ) ، ص ٢٠٩.

(٧) الدباغ ، د.وليد الجادر : عصور قبل التاريخ ، ص ١٤٠ ـ١٤١ .

(٨) یونس ، ریا محسن عبدالرزاق :الكتابة على الأختام الأسطوانية غير المنشورة في المتحف العراقي ، رسالة ماجستير ، ( بغداد : ١٩٨٧ ) ، ص١١ .

(٩) الدباغ : عصور قبل التاريخ ،ص ص ١٤٠ ـ ١٥٢ .

(١٠) الدباغ ، د.تقي : ((العراق في عصور ماقبل التاريخ )) في العراق في التاريخ ، ( بغداد : ١٩٨٣ ) ، ص ٥٤ ـ٥٥ .

(١١) يونس : الكتابة على الختام الأسطوانية ، ص ١١ ـ١٢ .

*** ناوی مۆری ڕووتەخت وەك جیاكەرەوەیەك لەگەڵ مۆری لوولەیی بەكاردێت.

(١٢) علي ، فاضل عبدالواحد :من ألواح سومر الى التوراة ( بغداد : ١٩٨٩ ) ص٣٥ .

(١٣) Abu Al- Soof, B.: Tell Es-Sawan. Excavation of the fourth season , ١٩٦٧ Sumer : ١٩٦٨ ) ,vol. XXIV. P.١٤ .

(١٤) الدباغ : الثورة الزراعية والقرى الأولى ، ص ١٢٠ ـ ١٤٣ .

(١٥) Forte, Elizabith Williams : Ancient Near Eastern Seals,١٩٧٦. P.٢.

(١٦) باقر : المقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ، ج١، ص ٢٢١ .

**** لەم جۆرە شیكردنەوەیە و تێڕوانینەدا زیاتر پشت بەلایەنی ئابووری و بەڵگەكانی تایبەت بەم لایەنە بەستراوە ، بەو پێیەی كە مۆری ڕووتەخت و دواتر مۆری لولەییش بە شێوەیەكی سەرەكی لە لایەنی ئابووری بەكارهێنراوە

(٣٣) Ibid : P. ١٣٢ .

(٣٤) Herrmann ,Georgina : Lapis Lazuli ; The Early Phase of Its Trade, ( Iraq : ١٩٦٨ ) ,Vol. XXX, P.٢٨ .

(٣٥) الهاشمي ، رضا جواد : آثار الخليج العربي والجزيرة العربية ، ( بغداد ١٩٨٤: ) ، ص ٤٦ ـ ٦١ .

(٣٦) يونس: الكتابة على الأختام الأسطوانية ،ص١٨.د

(٣٧) سبيزر : حضارة وادي لرافدين نور لايخبو ،ص ٥١ ـ٥٢ .

(٣٨) ناجي ،عادل : " الأختام الأسطوانية " في حضارة العراق ،ج٤ ، ( بغداد : ١٩٨٥ ) ، ص ٢٢٢ .

(٣٩)الهيلالي ،حسين : الأختام الأسطوانية وتكويناته التشكيلية ، مأخوذة من الأنترنت في الموقع :

.WWW.cultureiraq.org/art/١٤.htm

(٤٠) Frankfort, H. : Cylinder Seals , ( Lndon :١٩٣٩ ), P.٥ .

(٤١) Ibid , P. ٥-٦ .

(٤٢) Forte: Ancient Near eastern Seals. P.٢.

(٤٣) يونس : الكتابة على الأختام الأسطوانية ، ص٢٠ .

(٤٤)ناجي : الأختام الأسطوانية ، ص ٢٢٥ ــ٢٢٦ ، وكذلك ينظر : رشيد : تأريخ الفن في العراق القديم ،ج١ ، ص١٤ .

(٤٥) يونس :الكتابة على الأختام الأسطوانية ،ص٢٠ .

(٤٦) باقر : مقدمة ، ص ٢٣٨ .

(٤٧)يونس : الكتابة على الأختام الأسطوانية ، ص٢٠ .

(٤٨) لابات ، رينيه : قاموس العلامات المسمارية ، ترجمة الأب البير بونا وىخرون ، ( بغداد : ٢٠٠٤ ) ، علامة ٣٤٩ ،ص ١٦٠ ـ ١٦١ .

(٤٩) Forte : Ancient Near Eastern Seals , P. ٢.

******* پاشماوەکانی مەملەکەتی ماری ئەمڕۆ بە گردی حەریری ناسراوە کە دەکەوێتە کوردستانی سووریا ، بەدووری ١١کم لە باکوری رۆژئاوای سوریا ، کە بە یەکێك لە شارە گرنگەکانی سەردەمی گزنگی بنەماڵەکان و سەردەمەکانی دواتر دادەنرێت ، هەروەها لە سەردەمی ئەکەدیەکان ماری وەك بەشێك لە ئیمبراتۆریەتی ئەکەدی ( ٢٣٧١ ـ ٢٣١٦ پ.ز) دەرکەوتووە ، وە دوای لەناو چوونی ئەکەدیەکان لەسەر دەستی گووتیەکان ماری جارێکی تر سەربەخۆیی خۆی وەرگرتەوە ، بەلآم لەسەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەم جارێکی تر ماری کەوتەوە ژێر بنەماڵەی دەستەلاتدار لە شاری ئور ( ٢١١٣ ـ ٢٠٠٦ پ.ز ) ، ماری لەم سەردەمەدا لە لایەن حاکمێکی سەر بە بنەماڵەی دەسەلآتدار لە ماری حوکمی دەرکرد کە ئەم حاکمە بە ( شاکاناکو ) ناسرابوو . وە لەسەردەمی ئیسن ـ لارسا ( ٢٠٠٦ ـ ١٧٦٣ پ .ز ) ماری جارێکی تر وەك مەملەکەتێکی بەهێز بەدەرکەوت ، بەلآم دواتر خامورابی ( حامورابی )لە ساڵی(٣٠) فەرمانرەوایی خۆی تواني مەملەکەتی ماری بگرێت بیخێتە ژێر رکێفی خۆی ، ماری لە رووی شارستانیەتەوە بە بەشێك لە ولاتی دوو رووبار دادەنرێت ،کە تیایدا چەندێن پاشماوەی شوێنەواری گرنگی تێدا دۆزراوەتەوە.

(٥٠) البهنسي ، د.عفيف : الآثار السورية مجموعة أبحاث أثرية تأريخية ، ( فينا :١٩٨٥ ) ، ص ٦٠.

(٥١) Frankfort ; H. : Cylender Seals, p.٢

(٥٢) يونس : الكتابة على الأختام الأسطوانية ، ص٣٩ .

(٥٣) كونتنيو ،جورج : الحياة اليومية في بلاد بابل وآشور ، ص١٢٩.

(٥٤) علي ، فاضل عبدالواحد : من ألواح سومر الى التوراة ،ص٨١.

(٥٥) رشيد ، فوزي : الشرائع العراقية القديمة ،( بغداد : ١٩٧٩ ) ، ص١٣٥.

وكذلك بنظرإلى : الذنون نعبدالحكيم : التشريعات البابلية ،(دمشق : ٢٠٠٠) ،ص ٥٧.

(٥٦) Ali ; F. : Blowing the Horen for official Announcement, P. ٦٦-٦٨.

(٥٧)يونس :الكتابة على الأختام الأسطوانية ، ص ٥٢-٥٣

(٥٨)باقر : المقدمة ،ج١، ص٢٨٣.

(٥٩) بارو ، اندري : سومر فنونها وحضارتها ،ص١٢٢ – ١٢٣.

(٦٠) الهاشمي ،رضا جواد : آثار الخليج العربي ، ص١٤٧.

(٦١) مورتكات ،انطون : الفن في العراق القديم ،ترجمة : عيسى سلمان و سليم طه التكريتي ،( بغداد : ١٩٧٥ )،ص٤٠-٥٤.

(٦٢) Frankfort , H. : Cylinder Seals , Pl. XXIII , e.f.b and Pl.XXIV , g.h.

(٦٣) Moorey , P. and Gurney , O. : Ancient Near Eastern Cylinder Seals Acquired by the Ashmolean museum , Oxford : ١٩٦٣-١٩٧٣ , ( Iraq: ١٩٧٨), vol. XL , Pl. VII,٤٢,٤٣,٤٤,٤٥,٤٧,٤٨.

(٦٤) Forte , E. : Ancient Near Eastern Seals , P.٢٠

(٦٥) يونس : الكتابة على الأختام الأسطوانية ، ص٣٦.

(٦٦) بصمجي : كنوز المتحف العراقي ، ص١٨٨ ،رقم ٣٨.

# جەنگی (قەرم) ١٨٥٣-١٨٥٦ز
# هۆکارو دەرئەنجامەکانی

مصطفی محمد کریم

تەوەرەی یەکەم: جەنگی قەرم و کێشەی رۆژهەلاتی:

**جەنگی قەرم و کێشەی رۆژهەلاتی:**

کێشەی رۆژهەلاتی مێژوویەکی قوولی هەیە هەر ئەمەش وایکردووە مێژوونوسان لە کاتی پێناس کردنیدا لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو بخوولێنەوە وە ئەم دۆزەش بە دیار کەوت لە کاتی لاواز بوونی دەولەتی عوسمانی و هاتنە ناوەوەی دەسەلاتی ئەورووپی بۆ ناوچەی رۆژهەلات ، وە کێشەی رۆژهەلات وەك زاراوە بۆ یەکەم جار لە کونگرەی ڤیرۆنا لە تشرینی یەکەمی سالی ١٨٢٢زاینی بە کارهات کە بریتی بوو لە ململانێی ئالۆزودژوار لە نێوان وولاتە زلهێزەکانی جیهان لە رۆژهەلات .

**یەکەم / ناساندنی چەمکی (کێشەی رۆژهەلاتی) :**

هەندێك لە مێژوونووسان پێیان وایە کێشەی رۆژهەلاتی بریتیە لەو ململانێ و ناکۆکیە بەردەوامەی لە نێوان بەشێك لە وولاتانی ئەورووپی بەرامبەر بە دەولەتی عوسمانی لەسەر بنچینەی ئەوەی کە باشووری رۆژهەلاتی ئەورووپا لە ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانیدایە بەشێوەیەکی تر دۆزەکە خۆی دەبینێتەوە لە بونی دەولەتی عوسمانی لە ئەورووپا[١] .

لەلایەکی تر هەندێکی تر لە مێژوونوسان پێناسەی کێشەی ڕۆژهەلاتی دەکەن بەوەی کە بریتیە لە ئەلقەیەکی دیکە لە ناکۆکی و ململانێ لە نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا لە سەردەمە مێژوویە جیاوازەکان وەك هەلمەتەکانی یۆنان و فارس و و شەرەکانی ڕۆمان و عەرەب و شەری خاچ هەلگرەکان[٢] .

یاخود بریتیە لە پێناسە کردن و ناساندنی دەولەتی عوسمانی لەبەرامبەر ڕۆشنایی پەیوەندیەکانی لەگەلٚ میللەتانی ژێر دەسەلاتی دواتر لەبەر ڕۆشنایی پەیوەندیەکانی لەگەلٚ ئەورووپا[٣] کێشەو ململانێ نێو دەولەتی لە نێوان وولاتانی ئەورووپی کۆلۆنیالیزمی لە کۆتایی سەدەی حەڤدە و سەرەتای سەدەی هەژدە لە بەرامبەریشدا لاوازی و قەیرانەکان کە بەرۆکی دەولەتی عوسمانی گرتبوو هاتە کایەوە تا روخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و لە ناوچوونی لە پێناو بەرجەستە کردنی بەرژەوەندیەکان وسەپاندنی دەسەلاتی سیاسی و دەسەلاتی ئابووری دابەش کردنی مولکەکانی دەولەتی عوسمانی لە نێوان خۆیان[٤]، لە دەستپێکی قۆناغی لاوازی دەولەتی عوسمانی و کەلەکەبوونی کێشەکان لەسەر یەکتری دواتر چاوبرینی وولاتانی ئەورووپی لە مولکی دەولەتی عوسمانی و ناوەزەد کردنی بە پیاوە نەخۆشەکە[٥] .

کەواتە دەشێت بلێین کێشەی ڕۆژهەلاتی بریتی بوو لە کێشەی دەسەلاتی عوسمانی لە ناوچەکانی ژێردەستی لە باشوری ڕۆژهەلاتی ئەورووپا ، هەروەها لە لایەکی دیکە کێشەی هەلپەکردنی زلهێزە ئەورووپیەکان بوو بۆ دەست کێشانە ناو کاروبارەکانی ناخۆی دەولەتی عوسمانی بە بیانووی کێشەی ناوچە بن دەستەکان .

**هۆکارەکانی گەشەکردن و زەق بوونەوەی کێشەی رۆژهەلاتی :**

١ – بەرژەوەندیە ئابووریەکان :

گرنگترین فاکتەر بۆ وورووژاندنی هەر کێشە و ململانێیەك لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوویی کە بەرۆکی مرۆڤایەتی گرتبێت زیاتر بەرجەستە دەبێت لە بەرژەوەندە ئابووریەکان ، بێگومان جیاوازی لە بەرژەوەندیەکان هۆکاری سەرەکی سەرهەلدانی کێبەرکێی وململانێکانە ، لە هەمان کاتیشدا بەرژەوەندییە ئابووریەکان هەلگرسێنەری ئاگری گەورەترین جەنگە لە مێژوودا کە مرۆڤایەتی بە خۆی بینیووە تا ئەمرۆ[٦] .

سەبارەت بە کێشەی رۆژهەلات لە سەدەی نۆزدەدا رێچکەیەکی توند و ئالۆزی گرتۆتە خۆی ، وە دۆزەکە لە رووی ئالۆزی بریتی نەبووە لە رۆژهەلاتی بەلکو کێشەکە رۆژئاوایی بووە ، کە زیاتر وولاتانی ئەورووپی لەرووی بەرژەوەندیەکان دژ بە یەك بوونە ئەمەش بۆتە هۆکار کە هەریەکەیان هەولی زیاتر بدات کە زۆرترین جیاوگەی هەبێت لە رووی قەلّمرەوی سیاسی و ئابووری لە ناو دەولەتی عوسمانی ئەمەش لە ئەنجامی جیاوازی و ناکۆکی و چاوتێبرینی وولاتانی ئەورووپی هاتە ئاراوە[٧] .

هەروەها کێشە و ناکۆکی لە نێوان وولاتانی ئەورووپی لەسەر ناوچەکانی قەلەمرەوی دەولەتی عوسمانی زیاتر گەشەی کرد بە تایبەتی لە نێوان ( بەریتانیا و فەرەنسا و رووسیا ) چونکە هەریەك لەم وولآتانەرێك نەدەکەوتن و تەبانەبوون لە سەر پرۆژەی دابەشکردنی مولکی دەولەتی عوسمانی ، وە رۆژهەلاتی ناوەراستیش تاکە مەیدان بوو بۆ ئەم ململانێیە وە بۆ ئەم

مەبەستەش دەولـەتی عوسمـانی تاکـە بەهانـە بـوو بۆیـان کـە بـەبیٚ توانـاو دواکەوتوو ناوزەدیان دەکرد[٨] .

٢ – هۆکاری ئاینی :

رەنگە ئاین هۆکارێکی سەرەکی بێت لەسەر هەلدانی ئەم کێشەیە بـەلاّم گشتگیر نیە چونکە دەولەتی عوسمانی لـە فرەوانخوازیـەکانی خـۆی دەستی گرت بەسەر چـەندین هـەرێم لەوانـە دەسـەلاتداریەتی دەولـەتی مەسیحی وە هەروەها چـەندین هـەرێمی ئیسلامی کـە دەسـەلاتی خۆیـان سـەپاندووە بـە سەریان ، بەلام زۆربەی میرنیـشینە نەسـرانیەکانی ژێـر دەسـەلاتی دەولـەتی عوسمـانی لەسـەر ئـاینی خۆیـان بوونـە و بگـرە زیـاتر پەیوەسـت بوونـە بـە ئاینەکەیان ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئاین نەبۆتە هۆکار بۆ دروست کردنی کێشەکە بەلکو ئاین وەك ئامرازێك بەکارهاتووە، وە رێگا خۆشـکەر بـووە بـۆ دەست تێوەردانی دەرەکی لە کاروباری نێو دەولەتی عوسمـانی بـە تایبـەتی لە روانگەی پشتگیری کردنی وولاتانی ئەوروپی لە داخوازیەکانی مەسیحی ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی لە رزگار بوون و سەربەخۆی تەواو[٩] .

٣ – پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان :

ئەم کێشەیە ئالۆزیەکی زۆری دروست کردبوو لەسەر ئاستی نێو دەولەتی و ناوەندە سیاسـیەکانی ئـەوروپا کـە هۆکـارێکی سـەرەکی کاریگـەر بـوو لـە رەنگدانەوەو بنیات نانی پەیوەندیە نێو دەولەتیەکان کە لەسەر بنچینەی هێز دامەزرابوو ئەمەش وایکرد کە دەولەتی عوسمانی ببێتە بنەمایەکی سەرەکی و کاریگـەر لـە رێکخـستنی سیـستەمی تـەرازووی هێـز لـە پەیوەندیـە نێـو دەولەتیەکان[١٠] .

بەشێوەیەك پرۆسەی داگیرکاری ئەوروپایی لەسەر سیستەمی هاوسەنگی هێزی نێو دەولەتی ئەنجام دەدرا وەدەولەتی عوسمانی مەیدانی سەرەکی دەست تێوەردانی وولاتانی ئەوروپی بوو لە کاروباری ناوخۆیی بە بیانووی جۆراو جۆر وەك پاراستنی ئاسایشی ناوچەکەو دوورخستنەوەی مەترسی لەسەر ئەوروپا و دابین کردنی ئاشتی لە جیهان وە زۆر جاریش تەوەرەی سەرەکی کۆنگرە نێو دەولەتیەکان وەك ( ڤیننا ١٨١٥ز ، ڤیرۆنا ١٨٢٢ز ) کە باس لە دەولەتی عوسمانی دەکرا و بە پیاوە نەخۆشەکە ناوزەدیان کرد [١١] .

دەشێت بووترێت دیاریکردنی پەیوەندیە نێودەولەتیەکان وابەستەیە بە دووفاکتەری زۆر گرنگ کە بەرجەستە دەبێت لە بەرژەوەندی سیاسی لەلایەك و وە پارێزگاری کردن لە بەرژەوەندییە ئابووریەکان لە لایەکی تر بۆیە هەریەکە لە وولاتانی زلهێز بە تێروانین ونیگای خۆی دەیروانیە پەیوەندیکان ، ئەگەر لە رووی سیاسی وەربیگرین گردبونەوەی کۆنگرەی ( ڤیننا ) لە سالی ١٨١٥ز زیاتر پێ داگرتن لەسەر مانەوەی سیستەمی دەسەلاتی رەهای ئیمبراتۆرەکان بوو وە هەموو هەولێکیان لە پێناو سەرکووت کردنی هەر سیستەمێکی تر کە دژ بە سیستەمی دەسەلاتی ئەوکات بووایە بە تایبەتی شۆرشی فەرەنساوینەماکانی شۆرشەکە کە ( میترنیخ )[١٢] بە ئەندازیارو پارێزگار لەو سیستەمە هەژمار دەکرێت .

لەلایەکی تر ئەگەر لە روانگەی ئابووری سەیری پەیوەندیەکان بکەین دووبارە ئالۆزیەك دەکەوێتە پەیوەندیە نێودەولەتیەکان چونکە هەریەك لەم وولاتانە بەرژەوەندی ئابووری راستەوخۆیان هەبووە لە رۆژهەلات وە لە هەولی ئەوەدا بوونە زیاتر پەرە بە بەرژەوەندییە ئابووریەکانیان بدەن ، ئەگەر

بەریتانیا وەك نموونە وەربگرین لە پێناو پارێزگاری کردنی لە مولکەکانی لە هیندستان و هەردەم لە هەوڵی ئەوەدا بووە پارێزگاری لە ڕێگای هاتووچۆی دەریای سپی ناوەڕاست بکات وە بەربەست بخاتە بەردەم هەر هێزێك کە مەترسی دەخاتە سەر بەرژەوەندیەکانی وە هەروەها فەرەنساو ڕووسیاش هەمان بیرکردنەوەیان هەبووە وە بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێ و کێبرکێکان وە دەولەتی عوسمانی تاکە مەیدان بووە بۆ بەدیهێنانی مەبەستە سیاسی و ئابووریەکانیان ، وە جەنگی قەرم زۆر بە ڕوونی پەیوەندیە نێو دەولەتیەکان دیاری دەکات بە تایبەتی یارمەتی دانی دەولەتی عوسمانی لە لایەن فەرەنسا و بەریتانیا دژ بە ڕووسیای تەزاری کە هەریەکەیان لە ڕوانگەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان هەلساون بەم کارە .

**دووەم / قۆناغەکانی کێشەی ڕۆژهەلاتی :**

سەبارەت بە تێگەیشتن و توێژینەوە لە کێشەی ڕۆژهەلات لە پەیوەندی وکاریگەری ڕووداوە مێژوویەکانی ئەم ماوەیە ( ١٨٥٣ز – ١٩٠٨ز ) کارێکی ئاسان نیە هەر ئەمەش وای لە مێژوونوسان و پسپۆڕانی تایبەت بەم دۆزە کردووە ، کە پەنا ببەنە بەر دابەش کاری و قۆناغ بەندی جۆراو جۆر هەر یەکەیان لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیان مامەلە لەگەڵ ئەم دۆزە دەکەن .

لێرەدا چەند نموونەیەك لە ڕوانگەو دابەش کاری و قۆناغ بەندی هەندێك لە مێژوونوسان دەخەینە ڕوو لەوانە تکریتی وای بۆ دەچێ کە کێشەی ڕۆژهەلاتی بۆ سێ قۆناغ دابەش دەبێت :

أ – قۆناغی یەکەم / لە پەیمانامەی کوچك کینارچی[١٣] لە سالی ١٧٧٤ تاکو کۆتایی جەنگی قەرم لە سالی ١٨٥٦ لە گرنگترین سیماکانی ئەم قۆناغە

دەرکەوتنی رۆلی رووسیا لە کێشەی رۆژهەلاتی ، زۆربەی جەنگەکانی نێوان رووسیاو دەولەتی عوسمانی لەم قۆناغەدا لە پێناو زالّ بوون بەسەر کەنارەکانی دەریای رەش و ناوچەکانی قەفقاز و بەلقان هەروەها رووبەروبوونەوەی بەریتانیا و فەرەنسا لەبەرامبەر هەولەکانی رووسیا لە سیماکانی تری ئەم قۆناغەن بە تایبەتی دوای گرێدانی پەیماننامەی کوچك کینارچی ١٧٧٤ز ئونکیارسکلەسی ١٨٣٣ ز لە نێوان رووسیاو عوسمانی کە تیایدا رووسیا زۆرترین دەسکەوتی هەبوو ، وە جەنگی قەرم ١٨٥٣ز — ١٨٥٦ز نموونەیەکی ئاشکرای رکابەرایەتی نێوان رووسیا لە لایەك و دەولەتی عوسمانی لە لایەکی تر بە پالپشتی بەریتانیاوفەرەنسا[١٤] .

ب — قۆناغی دووەم / ئەم قۆناغە لە کۆتایی جەنگی قەرم دەست پێدەکات تاکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم گرنگترین سیماکانی ئەم قۆناغە بەریتانیا و فەرەنسا رۆلی کاریگەرو گرنگی تەواو دەدەن بە کێشەی رۆژهەلاتی هەروەها لەم قۆناغە رووسیا رۆلی لاواز دەبێت لە کێشەی رۆژهەلاتی بە هۆی تێکشکانی لە جەنگی قەرم ، هەروەها گۆرانکاری لە سیاسەتی بەریتانیاو فەرەنسا لەم قۆناغە لە پالپشتی کردن لە دەولەتی عوسمانی بۆ داگیرکردنی چەندین ناوچە لە دەولەتی عوسمانی وەك قبرس و میسر و بۆسنە و هرسك و تونس .

ج — قۆناغی سێیەم / ئەم قۆناغە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم دەست پێدەکات تاکورووخانی دەولەتی عوسمانی لە سالی ١٩٢٢ یەکێك لە سیما گرنگەکانی ئەم قۆناغە بریتیە لە کەم بوونەوەی رۆل و کاریگەی کێشەی رۆژهەلاتی لە پەیوەندیە نێو دەولەتیەکان و هەروەها گۆران و ئاراستەی

کۆلۆنیالی ئەوروپی بەرەو ئەفریقیاو ئەمریکای لاتینی وە سەرهەلدانی ئەلمانیا و نزیک بوونەوەی لە دەولەتی عوسمانی ، وە هەروەها سەرهەلدانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی لە نێو گەلانی ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی کە بووە فاکتەرێکی کاریگەر لە سیاسەتی دەولەتانی زلهێز لەبەرامبەر دەولەتی عوسمانی[١٥] .

وە لە لایەکی تر بۆچونی جیاواز بەدی دەکرێت سەبارەت بە کێشەی رۆژهەلاتی و قۆناغەکانی کە تەنها دابەشی دەکەنە سەر دوو قۆناغ سەدەی پانزەو و سەدەی شانزە کە قۆناغی بە هێزی دەولەتی عوسمانیە لە رووی دەسەلات و هێزدا ، بەلام قۆناغی دووەم بریتیە لە ماوەی کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەوسەدەی هەژدە کە دەستپێکی لاوازی دەولەتی عوسمانیە[١٦] .

هەروەها رای تر کە زیاتر جەخت لەسەر رووداوەکانی سەدەی نۆزدە دەکات کە تێدا دابەشکاری وقۆناغ بەندی کێشەی رۆژهەلاتی دەکەن بەم شێوەیە :

- قۆناغی یەکەم / بریتیە لە سالی ١٨٢١ – ١٨٢٩ کە سەربەخۆی یۆنانە .
- قۆناغی دووەم / سالی ١٨٣١ – ١٨٣٣ سەرهەلدانی محمد علی .
- قۆناغی سێیەم / ١٨٣٩ – ١٨٤٠ سەردەمی محمد علی .
- قۆناغی چوارەم / ١٨٥٣ – ١٨٥٦ جەنگی قەرم و کۆنگرەی پاریس .
- قۆناغی پێنجەم / گەشەکردنی ولاتانی بەلقان و پەیماننامەی بەرلین و سەربەخۆی صربیا .

- قۆنـاغی شەشــەم / بێـداری ئـازادیخوازان و زوڵم و ســتەمی ســوڵتان و بزووتنەوەی راپەرین[17] .

**لێرەدا کێشەی رۆژهەلاتی دەگەرێتەوە بۆ سێ فاکتەر :**

١ – لاوازی دەولەتی عوسمانی و بوونی مولکێکی زۆر لەهەر سێ قارەکە .

٢ – چاوبرینی وولاتانی ئەوروپی بە تایبەتی ( رووسیا و نەمسا ) لـە مـولکی دەولەتی عوسمانی .

٣ – وەستانی وولاتانی ئەوروپی وەك ( بـەریتانیا و فەرەنسا ) لـە پالپـشتی کردن لە دەولەتی عوسمانی نەك وەك هاودۆستی و خەم خۆریان بۆ عوسمانی بەلکو زیاتر دانانی بەربەست لەبەر دەم پێشرەوی و کێبرکێی هەر وولاتێکـی تر کە زیان بە بەرژەوەندیان دەگەیەنێ[18] .

**سێیەم / لاوازی دەوڵەتی عوسمانی و دەستپێکی کێشەی رۆژهەلاتی:**

لەئاکامی لاوازبوونی دەولەتی عوسمانی ، سەرەتاکانی کێشەی رۆژهەلاتی بـە دیارکـەوت وە ئــەم لاوازیــەش چــەند هۆکـارێکی نـاوخۆیی و دەرەکـی کاریگەریان هەبووە لەسەری هەرچەندە دەولەتی عوسمـانی تـاکو سـەرەتای سەدەی شانزە بە هێزترین جەمسەر بووە کە فـەرمانرەوایی بەشـێکی زۆری جیهـانی کـردووە بـەلام لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی شـانزەهەم دەولـەتی عوسمانی پێی نایە قۆناغی لاوازی و داشکان ، بۆ ئەم مەبەسـتەش چـەندەها هۆکاری ناوخۆیی و دەرکی کاریگەریان هـەبووە لەسـەر لاوازی دواتـر خزینـی زلهێزە ئەورووپاییەکان بۆ ناوچەکانی .

أ / هۆكارە ناوخۆییەكان :

١ – سیستەمی دەسەلاتداریەتی و بەڕێوەبردن :

یەكێك لە گرنگترین هۆكارەكانی لاوازی دەولەتی عوسمانی بە تایبەتی لە كۆتاییەكانی سەردەمی سولتان سلێمان قانونی ( ١٤٩٥ز – ١٥٦٦ز ) لە رووی پایەی سیاسی و ئابووری و كۆمەلایەتی و رۆشنبیری پێكهاتەی كۆمەلگەی دەولەتی عوسمانی زیاتر بریتی بوو لە سیستەمی دەرەبەگایەتی ئەمەش رەنگدانەوەی گشتی لەسەر سیستەم و فەرمانرەوایی لە پێگەی دەولەتی عوسمانی هەبووە[١٩] .

بەشێوەیەكی تر لە دەولەتی عوسمانی سولتان لەبەرزترین لووتكەی دەسەلات بووە ئەمەش وایكردووە كە زیاتر دەسەلاتێكی رەهاو مۆركێكی سەربازی پێوە دیاربێت[٢٠] .

ئەمەش لە ئەنجامی بوونی رژێمی دەرەبەگایەتی پشتاوپشت لە سیستەمی دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی دواتر چینێكی تر لە پال سولتان پەیوەست بوونە بە دەسەلات و فەرمانی سولتان كە رۆلیان بینیوە لە بەڕێوەبردنی وولات كە ئەمانەش بریتی بوونە لە چینێكی سەربازی ناسراو بە خاوەن شمشێرەكان پێكهاتبوون لە وەزیرو والی و سەركردەی سوپاكان ، جگە لەمانەش كەسانی تر كە لە بەڕێوەبردنی دەولەت بەشداربوونە لەوانە دەستەی نووسەران و ژمێریاران و پیاوانی ئاینی و زانایان و دادوەران لەسەرڕووی هەموویان شێخ الاسلام[٢١] .

بەم شێوەیە دەولەتی عوسمانی لە هەموو بوارەكاندا لە رووی بەڕێوەبردن لەسەر سیستەمێكی تەقلیدی و كۆن بەڕێوە دەبرا كە

بەشێوەیەکی بۆماوەیی بۆیان مابۆوە بۆیە نەیان دەتوانی سیستەمێکی نوێ یاخود چاکسازیەکی باش بکەن لە سیستەمە کلاسیکیەکە بۆ ئەوەی هەموو نەتەوە کانی ژێر دەسەلاتیان لە چوار چێوەی یاسا و دەستورێکی گشگیر یەك بخەن ، بەم جۆرە سیستەمی دەسەلاتداریەتی لە دەولەتی عوسمانی بە بەرگێکی دواکەوتوویی دەرەبەگایەتی سەربازی داپۆشرابوو ئەمەش وایکردبوو گرفت و کێشەکان هەروەك خۆی بەبێ چارە بمێنێتەوە .

٢- دەسەڵات و پیاوانی ئایینی :

هەرچەندە سیستەمی دەسەلاتداریەتی لە دەولەتی عوسمانی شێوەی کلاسیکی وەرگرتبوو بەلام لە هەمان کاتدا شپرزەیی لە بواری کۆمەلایەتی و ئابووری و زانستی لەمپەرێکی تر بوون لەبەر دەم دواکەوتن و گەشەنەکردنی دەولەتی عوسمانی ، وە زیاتر لە بواری زانستی و هزریدا کە بووە هۆی قول بوونەوەی گرفتە ناوخۆییەکان چونکە رەوتی زانست شێوەی لاسایکەرەوەی وەرگرتبوو تەنها بریتی بوو لە زانستە ئایینیەکان[٢٢] .

دەسەڵاتداران و پیاوانی ئاینی لە دەوڵەتی عوسمانی تاکە هۆکار بوون بۆ مانەوەی ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە و دژی هەر گۆرانکاریەك بوون لە وولات یاخود لاسایی کردنەوەی گۆرانکاریەکانی رۆژئاوا بە توندی رووبەرووی دەبوونەوە ، یان هەر شتێك لەبارەی نوێگەری و زانست و بەرهەمی چاپکراو دوور لە زانستە ئایینیەکان بە کوفر لە قەڵەمیان دەدا ئەمەش بووە هۆکار بۆ ئەوەی رەوتی زانست و پێشکەوتن لە ناو دەوڵەتی عوسمانی تووشی وەستان بێت ، لەلایەکی تر ئەم هەڵوێستەی دەسەڵات و پیاوانی ئاینی وایکرد کە

گۆرانکاری لە پێکهاتەو بونیادی کۆمەلایەتی روونەدات و زۆر بە سیستی هەنگاو بنێت[٢٣] .

٣ – هەمە جۆری ئاینی و نەتەوەیی قەلمرەوی دەولەتی عوسمانی :

هەروەها فرە ئاینی و نەتەوەی جیاواز لە ناودەولەتی عوسمانی ئەمەش وایکردبوو کە هاوسەنگی و تەبایی لە نێوان ئاین و نەتەوەکان کارێکی ئەستەم بێت و بە دیهێنانی تەبایی و یەکریزی لە نێوانیان هەولێکی زۆری پێویست بوو[٢٤] .

بۆ ئەم مەبەستەش دەولەتی عوسمانی هەلسا بە پەیرەوکردنی سیاسەتێك لەسەر بنەمای لێبووردەیی لەبەرامبەر نەتەوەکانی ژێر دەسەلاتی کە بواری چالاکی ئاینی دا بە هەر نەتەوەیەك بەبێ فشار خستنە سەریان لە ئەنجامدانی چالاکیە ئاینیەکانیان[٢٥] .

لە لایەکی تر پەیرەوکردنی ئەم جۆرە سیاسەتە لە لایەن دەولەتی عوسمانی کاردانەوەیەکی خراپی لەسەر دەولەت دروست کرد چونکە بووە هۆکارێك و رێگا خۆشکەر لەبەردەم سەربەخۆی ئەم نەتەوانە و پارێزگاری کردن لە مۆرکی نەتەوایەتی خۆیان و دواتریش دەرکەوتنی هەستی جوداخوازی لە دەولەتی عوسمانی[٢٦] .

هەروەها کاردانەوەیەکی خراپی هەبوو بۆ دەست تێوەردانی دەرەکی لە کاروباری ناوخۆی دەولەتی عوسمانی بە بیانووی کێشە نەتەوەییەکان یان کێشەی (أهل الذمة) واتە غەیرە موسلمانەکان[٢٧] ، لێرەدا بیانووی جۆراو جۆر بۆ دەست خستنە ناو کاروباری دەولەتی عوسمانی لە لایەن رووسیای قەیسەری و فەرەنسا بەر لە هەلگیرسانی جەنگی قەرم نمونەی دیارو

ئاشكران بۆ دەست تێوەردانی دەرەكی ئەویش لە ڕێگای كێشەی شوێنە پیرۆزەكان لە فەلەستین كە هەردوو وڵات بە مەبەستی پارێزگاری لە رەعییەی خۆیان هەولیان دەدا جێ پێی زیاتر لە ناو دەولەتی عوسمانی بەدەست بێنن .

٤ – داتەپینی ئابووری و زۆری خەرجیەكان :

سەرەرای ئەم هۆكارانەی باسمان كرد چەندین هۆكاری تر هەبوونە بۆ لاوازی دەولەتی عوسمانی و دەست خستنە ناو كاروبارەكانی لە لایەن وولاتانی ئەورووپی ، لەوانە زۆری خەرجییەكانی دەولەت لە پێناو خۆشگوزەرانی سولتانەكانی عوسمانی ، هەروەها دابین كردنی خەرجییەكی زۆر بۆ مەبەستی تۆكمەكردنی سوپاو بە هێزكردنی ئەمەش زیاتر باری سەرشانی گەنجینەی قورستر كردبوو[٢٨] .

لە لایەكی تر ئەنجامدانی شەر لەگەڵ نەیارانی دەولەتی عوسمانی كە ماوەیەكی زۆری خایاند كە كاردانەوەی هەبوولەسەر كەم بوونەوەی دەستی كار لە ناو دەولەتی عوسمانی ئەمەش بووە هۆكارێك كە لایەنی كشتوكاڵ و بازرگانی و پیشەسازی روو لە كەم بوون بكات و بارەكە زیاتر قورستر بكات لەسەر دەولەت جگە لەمەش خراپی بارودۆخی رێگاكانی بازرگانی و سەپاندنی باج بەسەر خەلك ئەمانەش گرفتی ئابووریان دروست كردبوو[٢٩] .

بەم جۆرەش هۆكارە ناوخۆییەكان رۆلی بەرچاویان هەبووە لە لاوازی دەولەتی عوسمانی و ریگا خۆشكەربوونە بۆ چاوبرین و دەست خستنە ناوكاروبارەكانی لە لایەن وولاتانی زلهێزی ئەورووپی وە دواتریش بە شێوەی پراكتیكی ئەم هەلەیان بۆ دەچێتە سەر .

ب / هۆکارە دەرەکیەکان :

لەگەڵ هۆکارە ناوخۆیەکان هۆکاری دەرەکیش رۆلی بەرچاویان بینیوە لە لاوازی و داروخانی دەولەتی عوسمانی لە هەمان کاتدا رێگا خۆشکەربوونە بۆ خزین و دەست تێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەولەتی عوسمانی لە لایەن وولاتە زلهێزە ئەورووپیەکان ، لەگەڵ لاوازی دەولەتی عوسمانی دەستپێکی دەست تێوەردانی ئەورووپیەکان بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی دەستی پێکرد ، ئەمەش لە ئەنجامی پەیوەندیەکی دووردرێژ و قوڵی مێژوویی لە رووی بازرگانیەوە بە تایبەتی لە کەنارەکانی دەریای سپی ناوەراست .

لە گەڵ ئەو گۆرانکاریەی کە لە سیستەمی پێکهاتەی کۆمەلگای ئەورووپی هاتە ئاراوە لە سیستەمی دەرەبەگایەتی بۆ سیستەمی سەرمایەداری و سەرهەلدانی شۆرشی پیشەسازی دواتر گەشەسەندنی هۆکارەکانی بەرهەم هێنان و کارگەکان و پیشەسازی و بازرگانی لە چوارچێوەیەکی فرەوانتر سەری هەلدا[٢٠] .

هاوکات گۆرینی رێرەوی بازرگانی لە دوای دۆزینەوەی جولانەوەی جوگرافی و رووکردنە رێرەوە ئاویەکانی باشوری ئۆقیانووسی ئەتلەسی بۆ گەیشتن بە ناوچەکانی هیند و رۆژهەلات ئەمەش لە بایەخ و گرنگی ستراتیژی ئابووری هەرێم و رێگاکانی ناوچەکانی دەولەتی عوسمانی کەم کردەوە کە پێشتر تاکە رێگاو رێرەوی هاتووچۆی بازرگانی بوو لە نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا ، هەروەها پەیرەوکردنی جۆرە سیاسەتێك لە نێوان وولاتانی ئەورووپی بە تایبەتی بەریتانیا و فەرەنسا کە وایکرد دەولەتی عوسمانی ببێتە پاشکۆی جێبەجێ کاری مەرامە سیاسیەکانیان کە دەولەتی عوسمانی بە پالپشت و

دلسۆزی خۆی دایدەنان بەلام لە ناوەڕۆك دا زیاتر مەبەستی ئەم وولاتانە بریتی بوو لە بەکارهێنانی دەولەتی عوسمانی وەك ئامرازێك بەرامبەر بە هەول و کۆششەکانی رووسیای قەیسەری بە مەبەستی دەست نەگەیشتنی بە باشووری ئاوە گەرمەکان[٣١] .

لە لایەکی تر دەرکەوتنی چەند دەولەتێکی زلهێزی نوێی هاوسێی دەولەتی عوسمانی کە بریتی بوون لە رووسیای تەزاری بە تایبەتی لەسەردەمی پەترۆسی گەورە[٣٢] ، هەروەها بوژانەوەو بەهێز بوونی ئیمپراتۆریەتی نەمسا ومەجەر لە سەدەی حەڤدە و سەدەی هەژدە کە بنەمالەی هابسبۆرگ فەرمانرەوایان دەکرد لە ئەنجامی پێشکەوتنی ئەم دەولەتانە و رووبەروبونەوەیان لەگەڵ دەولەتی عوسمانی کە لە زۆربەی شەرەکاندا سوپای عوسمانی بەرامبەریان تێك دەشکا لە ئەنجامدا دەولەتی عوسمانی ناچار بوو چەند پەیماننامەیەك لەگەڵ ئەو ولاتانە ببەستێت کە لە پێشدا وێنەی نەبووە وەك پەیماننامەی ستیفاتورك لە سالی ١٦٠٦ ز لە نێوان نەمساو دەولەتی عوسمانی[٣٣] .

هەروها سەرنەکەوتنی عوسمانیەکان لە گرتنی ڤیننا لە سالی ١٦٨٣ ز ، دواتر کشانەوەی و رازی بوون بە پەیماننامەی کارلوفتز لە سالی ١٦٩٩ ز کە تیایدا دەولەتی عوسمانی وازی هێنا لە چەند ناوچەیەك بۆ نەمسا وەك کرواتیا ، سلۆڤینیا ، ترانسلڤانیا ، مەجەر[٣٤] .

بە هەمان شێوە فشاری هێزەکانی رووسیا لە بەرامبەر تێکشکان و لاوازی دەولەتی عوسمانی رێگای والآ کرد بۆ رووسەکان کە دەسەلاتی سیاسی و ئابووری لە ناو دەولەتی عوسمانی بچەسپێنن ئەمەش لە دوای

شکستە یەك لە دوای یەکەکانی دەولەتی عوسمانی بەرامبەر رووسیای تەزاری و بەستنی پەیمانامەی شەرمەزرای وەك پەیماننامەی بەلگراد سالی ١٧٣٩ ز ، وە سەپاندنی پەیمانانمەی کوچك کینارچی لە سالی ١٧٧٤ ز[٣٥] .

لە لایەکی تر ململانێی دوورو درێژی نێوان دەولەتی عوسمانی سووننە مەزهب و دەولەتی سەفەوی شیعە مەزهەب لە رۆژهەلات بە تایبەتی لە ناوچەکانی عێراق لە سەدەی شانزە تاکو حەڤدە وە دواتریش درێژەی هەبووە قەلەمرەوی ئەورووپیەکان بۆ ناوچەکانی رۆژهەلات لە هەر قوناغێکدا شێوازی جۆراوجۆریان دەگرتەبەر لە سەرەتادا لە رێگای کاری موژدەدەری و بازرگانی دەستیان پێکرد ، وە کاری مووژدەدەری لە لایەن پیاوانی ئاینی نەسرانی ئەنجام دەدرا ئەم هەولانەش هەر لە چاخەکانی ناوەراست سەرچاوەی گرتبوو وە کاری مووژدەدەرەکان لە روالەتدا بریتی بوو لە بلاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی بەلام لە ناوەرۆکدا زیاتر گرنگیان بە فەراهەم کردنی مەرامە سیاسیەکان و ئابووریەکانی وولاتە ئەورووپیەکان ئەدا بۆ ئەم مەبەستەش لە بەرگێکی ئاینی رووپۆش کراوە[٣٦] .

دواتر کۆلینیالە ئەورووپیەکان هەستان بە پەیرەوکردنی سیاسەتی بەدەست هێنانی جیاوگە کە ئەمەش تاکە میکانیزم بوو بۆ مسۆگەر کردن و پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان کە دواتر توانیان بەم هۆیەوە داگیرکردنی رۆژهەلاتی ئیسلامی لە رووی سیاسی بە شێوازێکی دبلۆماسی بەرجەستە بکەن ، لەم لایەنەش بازرگانە ئیتالیەکان یەکەم کەس بوونە کە جیاوگەی ئابووریان پێدرا بە تایبەتی لە شاری بوندوقیە بەلام لە شێوەی رێکەوتندا

نەبووە وە دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی شانزە تەنها پەیوەندی ئابووری و بازرگانی لەگەڵ بازرگانە ئیتالی و فەرەنسایی بنیات نابوو[٣٧] .

یەکەم دەوڵەتیش کە جیاوگی پێ درا فەرەنسا بوو لەلایەن سولتان سلیمانی قانونی لە سالی ١٥٣٥ ز بریاری لەسەردرا ئەم جیاوگانە لە سەرەتاوە بازرگانی بوون دواترگۆڕان بۆ بوارەکانی تریش وەك (سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی وئاینی و شارستانی )[٣٨] .

پێدانی جیاوگ لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی بە فە رەنسا بووە هۆکاریك کە ولاتانی تری ئە وروپا هەوڵ بدەن بۆ بە دەست هینانی جیاوگە لەناو دەوڵەتی عوسمانی بەم شێوە یە بە ریتانیا یەکێك بووە لەم ولاتانە کە هەوڵی داوە بە لام لە سەرەتادا نزیك بونەوەی بەریتانیا لە دەوڵەتی عوسمانی لەسەرئاستی تاك بووە و یەکەم کەسیش کە گەیشتۆتە لای سولتانی عوسمانی ئەنتۆنی جکسون بووە لە سالی ١٥٥٣ ز [٣٩] .

ئەوەی کە زیاتر بەریتانیای خزاندە ناو دەوڵەتی عوسمانی و دەریای سپی ناوەراست ئەوە بوو لە سالی ١٦٩٢ز بەریتانیا و هۆلەندیەکان لە شەری لاهوج دا بەسەر کەشتیگەلی فەرەنسا دا سەرکەوتن وە لەسالی ١٧٠٤ز توانی دەست بگرێت بەسەر گەرووی جبل تاریق وە لە سالی ١٧٠٨ ز توانی دەست بگرێت بەسەر بەندری ماهوف لە دورگەی منورقە[٤٠] .

هەروەها نزیك بوونەوەی بەریتانیا لە دەوڵەتی عوسمانی لە دوای پەلاماردانی ناپلیۆن بۆ سەر میسر لە سالی ١٧٩٨ز وەك هاودۆست خۆی دەرخست بۆ دەوڵەتی عوسمانی لە دوای پەلامارەکەش لە سالی ١٨١٨ز رێکەوتنێکی تری بەست کە لە بەندی یەکەمی دا هاتووە ((هەموو ئەو ماف و

جیاوگەو لێبوردنانەی کە دراوە بە خەلك و کەشتی بەریتانی لە جیاوگەو پەیمانەکانی پێشوو وەك خۆی دەمێنێتەوە )) ، بەم شێوەیەش بەریتانیا دەسەلاتی ئابووری و سیاسی خۆی خزاندە ناو دەولەتی عوسمانی بووە جەمسەرێکی سەرەکی ململانێی نێو دەولەتی لەسەر دەولەتی عوسمانی[٤١] .

هەروەها رووسیاش لە ئەنجامی هەولە فرەوانخوازیەکانی و گەیشتن بە ئاوە گەرمەکان لە سەردەمی پەترۆسی گەورە رووەو رۆژهەلاتی ئەورووپا و ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی عوسمانی خزایە ناو ململانێی نێو دەولەتی ، بۆ ئەم مەبەستەش رووسیای قەیسەری دەستی کرد بە پەیوەندی کردن بە رەگەزی سلاڤی هەرێمی بەلقان و سەرجەم سلاڤیەکانی ناو دەولەتی عوسمانی هەروەها پەیوەندی کردن بە بزوتنەوەکانی راپەرین لەسەرجەم هەرێمەکانی دەولەتی عوسمانی لە بەلقان و هەرێمە عەرەبیەکان لە دەرئەنجامی ئەمانەش رووسیاش بە پێی هەندێ رێکەوتن لە سالی ١٨٠٨ز توانی هەندێ ماف و جیاوگە لە دەولەتی عوسمانی بەدەست بهێنێ[٤٢] .

بە شێوەیەکی گشتی هەردوو فاکتەری ناوخۆیی و دەرەکی کاردانەوەی هەبووە بۆ خزینی ئەوروپیەکان بۆ ناوجەرگەی دەولەتی عوسمانی ، گەیشتە رادەیەك لە کۆتایەکانی تەمەنی دەولەتی عوسمانی کونسولە ئەوروپاییەکان رۆلی سەرەکیان دەبینی لە نەخشە کێشان و پلاندانان دواتریش دانان و لابردنی سولتانەکان کە ئەوان بە باشیان دەزانی بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان[٤٣] .

دیارترین نموونەش بۆ ئەم مەبەستە راوێژکردنی سولتان عبدالمجیدی یەکەم بە بالوێزی بەریتانیا لە ئەستانە بەرامبەر ئەو پرۆژەیەی کە لە لایەن

مینشکوف دەربارەی شوێنە پیرۆزەکان لە فەلەستین و ماف و جیاوگەکان کە درابوو بە سوڵتان ، دەبینین نەخشە کێش و پلان دارێژەری سولتان بریتی بوو لە بالوێزی بەریتانیا ئەمەش ئەوە دەردەخات کە دەولەتی عوسمانی سەرەتای کۆتایی هاتنی بووە چونکە ئەوروپیەکان بە شێوەیەکی تۆکمە خۆیان لە ناو جەرگەی دەولەتی عوسمانی چەسپاندبوو .

## تەوەرەی دووەم

جەنگی قەرم ١٨٥٣ ز – ١٨٥٦ ز

(هۆکارەکان – ڕووداوەکان – پەرەسەندنەکان)

***هۆکارەکانی جەنگی قەرم :***

لە راستیدا دیاری کردنی هۆکارەکانی جەنگی قەرم بە شێوەیەکی گشتی ئاسان نیە وە هەروەها جیاکردنەوەی لە کێشەی رۆژهەلات لەگەڵ بوونی دەولەتی عوسمانی وەك هێزێکی سیاسی و سەربازی لە باشوری رۆژهەلاتی ئەوروپا ، وە بوونی ململانێ و رووبەڕووبونەوە بەرامبەر بە دەولەتی عوسمانی لەو ناوچەیە لەلایەن وولاتە زلهێزە دراوسێکانی وەك ئیمبراتۆریەتی رووسیای قەیسەری و ئیمبراتۆریەتی نەمسا لە ماوەیەکی دووردرێژدا هەروەها ئەم جەنگە بچووککراوەی جەنگی جیهانی یەکەمە چونکە هەمان شێوەو کردار کە لە جەنگی جیهانی یەکەم روویدا لەم جەنگەش روویدا وەك ململانێ لە سەر هاوسەنگی تەرازووی هێزو دامەزراندنی هاوپەیمانیەت لە نێوان وولاتان بۆ پاراستنی بەرژەوەندە

ئابووریەکان ، وە چڕبوونەوەی بە شێوەی دژ بەیەك ئاکامەکەی سەرهەلدانی شەڕێك کە لە مێژوودا ناسراوە بە جەنگی ( قەرم ) .

## أ / هۆکارە ناراستەوخۆکانی جەنگی قەرم :

### ١ – چاوتێبڕینی روسیای قەیسەری لە دەوڵەتی عوسمانی :

هەر لەسەرەتای وەرگرتنی دەسەلات لەلایەن نیقولای یەکەم لەسالی ١٨٢٥ز وەك ئیمپراتۆری رووسیای قەیسەری دواتر دوای نەمانی کلامنس میترنیخ و سیستەمەکەی وە نەمانی هاوپەیمانی پیرۆز ، نیقولای یەکەم وا خۆی ئەژمار دەکردکە بەرپرسی یەکەمە لە پارێزگاری کردن لە سیستەمی پاشایەتی لە ئەوروپا بەلام هەرچی لە رۆژهەلاتە پەیرەوی جۆرە سیاسەتێکی دەکرد کە بریتی بوو لە دروست کردنی ئاژاوەو دەست خستنە ناوکاروباری دەولەتی عوسمانی وەك هەنگاوێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی کە زیاتر گەیشتن بە ئاوە گەرمەکان بوو[٤٤] .

هەوڵدانی رووسیای قەیسەری بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەرێمەکانی ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی لە کاتێك دا کە لاوازی بەرۆکی دەولەتی عوسمانی گرتبوو ، ئەویش بە پێشکەش کردنی پرۆژەیەك بە مەبەستی دابەش کردنی ممتلکاتی دەولەتی عوسمانی بۆ وولاتە ئەوروپیەکان بە تایبەتی بەریتانیا ، جگە لەمەش ئاین وەك هوکارێك بەکارهێندرا دژ بە دەولەتی عوسمانی چونکە رووسەکان خۆیان بە پارێزگاری مەزهەبی ئەرسۆدۆکسی دادەنا هەروەها میراتگری دەولەتی بێزنتی کە عوسمانیەکان تونیان لە سالی ١٤٥٣ کۆتایان پێ بێنن[٤٥] .

لەم بارەوە رووسیا زیاتر لە هەموو وولاتانی ئەورووپی بە گرنگی دان و چاوتێبرین لە ناوچەی بەلقان دەناسرێت ، ئەمەش زیاتر لە دوای جەنگی ناپلیۆنی هەستی پێ دەکرێت ، لە کاتێك دا کە رووسیا رێژەی ناردنە دەرەوەی گەنم لە بەندەری ئۆدیسا کە بەناوبانگترین بەندەر بووە بۆ ئەم مەبەستە لە بەرامبەریدا هەردوو هەرێم وولاشیاومۆلدافیا کە لە ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی بوون لە ناوچەی بەلقان بە هەمان شێوە لە کێبرکێ دابوون بەرامبەر بەرووسیا ، بۆیە قەیسەری رووسیا نیقولای یەکەم لە هەوڵی ئەوەدا بوو دەست بگرێت بەسەر ئەم دوو هەرێمە بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنی بەرهەمەکان کە سوود بە بەرژەوەندیەکانی رووسیا دەگەیەنێ[٤٦] .

هەر لەم رووەوە ئیمپراتۆریەتی رووسی وای دەبینی کە بلاوکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی لە نێو گەلانی هاوسێی رووسیا تاکە رێگایە بۆ فرەوانخوازیەکانی ئەویش لە رێگای وورووژاندنی پارێزگاری لە گەلانی سلافی و هەروەها پارێزگاری کردن لە ئەرسۆدۆکسیەکانی ناودەولەتی عوسمانی ئەمانەش هەمووی بۆ وەدەست هێنانی مەبەستەکانی رووسیا ، وە دوای ئەمانەش پێشنیاری دابەش کردنی دەولەتی عوسمانی کردە بەرنامەی کارەکانی[٤٧] .

سەبارەت بە دابەش کردنی دەولەتی عوسمانی لە سالی ١٨٥٣ز وەك پێشنیارێك لەلایەن رووسیا بە شێوەییەکی فەرمی پێشکەش بە بالوێزی بەریتانیا لە رووسیا کرا کە ناوەرۆکەکەی بریتی بوو لە وەرگرتنی تەنگەبەری بسفۆرو داگیرکردنی ئەستانە لە لایەن رووسیای قەیسەری بە شێوەی کاتی وە هەروەها هەرێمەکانی دەولەتی عوسمانی لە ئەورووپا لە چوارچێوەی

دەولەتێکی سەربەخۆ بێت لە بەرامبەریدا ئەگەر بەریتانیا رازی بێت ئەوا میسرو رودس و قبرس وەردەگرێت[48]

ئاشکرایە بەریتانیا ئەم پرۆژەیە رەت دەکاتەوە چونکە ناگونجێ لەگەڵ سیاسەتەکەی ئەوکاتی کە بریتی بوو لە پارێزگاری کردن لە دەولەتی عوسمانی بە مەبەستی رێگا گرتن لە فرەوانخوازیەکانی رووسیا لەگەڵ ئەوەش پارێزگاری کردن لە هاوسەنگی هێز لە ئەوروپا بەگشتی و ناوچەکە بە تایبەتی ، لەبەرامبەر رەت کردنەوەی پرۆژەکە لەلایەن بەریتانیا بووە هۆکارێك کە رووسیای قەیسەری بیرلەوە بکاتەوە کە پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ دەولەتی عوسمانی بکات ئەویش لەرێگای استغلال کردنی کێشەی شوێنە پیرۆزەکان لە فەلەستین[49] .

٢ – هۆکاری ئاینی :

هەروەها ئەوەی پەیوەندی راستەوخۆی بە ململانێی نێوان دەولەتی عوسمانی و رووسیای قەیسەری هەیە بریتی بوو لەسەر هەلدانی کێشەی شوێنە پیرۆزەکان لە فەلەستین کە بنچینەی ئەم کێشەیە بریتی بوو لە بەرێوەبردنی شوێنە پیرۆزەکان و کێشەی حەج لە قودس بە تایبەتی کلێسەی میلاد لە (بیت لحم) کە تاکە هۆکار بوو بۆ سەرهەڵدانی جیاوازی و رکابەری لە نێوان کاسۆلیك و ئەرسۆدۆکسی هەرچەندە دەولەتی عوسمانی لە هەولی ئەوەدا بوو کە جۆرە هاوسەنگیەك دروست بکات لە نێوانیان بەلام رووسیا زیاتر لە هەولی ئەم جۆرە بیانوانەدابوو بۆ دەست خستنە ناوکاروباری دەولەتی عوسمانی کە زیاتر لە ( ١٣ ملیۆن ) ئەرسۆدۆکسی لە ژێر سایەی عوسمانیەکان بوون وە رووسیای

قەیسەری بۆ ئەم مەبەستە داوای لە سولتان عبدالمجیدی یەکەم کرد کە ڕێگایان بدات بە سەرپەرشتی کردنی شوێنە پیرۆزەکان .

لە هەمان کاتدا فەرەنساش بە سەرکردایەتی ناپلیۆنی سێیەم داوای پارێزگاری لە کاسۆلیك دەکرد بۆیە هەردوو وولآت لە هەولی ئەوەدابوون دەست ڕۆشتیووی خۆیان لە ناو دەولەتی عوسمانی بچەسپێنن بە مەبەستی پارێزگاری کردن لە ڕەعیەتی خۆیان بە جۆرێك کە گەیشتە ئەو ئاستەی کە هەردوو وولات فشار بخەنە سەر سولتانی عوسمانی بە مەبەستی پێدانی جیاوگەی زیاتر بەلایەکیان هەر لە سالی ١٨٤٨ز بەتریکی ئەرسەدۆکسی توانی جیابێتەوە لە بەتریکی ئەستانە و زۆر بەهێز بوو بە هۆی یارمەتی دانی دەولەتی رووسیا لە بەرامبەریشدا فەرەنسا هەلسا بە یارمەتی دانی کاسۆلیك بە شێوەیەك لەسالی ١٨٥٠ز داوای جیاوگەی زیاتری کرد هەرچەندە هەرەشەکانی رووسیا زیادی کرد لەسەر سولتانی عوسمانی بە پچراندنی پەیوەندی دبلۆماسی بەلام سولتانی عوسمانی سوور بوو کە جیاوگەی زیاتر بدات بە کاسۆلیك ئەمەش بەشێوەی پراکتیك لەسالی ١٨٥٢ز ئەنجام درا ، کە گرنگترین جیاوگە بریتی بوو لە پێشکەش کردنی سێ کلیلەکەی تایبەت بە دەرگاکانی کەلێسەی عەزراوسەرادیب کە دەکەونە ژێر کەنیسەی مەهد لە بیت لحم[٥٠] .

وە رووسیا گەیشتە ئەو باوەرەی کە زیاد بوونی دەست رۆیشتووی فەرەنسا لە ناودەولەتی عوسمانی و ئەوروپا هۆکارێکە بۆ یارمەتی دانی بزوتنەوە رزگاریخوازەکان هەربۆیەش زۆر بە توندی کەوتە پیلان دانان و رووبەروو بوونەوە بۆ لە ناوبردنی شۆرشەکان بە تایبەتی لە پۆلندەو هەروەها یارمەتی دانی نەمسا بۆ لە ناوبردنی شۆرش لە مەجەر[٥١] .

لە کۆتایی مانگی شوباتی سالی ١٨٥٣ز نوێنەری رووسیای قەیسەری لە سان پترۆسبرگ لە هەرێمەکانی باشوری رووسیا کەوتە رێ وە لە ( ٩ ئازاری سالی ١٨٥٣ز ) گەیشتە ئەستانە لەسەر کەشتیەکی گەورەی جەنگی کە ژمارەیەکی زۆر لە نوێنەری دبلۆماسی و سەربازی لە گەلیدا بوون بە باوەری رووسەکان گەورەیی ئەم شاندە کاریگەری راستەوخۆی لەسەر عوسمانیەکان دەبێت لەرووی سیاسی و یان لە رووی سەربازی [٥٢] .

هەروەها ناردنی شاندێکی وا گەورە بە سەرکردایەتی نوێنەری پایابەرزی رووسی مینشکوف بۆ ئەستانە زیاتر بۆ یەکلاکردنەوەی رۆلی رووسیا لە شوێنە پیرۆزەکان لەلایەك وە هەروەها دووبارە نزیك بوونەوە لە بەریتانیا و سەر لە نوێ باس کردن لە پرۆژە کۆنەکە سەبارەت بە دابەش کردنی دەولەتی عوسمانی وە دابراندنی فەرەنسا لەم کێبەرکییە[٥٣] .هەر لەسەرتادا مینشکوف لە ئەستانە روونی کردەوە کەروسیای قەیسەری بە هیچ جۆرێك مەبەستی چاوبرین نیە لە دەولەتی عوسمانی تەنها مەبەستی چاودێری کردنی رعایەکانی ئەرسۆدۆکسی لە شوێنە پیرۆزەکان[٥٤] .

ئەو شاندە هەولی دا خۆی وا نیشان بدات کە هاتووە بۆ ئاشتی کردن بەلام مەبەستی سەرەکی رووسەکان زیاتر هەرەشە لە سولتان بوو بۆ گوێ نەدان بە داواکاریەکانی فەرەنسا سەبارەت بە شوێنە پیرۆزەکان و هەروەها بە دەست هێنانی فەرمانێکی تر کە زیاتر جەخت لەسەر مافی ئەرسۆدۆکسی بکات لە رێگای پارێزگاری کردنی لەلایەن رووسەکان ، وە ئەگەر دەولەتی عوسمانی لە کاتێك دا کەوتە بەر هەرەشەکانی فەرەنسا ئەوا منشکوف

هەلدەستێ بە بەستنی هاوپەیمانیەتی نهێنی بەرگری لەگەڵ دەولەتی عوسمانی[55] .

لێرەداهەلوێستی رووسەکان زیاتر دێتە بەرچاو لە دەست خستنە ناوکاروباری دەولەتی عوسمانی ئەویش لە رێگای پرۆژە بریارێك کە لە لایەن منشکوف درا بە سولتانی عوسمانی کە بریتی بوو لەم خالانەی خوارەوە :

أ – کێشانەوەی هەموو ئەو جیاوگانە کە درابوو بە کلێسەی کاسۆلیکی لە شوێنە پیرۆزەکان / فەلەستین .

ب – دان پێدانی دەولەتی عوسمانی بە دەسەلاتداریەتی رووسیای قەیسەری لەسەر پەرشتیاری و چاودێری کردنی مافی ئەرسۆدۆکسی و شوێنە پیرۆزەکان لە فەلەستین .

ج – بەستنی هاوپەیمانی بەرگری نهێنی رووسی – عوسمانی .

ئەم پرۆژەبریارە لەلایەن سولتانی عوسمانی (عبدالمجیدی یەکەم ) خرایە بەردەم هەندیك لە بالیۆزە ئەوروپیەکان بەتایبەتی بالیوزی بەریتانیا ( لۆرد ستراتفۆرد )[56]، ئەویش رێنمایی کرد بەقبول کردنی بەندی یەکەم بەلام بەندی دووەم و سێیەمی رەت بکاتەوە ئەمەش بوو بەهەلوێستی دەولەتی عوسمانی بەرامبەر بەداواکاریەکانی روسیا کەلەلایەن (منشکوف) پێشکەش کرابوو ئەمەش بووە هۆکارێك بۆ سەرنەکەوتنی نوێنەری روسیا بۆیە بەناچاری لەئایاری سالی ( ١٨٥٣ ) شاندی روسی بەبێ هیچ دەسکەوت گەرایەوە روسیا[57] .

٣- ململانێی زلهێزەکان :

ململانێی زل هێزەکان مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە بە مەبەستی جێ پێکردنەوەیان بۆ پەرەدان بە بەرژەوەندەییە ئابوورییەکان بە تایبەتی بەدەستهێنانی کەرەسەی خاو لە داگیرگەکان ، بەریتانیا هەرزوو گرنگی ناوچەی رۆژهەلاتی زانی بوو وە تاکە رێگا بوو بۆ گەیشتنی یە هیندستان بۆ ئەم مەبەستەش رووبەرووی هەر هێزێکی تر دەبۆوە کە کاریگەری لە سەر بەرژەوەندیەکانی هەبێت ، هەربۆیەش زوو کەوتە دانانی بەربەست لەبەردەم فرەوانخوازیەکانی رووسیا لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی لە کاتێك کە گومانەکانی بەریتانیا زیاتر گەشەی کرد کە رووسیا سەرکەوتنە هەرێمییەکانی لە ئێران لە ماوەی سالانی ( ١٨٠٣ – ١٨١٣ ) وە ( ١٨٢٦ – ١٨٢٧ ) وە بەرامبەر دەولەتی عوسمانی لە سالی ( ١٨٢٩ ) لەسەردەمی پەترۆسی گەورە بەدەست هێنا.

نزیك بوونەوەی رووسیا لە رێگای نوێنەری پاپابەرزی رووسی مینشکوف بووە هۆی ئەوەی بەریتانیا دووبارە بکەوێتە خۆی بۆ ریگەگرتن لەم نزیك بوونەوەیە بۆیە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ( لۆرد کلاوندون ) داوای لەبالیۆزە چاکەکەی( لۆرد ستراتفۆرد ) بەگەرانەوەی لەلندن بۆ شوێنی کارەکەی بەمەبەستی دروست کردنی بەربەست لە دانووسانی نێوان روسیاو عوسمانی بەهەر شێوەیەك بێت هەروەها فەرەنساش بەهەمان شێواز داوای لەسەرکردەی کەشتیگەلی دەریایی خۆی کرد لەدەریای ناوەراست بەناردنی هەندێ یەکەی سەربازی دەریایی بۆ ئاوەکای عوسمانی وە هەردوو ولات کەوتنە چالاکی نواندن بۆ دابراندنی روسیا لەوکاتەی کە گشت مەبەستە

سەرەکیەکانی روسیا کەلەلایەن نوێنەری بەرزی رووسی (مینشکوف) ووروژاندرابوو ئەویش گۆرانکاری لەکێشەی شوێنە پیرۆزەکان لەسەر جیاوازی مەزهەبی لەنێوان (کاسۆلیك و ئەرسۆدۆکسی) بۆ کێشەیەکی سیاسی کەتەنها رووسیا تێیدا سودمەند دەبێت ئەمیش یان لەرێگای دەست گرتن بەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یاخود هیچ نەبێت جیاوگەی سوبی دەست کەوێت لەناو دەولەتی عوسمانی[٥٨]، گرنگترین مەبەست لای بەریتانیا بۆ دروست کردنی بەربەست لەنێوان روسیاو عوسمانی لە دانوسانەکان لەکاتێك کە داوای لەسولتانی عوسمانی کرد کە قایل نەبێت بەبەندی دووەم و سێیەم یاداشتەکەی (منشکوف) دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە زیاتر بەریتانیا پارێزگاری لە دەولەتی عوسمانی هەبووە ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر ئەگەر دەولەتی عوسمانی قایل بێت بەسەرپەرشتی رووسیا لەسەر شوێنە پیرۆزەکان هەروەها مەزهەبی ئەرسەدۆکسی ئەوە دەبێتە گەورەترین مەترسی لەسەر بەرژەوەندی بەریتانیا چونکە ژمارەی ئەرسەدۆکسی لەدەولەتی عوسمانی ژمارەیان یەکجارزۆرترە لە کاسۆلیك ئەمە لەلایەك لە لایەك تر چاوبرینی رووسیا و هاوسێبوونی لەگەڵ دەولەتی عوسمانی ئەمانە هەرهەموو بەرەنگدانەوەی دژە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لە ناوچەکە سەیردەکرا بۆیە هەرزوو بەریتانیا لەمەبەستەکانی رووسیا گەیشت بۆیە کەوتەخۆ ئامادەکردن بۆ دروست کردنی بەربەست لەبەردەم ئەم دانوسانەدا[٥٩] .

سەبارەت بە هەڵوێستی ئەوروپایەکان بەتایبەتی فەرەنسا و بەریتانیا لەو ململانێیەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و روسیای قەیسەری و پشتگیریان

لە دەولەتی عوسمانی دژ بە روسیا دەگەرێتەوە بۆ وەدەست هێنانی چەند ئامانجێك یان بەواتایەکی تر پشتگیریکردنیان لە دەولەتی عوسمانی بریتی نەبوو لە خۆشەویستیان بۆ عوسمانیەکان یاخود پارێزگاریکردن لە مولکەکانی بەلکو هەردوو دەولەت لە هەولی ئەوەدابوون کە دەولەتی عوسمانی بەلاوازی بمێنێتەوە و هەروەها نێچیرێکی ئاسان بێت بۆیان[٦٠] .

بۆ ئەم مەبەستەش پێ داگرتنی بەریتانیا لە بەرگری کردن لە دەولەتی عوسمانی دەگەرێتەوە بۆ سیاسەتی بەریتانیەکان لە دانانی دەولەتی عوسمانی وەك بەربەستێك لەبەرامبەر قەلەمرەوی روسیا و هەروەها زیاتر وەدەست هێنانی پارێزگاری زیاتر لە رێگای هیند[٦١]،هەروەها قەلەمرەوی هەر وولاتێکی ئەوروپی لەسەر مولکی دەولەتی عوسمانی دەبێتە هۆکارێك بۆ گۆرانکاری هاوسەنگی هێز لە ئەوروپا ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر هەولدانی بەریتانیا بۆ مانەوەی دەولەتی عوسمانی بە شێوەیەکی لاواز بۆ ئەوەی هەر کاتێك گونجاو بێت نێچیرێکی ئاسان بێت بەرامبەر بە بەریتانیا بۆ ئەوەی گەورەترین بەشی بەرکەوێت کە خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی بکات بۆیە دەبینین لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەم بەریتانیا خۆی لەدەولەتی عوسمانی نزیك دەکاتەوە بە شێوەیەك بەرەنگاری هەموو پیلانێك دەبێتەوە کە رێگا خۆشکردنی بۆ دابەشکردنی دەولەتی عوسمانی یاخود هەرەشە لێکردنی چونکە بەرژەوەندیە سیاسی و بازرگانی و ستراتیژیەکانی لەسەری دەسەپێنێ کە ئەم هەلوێستە وەربگرێت هەر لەم رووەش دەبینین پشتگیری لە دەولەتی عوسمانی دەکات دژ بە فەرەنسا لەکاتی داگیرکردنی میسر لەسالی ١٨٧٩ز ، هەروەها هاوهەلوێستە لەگەل عوسمانیەکان دژ بە

محمدعلی لەساڵی ١٨٤٠ز نەوەك هێزێکی بەهێزی عەرەبی لە ڕۆژهەڵات سەرهەڵبدات[٦٢].

بەڵام هەرچی هەڵویستی فەرەنسا بەرامبەر ململانێ رووسیا و عوسمانی جۆرە جیاوازیك بەدی دەکرێت لە بەرامبەر هەلویستی بەریتانیا هۆکارەکەشی جیاوازی بەرژەوەندیەکانی لەنێوان هەردوو وڵات، ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا ناپلیۆنی سێەم وای دادەنا کە وڵاتەکەی بەشێکی سەرەکییە لەو ململانێیە، وە هەوڵی دەدا لەرێگای ئەم ململانێیە بتوانێ پشتگیری کاسۆلیکی فەرەنسا بۆ خۆی رابکێشێت لەرێگای کۆنترۆلکردنی شوێنە پیرۆزەکان وەهەروەها هەوڵدانی بۆ وەدەست هێنانی چەند سەرکەوتنێك لەدەرەوە بەمەبەستی دەرکردنی فەرەنسا لەو دابرانە نێودەولەتیەی کە لە دوای کۆنگرەی ڤینا ساڵی ١٨١٥ز بەسەری سەپێندرابوو هەروەها گەرانەوەی بۆ سنوورە سروشتیەکەی خۆی کە لەدەستی دابوو[٦٣].

هەروەها مەبەستی فەرەنسا لە پاڵپشتی کردنی دەولەتی عوسمانی زیاتر دوور خستنەوەی رووسیا لەناوچەی بلقانە[٦٤]، سیاسەتی فەرەنسا بەرامبەر بە دەولەتی عوسمانی جێگرنەبوو بەڵکو پەیوەندی هەبووە بە ململانێ نێودەوڵەتیەکان و چاوپرینە ئیمپرلیازمیەکان زۆرجار هەمان هەڵویستی دەوڵەتی عوسمانی هەبووە هەستاوە بەپشتگیری کردن هەندێ جاریش دژ بە دەوڵەتی عوسمانی وەستاوە، فەرەنسا لەساڵی ١٨٢١ز-١٨٣٠ز یارمەتیدەری شۆرشی یونانیەکان بووە دژ بە دەوڵەتی عوسمانی هەروەها لەوکاتەی کە محمد علی بزوتنەوەی جوداخوازی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی رایگەیاند لەساڵی ١٨٣٠ز-١٨٤٠ز فەرەنسا یارمەتی دەری محمد علی بووە دژ بە

عوسمانییـەکان لـە هـەمان کاتـدا دەبیـنین هەڵوێستی فەرەنسا لـەرووی بەرژەندییـە سیاسـیەکانی گۆرانکـاری بەسـەرداهات دەکەوێتـە بەسـتنی هاوپەیمانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دژ بە رووسیای قەیسەری لـە جـەنگی قەرم[٦٥].

ب / هۆکارە راستەوخۆکانی جەنگی قەرم :

دوای ئەوەی لەلایەن منشکوف یاداشتێك پێشکەش کرا بە ( بـاب العـالی ) کـە داوای سـەربەخۆیی ( چـیای رەش ) و هـەروەها لابردنـی وەزیـری سربی کەلەلایـەن روسـیا بـەدوژمنی سـەرەکی دادەنـرا بـەڵام سـولتان ئەمـە رەت دەکاتەوە پاش دانوستان لەگـەل بـالیۆزی بـەریتانیا چـونکە ئەمـەی داواکـراوە دژایەتی لەسەر مافی سولتان و دەست خستنە ناو کاروباری دەولەتی عوسمانی سەرەرای ئەوەش مینشکوف (١٧ ئایارساڵی ١٨٥٣ ) دیار کـرد کـە دوا مۆلـەت بێت بۆ وەرگرتنەوەی وەلامی یاداشتەکە لەوکاتەدا باوکی سولتان کۆچی دوایی کرد وەهەروەها سوور بوونی مینشکوف لەسەر وەلام دانەوە کە بووە هۆکارێك کەئەنجومەنی وەزیرانی تازە دامەزرا بەسەرکردایەتی رشید پاشاو وەزیرەکـانی کەسەرکردەی بەهێزو نەیاری رووسیابوون رەت کرایەوە[٦٦] .

وەلەدوای هەرەس هێنانی دانوسـان لـەنێوان هـەردوو لایـەنی عوسمـانی و روسـی و رەت کردنـەوەی سـولتانی عوسمـانی بـۆ داواکاریـەکانی روسـیا کەپەیوەست بەچاودێری کـردن و سەرپەرشـتیاری شـوێنە پیرۆزەکـان و چـەند کاری تر روسیا بریاری جەنگی دا دژ بەدەولەتی عوسمانی[٦٧] .

بۆیە قیصری رووسیا بریاریـدا بـەداگیرکردنی هـەردوو ولایـەتی (ئـەفلاق و بەغدان) لەهـەرێمی دانـوب کـە هـەردوکیان لـە رووی نـاوەوە سـەر بەدەولـەتی

عوسمانی بوون وە قیصری رووسیا ( نیقولای یەکەم ) روونی کردەوە کە ئەم هێرشە مەبەست لێی راگەیاندنی شەڕ نیە بەلکو هەنگاوێکی خۆپارێزیە ، لەدوای ئەمەش چالاکیە دبلوماسیەکان کاریان دەکرد بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە و هێشتنەوەی لەچوارچێوەی دوو وولات (روسیا وعوسمانی) نەبێتە هۆی شەڕێکی گەورەی ئەورووپی[٦٨].

هەروەها سولتانی عوسمانی ئاگادارکردنەوەی دا بە رووسیا بۆ دەست هەلگرتن لە هەردوو ویلایەت ئەگەرنا ناچاردەبێت بڕیاری شەر دژی بدات هەرلەوکاتەش بەریتانیاو فەرەنسا پشتگیری هەلوێستی عوسمانی بوون پاش تێکچوونی بارودۆخی سیاسی و سەربازی لەنێوان هەردوو ولآت رووسیا بڕیاری جەنگی دا لە ٢٣تشرینی یەکەمی ١٨٥٣ لەسەر ئەم بنچینەیە کەشتیگەلی بەریتانی و فەرەنسی کەوتنە رێگا بەرەو دەریای رەش وەك هەنگاوێك بۆ هەرەشەکردن لە روسیا بۆ کشانەوەی لەو ناوچەی کە دەستی بەسەرداگرتەوە[٦٩] .

دووەم / رەوتی رووداو پەرەسەندنەکانی جەنگی قەرم :

أ – داگیرکردنی ( ئەفلاق و بەغدان ) لەلایەن رووسیا :

سەبارەت بە هەنگاوەکانی جەنگی قەرم و دەست پێکردنی دەگەڕێتەوە بۆ جولآنەوە سەربازیەکانی هەردوو ولآت لە لایەك و لێك نزیك بوونەوەی هێزە دەریایەکانیان لە دەریای ڕەش و ڕووباری دانووب کە هۆکارێك بوو بۆ سەرهەلّدانی شەڕ و پێك دادان لە کاتێکی نزیك ٠

یەکەم هەنگاو بۆ دەست پێکردنی جەنگی قەرم دەگەڕێتەوە بۆ هێرشکردنی هێزەکانی ڕووسی و داگیرکردنی هەرێمەکانی دانووب (ئەفلاق و

بەغدان) لەو کاتەی کە دانووسەکانی رووسی عوسمانی گەیشتە قۆناغی بن بەست کە ئەمەش سەرەتای دەست پێکردنی جەنگی قەرم بە شێوەی پراکتیکی لە کاتێك دا کە هێزەکانی ڕوسیا پەرینەوە لە رووباری (بروت)کە جیاکەرەوەی مومتەلەکاتی هەردوو دەولەتە و داگیرکردنی هەردوو هەرێمی (ئەفلاق و بەغدان) کە سەر بە دەولەتی عوسمانی بوون لە رووی ناوەوە بەمەبەستی هەنگاوی خۆپارێزی تاکو وەلآمدانەوەی دەولەتی عوسمانی بە داواکاریەکانی روسیا ، دوای ئەمەش چالاکیە دبلوماسیەکان دەست پێ دەکات لە لایەن ئەورووپیەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بەبێ ڕوودانی شەڕ[٧٠] .

لەدوای ئەم ڕوداوە ئاگادارکردنەوەیەك لەلایەن دەولەتی عوسمانی درا بە روسیا بۆ چۆلکردنی هەردوو هەرێمەکە و رەفز کردنی قەیسەر بۆ ئاگادارکردنەوەکە سوڵتانی عوسمانی ئیعلانی شەڕی کرد دژ بە روسیا لە ئۆکتۆبەری سالی ١٨٥٣ز[٧١] .

هەروەها بە پاڵپشت کردنی هەلوێستی عوسمانی لەلایەن بەریتانیاوە لەشکری عوسمانی پێشرەوی کرد بەسەرکردلیەتی (عمر پاشا)[٧٢] کە توانی سەرکەوتن بەسەر رووسەکان بێنێ و بیانگەڕێنێتەوە بۆ ناوچەکانی پشت دانووب[٧٣]، سوپای رووسیا لەژێر سەرکردایەتی (البرنس کورتشاکوف) لە رووباری(پروت) تێپەری بریتی بوو لە بیست هەزارسەرباز و شەش هەزار تۆپ هەروەها قایمکاریەکانی عوسمانی لە لای رووباری تونەکە بە شێوەی نارێك بوو بەلام ئازایەتی عمر پاشا کە سەرکردەیەکی نەمساوی بە ئەسڵ کرواتی بوو توانی ڕووبەروویان ببێتەوە[٧٤].

ب – شەڕی سینۆب :

لەئــەنجامی هێرشــکردنی کەشــتیگەلی روســی لــە دەریەنــدی ســینوبی عوسمـانی و تێکشکاندنی کەشـتیەکانی عوسمـانی پـاش شـەڕێکی تونـد لـە تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٥٣ز لەگەڵ ئـەوەی کـە بـەریتانیا و فەرەنـسا هـاو هەڵوێـست بـوون دژ بـە روسـیا ، بـەڵام روسـیا هـەر بـەردەوام بـوو لەسـەر هەلوێستەکەی ئەمەش بـووە هۆکارێك بـۆ ڕاگەیانـدنی شـەڕ دژ بـە رووسـیا لەلایەن هەردوو وولاتی فەرەنسا و بەریتانیا[٧٥] .

لـەم کاتەشـدا بـەریتانیا وای دەبینـی کـە بەرژەوەندیـەکانی بریتیـە لـە بەرەوپێش نەچوونی رووسیا و دانانی سنورێك بۆی چونکە ترسانی بـەریتانیا لەدەست بەسـەرداگرتنی روسـیا بەسـەر ئەسـتانە، وە هـەروەها فەرەنـساش هەمان هەڵوێستی هەبوو چـونکە نـاپلیۆنی سـێیەم پێـی وابـوو ئـەم شـەرەی عوسمـانی دژ بـە روسـیا دەیکـات زیـاتر دەگەڕێتـەوە پێـشێلکردنی مـافی کاسۆلیکەکان لە قودس و هەر بۆیەش ئەوکاتەی هێرشی دەریـایی روسـەکان لە سینۆب ڕێگا خۆشـکەر بـوو بـۆ هاتنـە نـاوەوەی کەشـتیگەلی ئینگلیـزی و فەرەنـسایی لــە دردنیــل بــۆ ئەســتانە بەمەبەســتی پارێزگــاریکردنی لــە عوسمانیەکان وە قەیسەری رووسی ڕەخنەی لەم جوڵانەوەیـە گـرت وبڕیـاری جەنگی دژیە فەرەنسا و بەریتانیا ڕاگەیاند ، وە لە ١٢ ئـازاری سـاڵی ١٨٥٤ز پاش ئەوەی سوپای عوسمانی بەسەرکردایەتی عمر پاشـا تـوانی رووبـەڕووی سـوپای رووسـیا بێتـەوە بەسـەرکردایەتی باسـکیفتش کـە ئابلوقـەی شـاری سلستریای دابوو بەڵام لە کۆتایدا توانیـان ئابلوقەکـە بـشکێنن دوای ئـەوەی هێزەکانی بەریتانیا و فەرەنسا گەیـشتە بەنـدەری ڤارنـا لـە دەریـای بـەلتیق

بەمەبەستی پشتگیری کردن لە عوسمانیەکان وە شکاندنی رووسەکان و کشانەوەیان بۆ نیمچە دوورگەی قەرم دواتر ئابلوقەدانی شاری سیباستول[٧٦].

ج - ناوبژیوانی نەمسا :

سەبارەت بە نەمسا بێ لایەنی خۆی راگەیاند لەو ململانێیە هەرچەندە فەرەنسا و ئینگلترا بۆ چەندین جار داوایان لێکردووە بێتە ناو هاوپەیمانیەتی لە کۆتایدا رازی دەبێت بە پەیمانامەی (ویانە) بە دەست بە سەرداگرتنی هەردوو هەرێمی (ئەفلاق و بەغدان) لە لایەن نەمسا هەروەها پالپشتی کردنی نەمسا بۆ هاوپەیمانیەکان لە بەرامبەریش دا ئەگەر رووسیا بریاری جەنگ دژ بە نەمسا رابگەیەنێت پێویستە فەرەنسا و بەریتانیا یارمەتی بدەن لێرەدا رووسیا نارازی نەبوو بەرامبەر بەم کارە بەلکو زۆر پێی باشتر بوو کە دەسەلاتی نەمساویەکان لە سەر ئەم دوو هەرێمە هەبێت چونکە پێ ی وابوو کە نەمسا بە هیچ شێوەیەك ئارەزووی ئەم جەنگەی نیە[٧٧].

ئەوەی جێگای ئاماژە کردنە نەمسا هەر لە سەرەتاوە رۆلی ناوبژێووی دیوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە دوای ئەوەی کە گەیشتە رێکەوتنامەیەك لەگەل هاوپەیمانان هەلسا بە پێشکەش کردنی یاداشتێك بە رووسیا کە بریتی بوو لە چوار مەرج لەوانە:-

- دانانی سیستەمێکی نۆی بۆ هەردوو هەریمەکە بە پشگیریەکی ئەورووپی هاوبەش .
- ئازادی کەشتیەوانی لە دانووب .
- چاوپێخشاندنەوەی لە رێکەوتنامەکانی تەنگەبەرەکان لە سالی ١٨٤١ .

- هەروەها دەست هەڵگرتنی رووسیا لە پارێزگاری کردنی مافی مەسیحیەکان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی .

لە هەمان کاتدا مەترسی رووسیا لە نەمسا کە بەشێوەیەکی تەدریجی روو لە دژایەتی کردنی دەکات بۆیە رووسیا لە ٣ تشرینی دووەم ١٨٥٤ رازی دەبێت بە مەرجەکان وەك بناغەیەك بۆ دانوسانی لەگەل هاوپەیمانان بەلام لایەنی فەرەنسا و بەریتانیا ئەمەیان رەت کردەوە بەڵکو سور بوون لە سەر رازی بوونی رووسیا بەبێ دانانی مەرج کە تاکە رێگایە بۆ وەستاندنی شەر[٧٨].

هەرچەندە رووسەکان هەر بەردەوام دەبن لە جەنگ لێرەدا هەلوێستی نەمساویەکان دوو لایەن دێتە بەرچاو هەر لە سەرەتای شەرەکە نەمسا رازی نەبوو بە داگیرکردنی هەردوو هەرێمی دەولەتی عوسمانی لەلایەن رووسیا هەروەها داکۆکی کردن نەمسا لە سەر سەربەستی کەشتیوانی لە رووباری دانوب کە بە هەردوو هەرێم رەت دەبێت چونکە ئازادی کەشتیوانی لەم رووبارە کاریگەری زۆری هەیە لە سەر بازرگانی دەرەوەی نەمسا لەگەل ئەوەش نەمساویەکان وایان دەبینی رووخانی دەولەتی عوسمانی دەبێتە سەرکەوتنێك بۆ رزگاریخوازەکان لەگەل سیاسەتی نەمسا ناگونجێ لە هەمان کاتیشدا قەرزاری باری رووسیا بوون لەو کاتەی رووسیا بەرگری لە نەمسا کرد لە سالی ١٨٤٨ لە ناوبردنی شۆرش لە مەجەر هەروەها بوونی سەردینیا لەلایەکی تر کە دەیویست بچێتە ناو هاوپەیمانیەتی دژ بە رووسیا بە مەبەستی وەرگرتنی هاوکاری بۆ (یەکێتی ئیتالیا) کە لە سەرەتادا فەرەنسا و بەریتانیا رازی نەبوون لە بەر تورە بوونی نەمسا بەلام کە سور بوونی نەمسا

دەرکەوت لەسەر بێلایەنی دواتر رازی بوون لە سەر وەرگرتنی سەردینیا لە هاوپەیمانی کە ئەمەش بۆ دواجار وای لە نەمسا کرد کە بریاری جەنگ بدا دژی رووسیا(٧٩) .

د – بەندەری سیواستوبول هەنگاوی کۆتایی شەری قەرم :

دەست پێ کردنی هێرشەکانی هاوپەیمانان بەسەرکردایەتی دەولەتی عوسمانی بۆنیمچە دوورگەی قەرم روودانی شەری (سیواستوبول) پاش پشگیری کردنی فەرەنسا و بەریتانیا بۆ دەولەتی عوسمانی لە (٦ )ی شوباتی سالی ١٨٥٤ز بەمەبەستی زالّ بوون بەسەر هێزەکانی رووسیا لەدەریای رەش لەدوای جێ هێشتنی هەردوو هەرێمی ئەفلاق و بەغدان لەئەنجامی هەرەشەوفشاری نەمسا دوای دەست بەسەرداگرتنی هەردوو هەرێم لەلایەن نەمساش هاوپەیمانان سووربوون لەسەر گواستنەوەی شەرەکە بۆنیمچە دورگەی قەرم بەئاراستەی بەندری سیواستوبول کەیەکەیەکی دەریای رووسی بوو لەنیمچە دورگەکە ، هاوپەیمانان هەلسان بەئابلوقەدانی ئەم بەندەرە بۆماوەی سالێك کەتیادا گەورەترین ناخۆشی و دەردەسەری هاتە پێشی بەهۆی خراپی بارودۆخی ئاوهەوا و هەروەها بلاوبونەوەی نەخۆشی کولێرا لەنێوان هێزەکانی هاوپەیمانان لە قۆناغی یەکەمی شەرەکە وەداگیرکردنی بەندەری (سیواستوبول) زیاتر لە ٢٥ هەزار کەس بوونە قوربانی لەهەردوو لایەنی شەرکەر کە تیادا چەندان سەرکردەی گەورە بوونە قوربانی وە لەدوای چەند زنجیرەیەك شەر لە نێوانیان هاوپەیمانان توانیان لە ٩ ی ئەیلولی ١٨٥٥ز دەست بە سەریدابگرن و رووسەکان شکستیان خوارد(٨٠)

هـەر ئـەو کاتـەش مەملکـەی سـردینیا و بیـدمونت کەوتنـە بەسـتنی هاوپـەیمانی لەگـەل فەرەنساو بـەریتانیاوە بەشـدار کردنـی نـزیکـــەی ١٨ هەزارسـەرباز دژ بـە روسـیا بـۆ شـکاندنی هێـزە بەرگریـەکانی رووسـیا لـە سیواستوبول بەسەرکردایەتی ( لامارمورا) هەروەها پالپشت کردنی مملەکـەی سـویـد لەهاوپەیمانی ئەورووپی دژ بەرووسیا[٨١] .

لە دوای شکانی رووسیا لە سیواستوبول بۆ ماوەیەکی کـورت نیقـولای یەکەم کوچی دوایی کرد دواتر ئەسکەندەری دووەم دەسەلاتی گرتـە دەست لە ٢ ئازاری سالی ١٨٥٥ کە کەسایەتیەکی.ئاشتی خواز بووە وە زیاتر گرنگی داوە بە کاروباری ناوخۆی روسیا ، ئــــەمەش لە کاتێـك داهەسـتی کـرد کـە بەبەدواچوونی جەنگ زۆر گران لەسەری دەوەستێ لە ئەنجامی خـراپ بـوونی بـاری ئـابووری و کۆمەلایـەتی دوای شـکانی رووسـیا لـە جـەنگی قـەرم بۆیـە دەستی درێژ کرد بۆ ئاشتی[٨٢] .

لێرەدا هەنگاوەکانی شەری قەرم کۆتایی پێ دێت دوای ئــەوەی نەمسا هەست دەکات کەشـەرەکە بـەرەو کۆتـایی دەچێت ئـەمجارە زۆر بـە تونـدی هەرەشەی ئاگادارکردنەوەی کۆتایی دەداتە رووسیا بەمەبەستی کارکردن بـە مەرجەکانی سالی ١٨٥٥ز ،کە لە کۆنگرەی ( ویانە ) وەك یاداشتێك دابووی بە رووسیا ئەگەر وەلامی نەبێت ئـەوە نەمسا لەگـەلّ نـەرویج و سـوید بەهـەموو هێزیکەوە بەشداردەبن لەگەلّ هاوپەیمانان لە بـەهاری سـالی ١٨٥٦ز بەمـەش رووسیا رازی بوو کە گـەورەترین زەرەر لـە بەرژەوەندیـەکانی دەدرێـت لـە و رێکەوت نامەی کە پێشتر رازی نەبوو لە سەری بەلام ئیستا بە ناچاری قبوولی دەکات[٨٣] .

## تەوەرەی سێیەم

## کۆتایی هاتنی جەنگی قەرم

### یەکەم / پەیماننامەی پاریس ( ١٨٥٦ ز ) :

دوای ئەوەی رووسیای تەزاری تووشی شکست هات لە بەرەکانی جەنگ بەرامبەر بە دەولەتی عوسمانی و هاوپەیمانەکانی وە لە هەمان کاتدا لەدەستدانی بەندەری سباستبول کە ستراتیژیەکی تایبەتی هەبوو سەبارەت بە رووسیا ، هەرچەندە رووسەکان هەموو هەولێکیان بەگر خست لە رووی کۆکردنەوەی هێزو تێچوونە داراییەکان بۆ لەدەست نەدانی ئەم بەندەرە بەلام هێزو تەکنیکی سەربازی هاوپەیمانان خەونەکانی رووسیای لە گۆر ناو توانیان دوای ئابلوقەیەکی درێژ خایەن دەست بگرن بەسەر بەندەرە ستراتیژیەکە .

مردنی تەزاری رووسیا ( نیقولای یەکەم ) پاش ماوەیەکی کەم لە دوای لەدەست دانی بەندەری سباستبول کاردانەوەی هەبووە لەسەر گۆرانکاری سیاسەتی روسیا لە ناوەوەو دەرەوە چونکە ( نیقولای یەکەم ) کەسایەتیەکی توندرەو بووە ، دواتر وەرگرتنی دەسەلات لەلایەن ( ئەسکندەری دووەم ) لە ٢ ئازاری سالی ١٨٥٥ز کە کەسایەتیەکی ئاشتی خواز بووە و زیاتر هەولەکانی بەگەر خستووە بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکان لە رووسیا و دوورکەوتنەوەی لە هزری فرەوانخوازی و دەست خستنە ناو کاروبارەکانی ئەورووپا و دوای ئەوەی گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بەردەوام بوونی شەر بە گران لەسەری دەوەستێ لە ئەنجامی ئەو تەنگەژە ئابووریەی کە وولات دووچاری بۆتەوە و سەرەرای لەدەست دانی کەشیگەلی رووسیا لە دەرئەنجامی جەنگەکەو شکستە یەك لە دوای یەکەکانی سوپای

رووسیا ، ئەمانە بە شێوەیەکی گشتی کاردانەوەی هەبووە لەسەر بیرکردنەوەکانی قەیسەری تازە و هەولدانی بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەی ئاشتی[٨٤] .

لەلایەکی تر ئاگادارکردنەوەکەی نەمسا کە بەشێوەی هەرەشە ئامێز ئاراستەی رووسیا کرا بۆ وەستاندنی جەنگەکە و رازی بوونی بەو یاداشتانەی کە لە کانوونی دووەمی سالی ١٨٥٥ ز پێشکەشی رووسیای کردبوو ، وە نواندنی ئەو هەلوێستە توندەی نەمسا لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە جۆرە نزیك بوونەوەیەك لە نێوان فەرەنسا و سەردینیا بەدی دەکرا بە مەبەستی یارمەتی دانی فەرەنسا بۆ سەردینیا لە کێشەی یەکێتی ئیتالیا ، ئەمەش کاردانەوەی هەبوو لەسەر نەمسا کە ئەم هەلوێستە بنوێنێت ، لە کۆتایدا رووسیا رازی دەبێت لەسەر ئاگادارکردنەوەکەی نەمسا بۆ راگرتنی شەرەکە بەبێ هیچ مەرجێك و رێگا والآ بوو بۆ بەستنی پەیماننامەی ئاشتی لە پاریس لە ٣٠ ئازاری سالی ١٨٥٦ز کە کۆتایی بە جەنگی قەرم هێنا[٨٥].

هەروەها تێکشکانی کەشتیگەلی رووسیا لەلایەن هاوپەیمانان کە ئەمەش کاردانەوەی راستەوخۆی هەبووە بۆ وەستاندنی جەنگەکە و بەستنی پەیماننامەی ئاشتی ، چونکە هاوپەیمانان بۆیان روون بۆوە کە رووسیای تەزاری جارێکی تر ناتوانێ بالا دەستی خۆی لە رووی دەریاییەوە بسەپێنێ بە تایبەتی لە دەریای سپی ناوەراست و بالآ دەست بوونی بەریتانیا و فەرەنسا لە دەریای رەش ئەمەش مەبەستی سەرەکی هاوپەیمانان بوو بۆیە لە دوای دەست گرتنیان بەسەر بەندەری سباستبول پێشوەچوونەکانیان راگرت ، لە هەمان کاتدا بوونی جیاوازی بیرو بۆچوون لە نێوان هاوپەیمانان

لەسەر بەردەوام بوونی شەڕەکە ، ناپلیۆن لە هەوڵی ئەوەدا بوو هاوپەیمانان ڕازی بکات لەسەر وەستاندنی شەڕەکەو پێشوەچوونیان ، بەلام بەریتانیا هەوڵی بەردەوامی شەڕەکەی دەدا بۆ ئەوەی زیاتر ڕووسیا سەر شۆڕ بکات لە هەمان کاتدا نەهێشتنی ڕۆڵی سیاسی ڕووسیا لە ئەورووپا بە گشتی و ناوچەکە بە تایبەتی لە کۆتایدا بۆچوونی فەرەنسا سەردەگرێت و شەڕەکە ڕادەگیرێت و دواتر بەستنی پەیماننامەی ئاشتی[٨٦] .

سەبارەت بە پەیماننامەی ئاشتی لە پاریس ( ١٨٥٦ز ) لە ڕووی تیۆریەوە بە یەکەمین گردبوونەوەی ئەورووپی دادەنرێت لە دوای کۆنگرەی ( ڤیرۆنا ) لە سالی ١٨٢٢ز وە هەموو کۆبوونەوەکان لە نێوان سالانی ( ١٨٢٢ز ) تاکو (١٨٥٦ ) بریتی بوونە لە سەر پێ داگرتن لە بابەتە دیاریکراوەکان تایبەت بە ئەورووپا بەلام هەرچی کۆنگرەی ئاشتییە لە پاریس زیاتر بریتی بوو لە گردبوونەوەیەك بۆ یەك لاکردنەوەی بابەتە تایبەتیەکان لە ڕۆژهەلاتی دوور نەك لە چوارچێوەی گفتوگۆیەکان سەبارەت بە کێشەکانی ئەورووپا[٨٧] .

**دووەم / بەندەکانی پەیماننامەی پاریس ١٨٥٦ز :**

دوای ئەوەی ڕووسیا ئامادەبوونی خۆی نیشاندا لە ١٦ کانوونی دووەم ١٨٥٦ بەرامبەر بە یاداشتەکەی نەمسا ڕاگرتنی شەڕەکە ، دواتر ئاراستە کردنی یاداشتێك لەلایەن ڕووسیا بۆ کۆنگرەی ئاشتی کە تییایدا ڕووسیا ڕەزامەندی و ئامادەبوونی خۆی نیشاندا بۆ ئاشتی کردن ، لە ڕێگای بەستنی کۆنگرەیەك کە لە مێژوودا ناسراوە بە(پەیماننامەی ئاشتی پاریس) لە ٣٠ئازای سالی ١٨٥٦ز لە نێوان وولاتانی هاوپەیمان ( دەولەتی عوسمانی فەرەنسا ، بەریتانیا ، بیدمونت ، نەمسا ) لەلایەك و ڕووسیای تەزاری لە

لایەکی تر، وە چەند بەند و مەرجێکی قورسی لەخۆ دەگرت کە رووسیا گەورەترین زەرەرمەندی ئەم پەیماننامەیە بوو .

گرنگترین بەندەکانی پەیماننامەی پاریس پێویستە رووسیای تەزای بەڵێن بدات بە گەرانەوەی شاری قارص و هەموو شوێن وناوچەکانی دەولەتی عوسمانی کە سوپای رووسیا دەستی بەسەرداگرتووە ( بە تایبەتی ئەو ناوچانەی کە بە مولکی دەولەتی عوسمانی هەژمار دەکرێت ) ، لە بەرامبەردا دەولەتی عوسمانی و هاوپەیمانەکانی بەلێن بدەن بە گەرانەوەی بەندەری سباستبول و هەموو قایمکاریەکانی دەوروبەری لەگەڵ هەموو ئەو ناوچانەی کە سوپای هاوپەیمانان لە ناو خاکی رووسیا دەستیان بەسەرداگرتووە[(٨٨)] .

هەروەها بریاردان لەسەر لێبووردنی گشتی لە لایەن هەردوو لایەنی شەرکەر بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەی کە بەشداری شەریان کردووە دژ بە وولاتەکەیان و ئالوگۆرکردنی دیلەکانی جەنگ لە هەردوو بەرە[(٨٩)] .

لە هەمان کاتدا دان پێدانانی وولاتانی ئەورووپی بە شکۆمەندی دەولەتی عوسمانی لەسەر گەروو تەنگەبەرەکان و فشار خستنە سەر رووسیای تەزاری و ئاگادارکرنەوەی لە خۆ دوورگرتنی لە دروستکردنی کەشتیگەلی جەنگی و کارگەکانی چەك و تەقەمەنی ، ئەمەش کاردانەوەی هەبووە لەسەر دەریای رەش کە بە شێوەی بێ لایەنی ( محايد ) بێت و تەنها بۆ مەبەستی بازرگانی بەکاربێت لە نێوان هەموو وولاتەکان[(٩٠)] .راگەیاندنی ئازادی کەشتیوانی لە رووباری دانووب وە پێکهێنانی لێژنەیەکی دەولی بۆ سەرپەرشتی کردنی وە ئەم مەرجەش لە بەرژەوەندی نەمسا بوو[(٩١)] .

سەبارەت بە ( ئەفلاق و بەغدان ) کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس بریاری مانەوەیانی دا لەژێر شکۆ و چاودێری دەوڵەتی عوسمانی بەلام بە دانانی چەند مەرجێك لەسەر دەوڵەتی عوسمانی کە تیایدا ( باب ئەلعالی ) دەسەلاتەکەی سنووردارکرا لەسەر ئەم دوو هەرێمە کە دەست نەخاتە ناوکاروبارەکانیان لە هەمان کاتیشدا ئەم دوو هەرێمە خاوەن جیاوگەو سەربەخۆی ناوخۆیی بن لە رووی ئازادی سیاسی و مەراسیمە ئاینیەکان و بازرگانی و خاوەن سوپایەکی ناوخۆی بۆ پارێزگاری کردن لە ئاسایشی هەرێمەکە ، لەلایەکی تریش صربیاش بە هەمان شێوەی هەردووی هەرێمەکەی تر بەستراوە بە دەوڵەتی عوسمانی بەلام لەژێر چاودێری کۆمەلگەی ئەوروپی[92] .

**دەوڵەتی عوسمانی دوای پەیماننامەی پاریس ١٨٥٦ :**

لەراستیدا پارمەتی دانی وولاتانی ئەوروپی بۆ دەوڵەتی عوسمانی دژ بە رووسیا لەجەنگی قەرم مەبەستی راستەقینەیان بریتی نەبوو لە پالپشتی کردن لە وولاتێکی لاوازی وەك دەوڵەتی عوسمانی بەلکو هۆکارە راستەقینەکان بریتی بوون لە لاوازکردنی رۆلی رووسیا لەناوچەی رۆژهەلات وەهەروەها دانانی دەوڵەتی عوسمانی وەك بەربەستێك لەبەردەم فرەوانخوازیەکانی رووسیا لەرووی سیاسی و ئابووری ، هەرچەندە پەیماننامەی پاریس ١٨٥٦ز لەبەرژەوەندی دەوڵەتی عوسمانی بووە بەلام لەهەمان کاتدا وولاتە ئەوروپیەکان کە پێشتر دۆست وهاوپەیمانی سولتانی عوسمانی بوون بەلام لەژێرەوەش کارکردنی بەردەوامیان بۆ زیاتر لاواز کردنی ئەم دەسەلاتە لە رۆژهەلات کە لە رووی ئاین و نەتەوە جیاوازی لەگەڵ

وولاتانی ئەورووپی هەبووە ئەویش لە ڕێگای هاندانی ولایەتەکان کە سەر بە خۆیەکی ناخۆییان وەرگرتبوو لەژێر شکۆی دەوڵەتی عوسمانی کە لە بەندەکانی پاریس هاتبوو .

لەهەمان کاتدا وولاتانی ئەورووپا هەڵسان بە یارمەتی دانی هەرێمەکانی ( ئەفلاق و بغدان ) بۆ پێکهێنانی یەکێتیەك و دروست کردنی حکومەتێکی نیمچە سەربەخۆ کە ناسراوە بە حکومەتی میرنشینەکان کە خاوەن یەك ( ئەمیر) و ئەنجومەنێکی پەرلەمانی وە لەژێر چاودێری دەولی لە ( ١٩) ئابی ساڵی١٨٥٨ز وە هەلبژاردنی ( ئەلیبرنس کوزا )[٩٣] بە سەرۆکی هەرێمی پێکهاتوو ، وە دانپێدانانی سولتانی عووسمانی بەم حکومەتە تازەیە لەژێر فشاری وولاتانی ئەورووپی[٩٤] .

هەروەها دەوڵەتی عوسمانی دوای پەیماننامەی پاریس هەڵسا بە پەیڕەو کردن و دەرکردنی فەرمانی ( هەمایۆنی لە ساڵی ١٨٥٦ز) کە تیایدا هەڵسان بە گۆڕانکاری لە سیستەمی دەوڵەت و چاکسازی کردن هەرچەندە ئەم فەرمانە لە ئەنجامی فشاری وولاتانی ئەورووپی هاتە ئاراوە ، کە تیایدا وولاتانی ئەورووپی سوودمەندی گەورە بوون بۆ بە دەستهێنانی جیاوگەی زیاتر بۆ رەعیەتی خۆیان و دواتر هاندانیان دژ بە دەولەتی عوسمانی[٩٥] .

دەرکردنی فەرمانی (هەمایۆنی) لەلایەن دەولەتی عوسمانی زیاتر راکێشانی سۆزی وولاتە ئەورووپیەکان بوو بۆ لای خۆیان و هەروەها یارمەتی دانی دەولەتی عوسمانی لە هەر هێرشێکی رووسیای چاوەرانکراو[٩٦] .

سەبارەت بە گرنگترین چاکسازییەکان کە لە فەرمانی ( هەمایۆنی ) بە دیار دەکەوێت :-

١- پێویستی و دۆزینەوەی زەمانەتێکی دیاری کراو بۆ پارێزگاری کردن لە ژیـان و شـەرەف و مومتەلـەکاتی هـەموو رەعیەتـەکانی دەسـەلاتی عوسمانی.

٢- هەروەها دۆزینەوەی سیستەمێکی جێگیر بۆ باج.

٣- ئامادەکردنی سیستەمێکی دیاری کراو بـۆ سـەربازی کـە بـە شـێوەیەکی بەردەوام نەبێت بەڵکو ماوەی دیاری کراو بێت لە ٤ ساڵ تاکو ٥ ساڵ.

٤- ئەمەش یەکـەمین مەرسـومی سـوڵتانە کـە جـۆرە یەکسانیەك لـە نێـوان هەموو رەعیەتەکانی دادەنێت بەرامبەر بە قانوون ئەمەش بووە هۆکارێك کە موسڵمانان و پارێزگارەکان قبوولی نەکەن.

٥ – هـەروەها هـەڵگرتنی سـزای لەسـێدارەدان لەسـەر ئـەو کەسـانەی کـە هەڵگەراونەتەوە لە ئاینی ئیسلام[٩٧]

ئەم فەرمانەش کاردانەوەی خراپی لە سەر دەولەتی عوسمانی هەبووە بە تایبـەتی لەسـەر هەرێمـەکانی ژێـر دەسـەلاتی چـونکە بـووە هۆکارێـك بـۆ دەربرینـی نـارەزایی لەلایـەن موسـلمانانی هەرێمەکـە کـە زۆربـەیان خـاوەن دەسەلات و مولکدای زەوی بوون ، لەلایەکی تر نارەزایی نەسرانیەکان روو لە زیادی کرد ، چونکە پێیان وابوو دەولەتی عوسمانی کەم تەرخەمی دەکات لە چاکسازیەکانی بۆیە هەرزوو هەرێمەکانی (سربیا و جبل اسود) بـە یارمـەتی وولاتانی زل هێز هـەوڵیان دا بـۆ دەسـتەبەرکردنی سـەربەخۆییەکی تـەواو وە جیابوونەوەیان بەشـێوەیەکی یـەکجاری لـە دەولـەتی عوسـمانی وەهـەروەها هەولدانیان بۆ چاندنی تۆی دووبەرەکی لە بۆسنەو هرسك[٩٨] .

هەرچی هەرێمی (بۆسنەو هرسك)ە پێك دێت لە ناوچەیەكی شاخاوی سەرنج راكێش ، وە ئەم هەرێمە سنوری باكوری رۆژئاوای دەولەتی عوسمانی بووە لەگەڵ ئەوروپا وە لەسەردەمی سولتان بایەزیدی دووەم ( ١٤٨١ — ١٥١٢ ز ) ئەم هەرێمە كەوتە ژێر شكۆی دەولەتی عوسمانی كە رێژەی دانیشتوانی لە سالی ١٨٧٥ز ( ١/٢٠٠/٠٠٠ ملیۆن ) كەس بووە ، كە نیوەی زیاتری موسلمان بونە بەشەكەی تریش نەسرانی بوونە لە هەردوو مەزهەبی كاسۆلیك و ئەرسۆدۆكس ، هەروەها پەیرەوكردنی سیاسەتی كۆكردنەوەی باج لەلایەن دەولەتی عوسمانی رێگایەكی تر بوو بۆ زیاتر وورووژاندنی هەستی نارەزایی لە ناومیللەتانی بەلقان ، چونكە دەولەتی عوسمانی بۆ ئەم مەبەستە باجی ناوچەكەی لە كەسێك وەردەگرت دواتر ئەم كەسە هەلدەستا بە كۆكردنەوەی باج بە شێوەیەكی زیاتر لە خەڵكەكە ئەم كەسەش ناسراوە بە (ملتزم ) كە زیاتر باری سەرشانی خەلكی قورستر دەكرد ئەمەش كاردانەوەی خراپی لە سەر سیستەمی دەسەلاتی عوسمانی دروست كرد، بووە هۆكارێك بۆ بەرز بوونەوەی دەنگی نارەزایی و یاخی بوون لە دەسەلاتی عوسمانی[٩٩] .

سەبارەت بە هەرێمی بۆسنە و هرسك راپەرین تێدا سەری هەلدا هەرچەندە دەسەلاتدارانی هەرێمەكە كە سەر بە دەولەتی عوسمانی بوون رووبەرووی راپەرینەكە بوونەوە بۆیە ژمارەیەك لە سەركردەكانی راپەرین روویان لە نەمسا كرد بۆ ئەوەی پالپشتیان بكات وە لە ئاكامدا نەمسا یاداشتێكی ئاراستەی بالوێزی دەولەتی عوسمانی كرد لە ڤیینا دواتر گەیاندرایە سولتان عبدالمجیدی یەكەم كە دەست نەخاتە ناوكاروباری هەرێمەكە بە پێی بەندەكانی پاریس[١٠٠] .

وەخـــراپ بـــوونی بـــارودۆخی دەوڵـــەتی عوسمـــانی لـــە ئـــەنجامی دەستێوەردانەکانی ولآتانی ئەورپا لەو کاتەی کە لە هەوڵی ئەوە دابوو کە سوپا بنێرێ بۆ بۆسنەو هرسك بەمەبەستی دامرکاندنـەوەی راپەڕینـەکانی بەلآم هێزە دەریاییەکانی فەرەنساو رووسیا لـە ساڵی ١٨٥٨ گەیشتە (جبل اسود) بە مەبەستی رێگا گرتن لـە چوونە ژوورەوەی هێزەکانی دەولـەتی عوسمانی بۆ دامرکانەوەی راپەرینەکان[١٠١] .

سەبارەت بە سربیاش کە دەولەت عوسمانی لە سالی ١٨٢٩ دانپێدانی سەربەخۆیی ناوخۆی پێدابوو ، بەلام ئەم هەرێمەش دوای فـەرمانی همایونی بە تایبەتی لەرێگای هاندانی رووسیای تـەزاری هەستان بـە دروست کردنی رێکخراوێکی نەهێنی چەکداری کە لە سالی ١٨٦٢ لـە بلغراد دەمـەزرا ناسراو بە ( لێژنەی سربی — بۆسنی ) کە لە گرنگترین ئامانجیان کارکردن بۆ دانانی رێو شوێنی گونجاو دژ بە دەولەتی عوسمانی هەروەها کارکردن بۆ راکێشانی بۆسنەوهرسك بۆ ناو سربیا[١٠٢] .

هەروەها هاندانی بلغاریا لەلایـەن رووسـیا رۆمـا نەمسا و سـربیا دژ بـە دەولەتی عوسمانی ، ناکرێت رۆلی رووسیاو دەزگاکانی رۆشنبیری لـە هانـدانی بزاڤی سلاڤی لە یاد بکرێت ، هەرچـەندە دەولـەتی عوسمـانی دوای فـەرمانی هـەمایۆنی چاکسازیەکانی لـەم هەرێمـە بـە تایبـەتی رۆلی مـدحت پاشـا بـۆ چاککردنی باری ئابووری هەرێمەکەو لە هەمان کاتیش دا دەولەتی عوسمـانی رێگای بە سەربەخۆیی کلێسەی دا بـەم هەرێمـەو جیابوونـەوەی لـە بـەتریکی ئیغریقی و رۆمانی کە ئەمەش مەبەستی سـەرەکی بلغاریـەکان بـوو لـە پێنـاو سەربەخۆیی نەتەوەییان ، لەگەلّ ئەمانەش ئەم هەرێمە لـە هـەولی زۆر دابـوو

لە ژێر شکۆی دەولەتی عوسمانی دەربچێت ، بۆ ئەم مەبەستەش جیورجی راکوفیسکی ( ١٨٢١ز – ١٨٦٧ز ) داوای لە بلغاریەکان کرد بۆ دامەزراندنی رێکخراوی نهێنی چەکداری و کارکردنیان بۆ رزگاربوون لە دەولەتی عوسمانی هەربۆیەش هەندێ کەس بە دامەزرێنەری بزوتنەوەی رزگاریخوازی بلغاریا ناوزەدی دەکەن[١٠٣] .

هەر بۆ ئەم مەبەستەش فاسیل لیفسکی توانی لە سالی ١٨٦٢ یەکەم رێکخراوی نهێنی چەکداری لە بلغاریا بە یارمەتی دەسەلاتدارانی سربیا و جبل ئەسوەد کە هەموو جۆرە یارمەتیەکیان پێشکەش کرد بەلام دواتر دەولەتی عوسمانی توانی سەرکردایەتی ئەم ریکخراوە لە نزیك سۆفیا دەستگیر بکات و لە ١٩ شوباتی سالی ١٨٧٣ز لە سیدارە درا[١٠٤] .

لەلایەکی تر رووداوەکانی شاری ( جەددە ) بە شێوەیەکی ئاشکرا رۆلی ئەوروپیەکان دەخاتە روو لە دیاریکردنی مەرامەکانیان کە بەرجەستە دەبوو لە لاوازکردنی دەولەتی عوسمانی لە کاتێکدا شەڕێکی توند لەم شارە لە نێوان موسلمانان و مەسیحیەکان هاتە ئاراوە کە تیایدا زۆر کەس کوژران و بریندار بوون لەوانە قونسولی فەرەنسا کوژرانی خێزانی قونسول هەروەها بریکاری قونسولی بەریتانیا بۆیە بەریتانیەکان و فەرەنساییەکان زۆر بەتوندی داوای دەستگیرکردنی تۆمەتبارانی کردەوەکانیان کرد ، بەلام کەشتیگەلی فەرەنسا و بەریتانیا بێ گوێ دانە دەولەتی عوسمانی کەوتنە بەر بۆردومانی کردنی شارەکە بۆ ماوەی بیست کاتژمێر تاکو ئەو کاتەی مەندوبی عوسمانی اسماعیل پاشا گەڕاندنیەوە بۆ ( جەددە ) و بریاری لە سێدارەدانی بۆ ئەنجامدەرانی کردەوەکە دا[١٠٥] .

لێرەدا بە روونی قۆناغی دووەم لە کێشەی رۆژهەلاتی دەردەکەوێت چونکە رووسیا لە دوای جەنگی قەرم دوورکەوتەوە لە هەولە فرەوانخوازەکانی و ئەمجارەیان هەریەکە لە بەریتانیاو فەرەنسا بە شێوەیەکی کاریگەر هاتنە ناو کێشەکە ئەگەر لەسەرەتادا وەك دۆستێکی دەولەتی عوسمانی بوون بەلام لەم قۆناغە دوای نەمانی مەترسی رووسیا دەستیان کرد بە دەست تێوەردان لە کێشە ناوخۆییەکانی عوسمانی بە تایبەتی هەرێمە نەسرانیەکان و دواتر گۆران لە هەلوێستیان کە وەك نێچیرێکی ئاسان سەیری دەولەتی عوسمانیان دەکرد و کەوتنە بەر دابرینی زۆر لە ناوچەکانی دەولەتی عوسمانی کە خزمەت بە بەرژەوەندی سیاسی و ئابوریان دەگەیەنێ .

چوارەم / دەرئەنجامەکانی جەنگی قەرم :

جەنگی قەرم ماوەی سێ سالی خایاند دواتر کۆتایی بە جەنگەکە هات لە رێگای بەستنی پەیماننامەی پاریس لە سالی ١٨٥٦ز ، لە دیارترین ئەنجامەکانی جەنگی قەرم ، بووە هۆکارێك بۆ تێکشکان و دارمانی هاوپەیمانیەتی نێوان رووسیای تەزاری و ئیمپراتۆریەتی نەمسا ، کە پێش هەلگیرسانی جەنگی قەرم هەردوو وولات لە هاوپەیمانیەکی توندو تۆلیان هەبووە و لە هەمان کاتدا یارمەتی دەری یەکتر بوونە بۆ پارێزگاری کردن لە سیستەمی رەهای پاشایەتی و دژی هەرجوولانەوەیەکی جوداخوازی بوونە کە دژ بە سیستەمی رەهای ئەوان بێت ، هەروەها یارمەتی دانی رووسیای تەزاری بۆ نەمسا دژی جوداخوازەکانی مەجەر لەسالی ١٨٤٨ز[١٠٦] .

لە لایەکی تر جەنگی قەرم رێگای والآ کرد و باردۆخێکی گونجاوی هێنا ئاراوە بۆ سەربەخۆی و ئازادی چەند نەتەوەیەك وەك ( ئیتالیا و ئەلمانیا ) کە لە سالانی ١٨٦٠ز توانیان مەبەستەکانیان بە جێ بگەیەنن ، هەروەها شکست خواردنی رووسیای تەزاری لە جەنگی قەرم کە تیایدا رووسیا گەورەترین زەرەرمەندی جەنگەکە بوو ، دواتر بۆ ماوە ( ١٥ ) سالّ رووسیا دوورکەوتەوە لە کۆمەلگەی دەولی و وەرگرتنی جلەوی دەسەلات لەلایەن ئەسکندەری دووەم و بیرکردنەوەکانی بە تایبەتی هەولّدان بۆ باشترکردنی باردۆخی ناوخۆیی رووسیا و دورکەوتنەوەی لە کێشەو کاروبارەکانی ئەوروپا[١٠٧] .

سیاسەتمەدارانی رووسیای تەزاری دوای جەنگی قەرم (پەیماننامەی پاریس)یان بە نسکۆ بۆ رووسیای تەزاری دەزانی لە هەولی زۆردا بوون بۆ لە ناوبردنی ئەم پەیماننامەیە چونکە سیاسەتی رووسیا پێش سالانی ١٨٥٤ز بەرژەوەندییە نەتەوایەتیەکانیان پشت گوێ خست لە پێناو بەرژەوەندی و کێشەکانی ئەوروپا ، بەلام دواتر پاش شکست خواردنیان لە جەنگی قەرم هەلوەستەیان لە سیاسەتی خۆیان کرد بە شێوەیەك هەموو شتێکیان لە ئەوروپا پشت گوێ خست و تەنها گرنگی دان بە بەرژەوەندی نەتەوایەتی خۆیان ، وە گەیشتنە ئەو باوەرە کە تەنها لە دوو رێگاوە دەتوانن پارێزگای لە بەرژەوەندە نەتەوایەتیەکانیان بکەن ئەویش دەریای رەش کە تەنها بۆ مەبەستی بەرگری وە ئایندەی فرەوانخوازیەکانیان تەنها لە ئاسیا[١٠٨] .

جەنگی قەرم بووە هۆکارێك کە زیاتر لە ( ٢٥ هەزار ) کەس بوونە قوربانی ئەم جەنگە لە هەردوو لایەنی شەرکەر بە هۆی شەرە بەردەوامەکان

و خراپی باردۆخی ئاوهەواو بلاوبوونەوەی نەخۆشی کۆلێرا[109]. گواستنەوەی هەوالەکانی جەنگی قەرم لە رێگای رۆژنامەوانە سەربازیەکان لە بەرەکانی شەر و بووە هۆی وورووژاندنی رای گشتی ئەورووپی ، ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ دروست کردنی رێکخراوی نێو دەولەتی ( رێکخراوی خاچی سوور ) کە لە رێکەوتنامەی جنێف لە سالی ١٨٦٤ بریاری لەسەر درا ، لەلایەکی تر دانانی رێی و شوێنی یاسای نێودەولەتی بۆ ئابلۆقە ئابووریەکان و رێ گرتن لە کاری چەتەی دەریایی[110].

پەراوێزەکان:

[١] محمد حسين هيكل: الشرق الجديد، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، بدون تاريخ، ص ص١٥-١٨.

[٢] حسين لبيب: تاريخ المسألة الشرقية، القاهرة، ١٩٤١، ص٤ .

[٣] امال السبكي :اوروبا في القرن التاسع عشر ، الطبعة الاولى ، جدة ، ١٩٨٥ ، ص ١٩١ .

[٤] هاشم صالح تكريتي : المسألة الشرقية ، المرحلة الاولى ١٧٧٤ – ١٨٥٦ ، بغداد ، ١٩٩٠ ، ص٢١ .

[٥] شوقي عطا الله الجمل و عبدالله عبدالرزاق ابراهيم : تاريخ اوروبا من النهضة حتى الحرب الباردة ، المكتب المصري ، القاهرة ، ٢٠٠٠ ، ص٢١٣.

[٦] محمد حسين هيكل :المرجع السابق ، ص٢٥٤

[٧] فليب حتي: موجز تاريخ الشرق الادني ، ترجمة : انيس فريحة ، بيروت ، ١٩٦٥ ، ص٢٤٠-٢٤١ .

[٨] كارل براون :السياسة الدولية والشرق الاوسط ، ترجمة : عابد جابر ، ١٩٧٢ ، ص٢٦ .

[٩] امال السبكي : المرجع السابق ، ص١٩٢ .

[١٠] هاشم صالح تكريتي : المرجع السابق ، ص٢٠-٢١

[١١] فاضل حسين و كاظم هاشم :تاريخ اوروبا ١٨١٥ – ١٩٣٩ ، الطبعة الاولى ، بغداد ، ١٩٨٢ ، ص ٥٢-٥٣ .

[١٢] کلامنس میترنخ سیاسەتمەداری نەمساوی ( ١٧٧٣ – ١٨٥٩ ) لە دایک بووی کۆبلانس ، وەزیری دەرەوەی نەمسا دوای شکانی وولاتەکەی بەرامبەر بە هێرشەکەی ناپلیۆن وە سەرکردایەتی وولاتەکەی کردووە بۆ بەستنی هاوپەیمانی لەگەڵ رووسیاو بروسیا دژ بە ناپلیۆن وە ئەندازیاری کۆنگرەی ڤیێننا بووە لەگەڵ ئەوەش دژ بە

بزووتنەوەی نەتەوەیی دیموکراتی بووە دوای سەرهەڵدانی شۆرش لە وولاتەکەی لە سالی ١٨٤٨ – ١٨٤٩ دەچێتە لەندەن وە لەسالی ١٨٥٦ دەگەرێتەوە نەمسا وە لەسالی ١٨٥٩ کۆچی دوایی دەکات ، بروانە :

عبدالوهاب الكيلاني و كامل زهيري : الموسوعة السياسية ، بيروت ، ١٩٧٤ ، ص٤٨٤ .

(١٣) پەیماننامەیەك بوو لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و رووسیای تەزاری بەستر ، بە پێی ئەم پەیماننامەیە رووسیا بووە خاوەن جیاوگەی زۆر گرنگ لە ناودەولەتی عوسمانی هەروەها وازهێنانی ناوچەیەکی زۆر لە قەفقاس لەلایەن دەولەتی عوسمانی ، ئازادی هاتوچۆی کەشتیگەلی رووسیا لە دەردەنیل و وەرگرتنی ماف بە پارێزگاری کردن لە رەعیەتەکانی ئەرسۆدۆکسی لە ناودەوڵەتی عوسمانی ، بروانە :

جورج لنشوفسكي : الشرق الاوسط في الشؤون العالمية ،ترجمة ، جعفر الخياط ، الجزء الاول ، بغداد ، ١٩٦٤ ، ص٢٩ .

(١٤) کامەران مەحەمەد حاجی :کوردستان لە بازنەی کێشەی رۆژهەلاتیدا ١٨٠٠ – ١٩٠٠ ، چاپخانەی رۆشنبیری ، هەولێر ، ٢٠٠٧ ، ل ١٠ – ١١

(١٥) هاشم صالح تكريتي : المرجع السابق ، ص٢٢ – ٢٣ .

(١٦) امال السبكي : المرجع السابق ، ص ١٩١–١٩٢

(١٧) علي حيدر سليمان :تاريخ الحضارة الاوروبية الحديثة ، بغداد ، ١٩٩٠ ، ص ٣١٢–٣٢٢.

(١٨) شوقي عطا الله الجمل و عبدالله عبدالرزاق ابراهيم : المرجع السابق ، ص ٢١٣ – ٢١٤.

(١٩) ميشال دوفير : اوروبا والعالم في نهاية القرن الثامن عشر ، ترجمة ، الياس مرقص ، بيروت ، ١٩٨٠ ، ص ٥٣ " حسين لبيب : المرجع السابق، ص ٦ – ٢٥ .

(٢٠) محمد انيس : الدولة العثمانية والشرق العربي ١٥١٤ – ١٩١٤ ، دار الجيل، بيروت، ص ١٠١ .

(٢١) فليب حتي : المرجع السابق، ص٢٣٤.

(٢٢) ابو الحسن على الحسنى الندوى :ماذا خسر العالم بأنحطاط المسلمين، قاهرة ، ١٩٩٠ ، ص ٢١٠

(٢٣) ابو الحسن على الحسنى الندوى : المرجع نفسه ، ص٢١٤ .

(٢٤) موفق بنى المرجة: صحوة الرجل المريض أو السلطان عبدالحميد والخلافة الإسلامية، كويت ، ١٩٩٨ ، ص٤٣ " حسين لبيب : المرجع السابق ، ص ٧ — ٨ .

(٢٥) روبرت . ر . بالمر : تاريخ العالم الحديث ، ترجمة : محمدحسين الامين ، الجزء الاول ، الطبعة الثانية ، موصل ، ١٩٦٤، ص٣٢٢ .

(٢٦) حسين لبيب : المرجع السابق ، ص ٨— ٩ .

(٢٧) موفق بنى المرجة: المرجع السابق ، ص٤٩ .

(٢٨) حسين لبيب : المرجع السابق ، ص١٢ .

(٢٩) محمد انيس : المرجع السابق ، ص١٦٥ .

(٣٠) حسين لبيب : المرجع السابق ، ص ٣١ .

(٣١) هاشم صالح التكريتى : المرجع السابق ، ص ١٧—١٨ .

(٣٢) پەترۆسی گەورە ( ١٦٨٢ — ١٧٢٥ ) لەسەردەمی ئەم تەزارە رووسیا سنوورەکەی لە رۆژئاواو باشور فرەوان بوو ، چەندها قەلاو قایمکاری دەوڵەتی عوسمانی داگیر کرد لەوانە قەلای ( ئازوف ) هەروەها گرنگی دان بە رێکخستنی سوپاو کارگێری و خوێندن وە هەروەها گرنگی زۆری داوە بە داب و نەریتی رۆژئاوایی و دروست کردنی شاری (سان پەترۆسبۆرگ) دواتر بوو بە پایتەختی رووسیا و وە لە گرنگترین هەوڵەکانی گەیشتن بە ئاوە گەرمەکان و دەریای ناوەراست، بۆ زیاتر زانیاری بروانە :

بسام العسلي : بطرس الكبير ، بيروت ، ١٩٨٢؛ محمد محمد صالح : تاريخ اوروبا من عصر النهضة الى ثورة الفرنسية ١٥٠٠ — ١٧٨٩ ، بغداد ، ١٩٨٢ ، ص ٤١١ .

(٣٣) حسين لبيب : المرجع السابق ، ص ٢٣–٢٤ " موفق بني المرجة: المرجع السابق ، ص ٤٣ .

(٣٤) جورج لنشوفسكي : المرجع السابق ، ص٢٥–٢٧ "محمد كمال الدسوقي ، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية ، دار الثقافة ، القاهرة ، ١٩٧٦، ص ٢٥٨ .

(٣٥) حسين لبيب : نفس المرجع ، ص ٥٨ " محمد انيس : المرجع السابق ، ص ١٦٧–١٦٨ .

(٣٦) مصطفى خالدى و عمر فروخ : التبشير والاستعمار ،المكتبة العصرية ، ١٩٨٦ ، ص ٤٧ .

(٣٧) فاضل فوزى و عادل اسماعيل : السياسة الدولية في الشرق العربي ١٧٨٩–١٩٥٨ ، بيروت، ١٩٥٩، ص١٩–٢٠ .

(٣٨) محمد فريد بك : تاريخ الدولة العلية العثمانية ، دار الجيل ، بيروت ، ١٩٧٧ ، ص ٩١ " ز . غ . هرشلاغ : مدخل الى التاريخ الاقتصادي الحديث لشرق الاوسط ، ترجمة ، مصطفى الحسيني ، بيروت ، ١٩٧٣ ، ص ٦٢.

(٣٩) محمد رجائي ريان: مصالح فرنسا الاقتصادية في سورية ١٥٣٥ – ١٩٢٠ ، مجلة دراسات التاريخية، عددان ٢٧ – ٢٨، دمشق، ١٩٨٧، ص٤٠ .

(٤٠) ابراهيم شريف : الشرق الاوسط دراسة الاتجاهات سياسة الاستعمار حتى قيام ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق ، بغداد ، ١٩٦٥، ص ٤٨ .

(٤١) محمد رجائي ريان: المرجع السابق ، ص ٤٢ .

(٤٢) محمدكمال دسوقي : المرجع السابق ، ص ٢٢٠ " محمد انيس : المرجع السابق ، ص ١٦٧

(٤٣) موفق بني المرجة: المرجع السابق ، ص ٧٥ .

(٤٤) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعنعي : تاريخ اوربا المعاصر من ثورة الفرنسية الى الحرب العالمية الثانية ، دار النهضة العربية ، بيروت ، ١٩٨٦ ، ص ٢٣١ .

(٤٥) عمر عبدا لعزيز عمر : تاريخ اوروبا الحديث والمعاصر ١٨١٥ – ١٩١٩ ، دار المعرفة الجامعية ، بيروت ، ١٩٩٥ ، ص ١٥٧ .

(٤٦) عبدالعزيز سليمان : تاريخ الحديث للشعوب الاسلامية ، دار النهضة العربية ، بيروت ، ١٩٩١ ، ص ١٩٠ .

(٤٧) كارلتون هيز: تاريخ الأوربي الحديث ، ترجمة : فاضل حسين ، بغداد ، ١٩٨٧ ، ص ٢٠٨ .

(٤٨) خيرية قاسمية: تاريخ اوربا المعاصروالحديث ، الطبعة الثالثة ، جامعة دمشق ، دمشق ، ١٩٩٣ ، ص١٠٧

(٤٩) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعنعي : المرجع السابق ، ص٢٣٢ – ٢٣٤.

(٥٠) احمد عبدالرحيم مصطفى : في اصول التاريخ العثماني ، دار الشروق ، بيروت ، ١٩٨٦، ص ١٢٨.

(٥١) ميلاد مقرحي : التاريخ الأوربي الحديث والمعاصر ، الجامعة المفتوحة ، طرابلس ، ١٩٩٥ ، ص ١٢٨.

(٥٢) محمد فريد بك محامي : المرجع السابق ، ص ٢٦٣ .

(٥٣) احمد عبدالرحيم مصطفى : المرجع السابق ، ص٢٠٨ – ٢٠٩ .

(٥٤) محمد فريد بك محامي : المرجع السابق ، ص٢٦٣

(٥٥) عمر عبدالعزيز عمر : المرجع السابق ، ص١٣٩

(٥٦) باڵویزی بەریتانیا لە ئەستانە کە بە هێزترین و چالاکترین باڵوێز لەو سەردەمە هەژماردەکرێت بە تایبەتی لە ساڵی ١٨٤٨ بەشێوەیەك کە کۆشکی سوڵتانی و باب ئەلعالی زۆر گرنگیان پێداوەو بە سولتان ( ستراتفۆرد ) ناسرابوو، ئەم بالوێزە زۆر گرنگی داوە بە پارێزگاری کردن لە دەوڵەتی عوسمانی وە رۆڵی گرنگی گێراوە لە راکێشانی بەریتانیاو فەرەنسا بۆ پاڵپشتی کردن لە دەوڵەتی عوسمانی دژ بە رووسیای تەزاری ، بروانە :

– نجيب صالح : تاريخ العرب السياسي ١٨٥٦ – ١٩٥٦ ، الطبعة الثالثة ، دار اقرأ ، بيروت ، ١٩٩٢ ، ص٥١ .

(٥٧) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعني : المرجع السابق ، ص ٢٣٤ .

(٥٨) عمر عبدالعزيز عمر : المرجع السابق ، ص١٣٩ .

(٥٩) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعنعي : المرجع السابق ،ص ٢٢٤ .

(٦٠) عبدالعزيز سليمان : المرجع السابق ، ص١٩٠ .

(٦١) احمد عبدالرحيم مصطفى : المرجع سابق ، ص ٢٠١ .

(٦٢) امال السبكي: المرجع السابق " ص٢٠٦ — ٢١٠ " محمود على عامر : تاريخ الدولة العثمانية ، جامعة دمشق ، دمشق ، ٢٠٠٣ — ٢٠٠٤، ص١٩٠-١٩٣.

(٦٣) خيرية قاسمية: المرجع السابق ، ص١٠٨ " على حسون : تاريخ الدولة العثمانية و علاقاتها الخارجية ، الطبعة الرابعة ، المكتب الاسلامى ، بيروت ، ٢٠٠٢ ، ص١٨٨.

(٦٤) ميلاد مقرحى : المرجع السابق ، ص١٢٣ .

(٦٥) جوزيف حجار : اوروبا ومصير الشرق العربي ، ترجمة ، بطرس الحلاق ، بيروت ، ١٩٧٦ ، ص ٦٨-٩٩ " بيير رنوفان : تاريخ العلاقات الدولية في القرن التاسع عشر ١٨١٥ — ١٩١٤ ، ترجمة ، جلال يحيى ، القاهرة ، ١٩٨٠ ، ص ١٢٨-١٤٨.

(٦٦) محمد فريد بك محامى : المرجع السابق ، ص٢٦٤.

(٦٧) محمد كمال دسوقى : المرجع السابق ، ص١٩٩ .

(٦٨) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعنعي : المرجع السابق ، ص ٢٣٥.

(٦٩) خيرية قاسمية: المرجع السابق ، ص١٠٧ .

(٧٠) خيرية قاسمية: المرجع السابق ، ص١٠٧ .

(٧١) محمد سيد سليم : تطور السياسة الدوليةفي القرنين ١٩ — ٢٠ ، الطبعة الثانية ، دار الفجر ، قاهرة ، ٢٠٠٤ ، ص١١٣.

(٧٢) سەرکردەیەکی بە ناوبانگی دەوڵەتی عوسمانی بە رەگەز نەمساوی لە دایك بووی کرواتیا لە سالی ١٨٠٦ زاینی ، ماوەیەك خزمەتی سەربازی لە سوپای نەمسا کردووە دواتر کۆچ دەکات بۆ بۆسنە لەوێش دەبێتە موسلمان وە لە ناوسوپای عوسمانی دەگاتە پلەیەکی بەرزی سەربازی وە لەسالی ١٨٧١ کۆچی دوایی کردووە .

(٧٣) علي سلطان:تاريخ الدولة العثمانية، المكتبة العلمية العالمية، طرابلس، بدون تاريخ، ص٢٩٦-٢٩٧.

(٧٤) أمير شكيب ارسلان : تاريخ الدولة العثمانية ، الطبعة الاولى ، دار ابن كثير ، دار التربية ، دمشق ، ٢٠٠١ ، ص٢٩٥ .

(٧٥) علي سلطان : المرجع السابق ، ص٢٩٦-٢٩٧ .

(٧٦) أمير شكيب ارسلان : المرجع السابق ، ص٢٩٥ - ٢٩٦

(٧٧) وديع ابوذنون: تاريخ الامبراطورية العثمانية من التأسيس الى السقوط ، الطبعة الاولى ، الاهلية ، عمان ، ٢٠٠٣، ص٢٥٦-٢٥٧ .

(٧٨) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعنعي : المرجع السابق ، ص٢٣٩ - ٢٤٠ .

(٧٩) محمد سيد سليم : المرجع السابق ، ص١١٣- ١١٤ .

(٨٠) احمد عبدالرحيم مصطفى : المرجع السابق ، ص ٢١٩ .

(٨١) وديع ابو ذنون: المرجع السابق ، ص٢٥٨.

(٨٢) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعنعي : المرجع السابق ، ص٢٤٠ .

(٨٣) خيرية قاسمية: المرجع السابق ، ص١١٠" وديع ابو ذنون : المرجع السابق ، ص٢٥٨.

(٨٤) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعنعي : المرجع السابق ، ص٢٤٠ .

(٨٥) احمد عبدالرحيم مصطفى : المرجع السابق ، ص٢١٠ " خيرية قاسمية: المرجع السابق ، ص ١٠٩-١١٠ .

(٨٦) عبدالعزيز سليمان : المرجع السابق ، ص ١٩٢ .

(٨٧) أ .ج.ب. تايلر : صراع على السيادة ،ترجمة ، كاظم هاشم نعمة و يوئيل يوسف عزيز ، بغداد ، ١٩٨٠ ، ص١١٧ .

(٨٨) وديع ابو ذنون : المرجع السابق ، ص ٢٩٥ .

(٨٩) اسماعيل احمد ياغي : الدولة العثمانية في التاريخ الاسلامي الحديث ، الطبعة الثانية ، مكتبة العبيكان ، ١٩٩٨ ، ص ١٣٥ .

(٩٠) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعني : المرجع السابق ، ص ٢٤١ .

(٩١) شوقي عطا الله الجمل و عبدالله عبدالرزاق ابراهيم : المرجع السابق ، ص ٢١٧ .

(٩٢) علي حسون : المرجع السابق ، ص ١٩٤ .

(٩٣) سیاسەتمەداری رۆمانی لە دایك بووی سالی ١٨٢٠ زایینی وە توانی بگاتە پلەی عەقید لە سوپای بەغدان دواتر هەلبژێردرا بە ئەمیری هەردوو ولایەتی ئەفلاق و بەغدان وە لەسالی ١٨٦٧ دەستی لەکار کێشاوە .

(٩٤) وديع ابو ذنون : المرجع السابق ، ص ٢٦٠ .

(٩٥) علي حسون : المرجع السابق ، ص ١٦٩ .

(٩٦) احمد عبدالرحيم مصطفى : المرجع السابق ، ص ٢١٣ .

(٩٧) اسماعيل احمد ياغي : المرجع السابق ، ص ١٣٧ .

(٩٨) وديع ابو ذنون : المرجع السابق ، ص ٢٦٢ " عبدالحميد ياسين الغريري : يوغسلافيا الارض والانسان ، بغداد ، ١٩٨٩ ، ص ٨٤ .

(٩٩) محسن حمزة حسن حسين : الازمة البلقانية ١٨٧٥ — ١٨٧٨دراسة في السياسة العثمانية والدبلوماسية الاوروبية ، اطروحة دكتوراه غير منشورة قدمت الى مجلس كلية التربية ، قسم التاريخ ،جامعة الموصل ، ٢٠٠١ ، ص ٦٢ .

(١٠٠) محسن حمزة حسن حسين : المرجع السابق ، ص ٦٢ .

(١٠١) وديع ابو ذنون : المرجع السابق ، ص ٢٦٠ .

(١٠٢) انس ابراهيم خلف : البوسنة ١٩٠٨ –١٩٠٩ ، رسالة ماجستر غير منشورة قدمت الى مجلس كلية الاداب ، قسم التاريخ، جامعةبغداد، ١٩٩٨، ص ٩ .

(١٠٣) محسن حمزة حسن حسين : المرجع السابق ، ص ٩٤ – ٩٥ .

(١٠٤) بيير رنوفان : المرجع السابق ، ص٤٩٥ .

(١٠٥) وديع ابو ذنون : المرجع السابق ، ص .

(١٠٦) محمد سيد سليم : المرجع السابق ، ص١١٣– ١١٤ .

(١٠٧) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعنّي : المرجع السابق ، ص٢٤٠.

(١٠٨) أ .ج.ب. تايلر : المرجع السابق ، ص١٢٤.

(١٠٩) احمد عبدالرحيم مصطفى : المرجع السابق ، ص ٢١٩.

(١١٠) عبدالعزيز سليمان و عبدالمجيد نعني : المرجع السابق ، ص٢٤٢.

لیستی سەرچاوەکان :

**١ –سەرچاوە عەرەبی و وەرگێردراوە عەرەبیەکان( المراجع العربية والمعربة ):**

- احمد عبدالرحيم مصطفى ، في أصول التاريخ العثماني ، ( بيروت – ١٩٨٦ م ) .
- أمير شكيب أرسلان ، تاريخ الدولة العثمانية ، ط١ ، ( دمشق – ٢٠٠١ ) .
- اسماعيل احمد ياغي ، الدولة العثمانية في التاريخ الاسلامي الحديث ، ط٢ ، ١٩٩٨ م .
- امال السبكي ، اوربا في القرن التاسع عشر ، ط١ ، ( جدة – ١٩٨٥ م ) .
- أ ، ج ، ب ، تايلر ، صراع على السياده ، ترجمة كاظم هاشم نعمة و يوئيل يوسف عزيز ، ( بغداد – ١٩٨٠ م ) .

- ابراهيم شريف ، الشرق الاوسط دراسة اتجاهات سياسة الاستعمار حتى قيام ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق ،( بغداد – ١٩٦٥ م ) .
- بيير رنوفان : تاريخ العلاقات الدولية في القرن التاسع عشر ١٨١٥ – ١٩١٤ ، ترجمة ، جلال يحيى، القاهرة ، ١٩٨٠ .
- جوزيف حجار : اوروبا ومصير الشرق العربي ، ترجمة ، بطرس الحلاق ، بيروت ، ١٩٧٦
- جورج لنشوفسكي : الشرق الاوسط في الشؤون العالمية ،ترجمة ، جعفر خياط ، جزء الاول ، بغداد ، ١٩٦٤ .
- ابو الحسن على الحسنى الندوي ، ماذا خسر العالم بأنحطاط المسلمين ، ( قاهرة – ١٩٩٠ ) .
- حسين لبيب ، تاريخ المسألة الشرقية ، ( قاهرة – ١٩٤١ م ) .
- خيرية قاسميه ، تاريخ اوروبا المعاصر والحديث ، ط٣ ، ( دمشق – ١٩٩٣ م ) .
- روبرت ، ر ، بالمر ، تاريخ العالم الحديث ، ترجمة محمود حسين امين ، ط٢ ، ( موصل – ١٩٦٤ ) .
- ز . غ . هرشلاغ : مدخل الى التاريخ الاقتصادى الحديث للشرق الاوسط ، ترجمة ، مصطفى الحسينى، بيروت ، ١٩٧٣ .
- شوقى عطاالله الجمل – عبدالله عبدالرزاق ابراهيم ، تاريخ اوربا من النهضة حتى الحرب الباردة، ( قاهرة – ٢٠٠٠ م ) .
- على حسون ، تاريخ الدولة العثمانية وعلاقاتها الخارجية ، ط٤ ، المكتب الاسلامى ، بيروت ، ٢٠٠٢ .
- عبدالوهاب الكيلاني و كامل زهيرى : الموسوعة السياسية ، بيروت ، ١٩٧٤ .
- على حيدر سليمان ، تاريخ الحضارة الاوروبيه الحديثه ، ط١ ، ( بغداد – ١٩٩٠ م ) .
- علي سلطان ، تاريخ الدولة العثمانية ، ( طرابلس – بدون تاريخ ) .

- عبدالحميد ياسين الغريرى : يوغسلافيا الارض والانسان ، بغداد ، ١٩٨٩ .
- عبدالعزيز سليمان نوار ، التاريخ الحديث للشعوب الاسلامية ، ( بيروت – ١٩٩١ م ).
- عبدالعزيز سليمان نوار و عبدالمجيد نعنعي ، التاريخ المعاصر لأوروبا من ثورة الفرنسية الى حرب العالمية الثانية ، ( بيروت – ١٩٨٦ م ) .
- عمر عبدالعزيز عمر ، اوروبا ١٨١٥ – ١٩١٩ ، ( بيروت – ١٩٩٥ ) .
- فاضل فوزى – عادل اسماعيل ، السياسة الدولية في الشرق العربي ١٧٨٩ – ١٩٥٨ ،( بيروت – ١٩٥٩ ) .
- فليب حتى ، موجز تاريخ الشرق الادنى ، ترجمة انيس فريحه ، ( بيروت – ١٩٦٥ م ) .
- فاضل حسين – كاظم هاشم نعمة ، التاريخ الاوروبى الحديث ١٨١٥ – ١٩٣٩ ، ( بغداد – ١٩٨٢ م ) .
- كارل براون ، السياسة الدولية والشرق الاوسط ، ترجمة عابد جابر ، ١٩٧٢ م .
- كارلتون هيز ، التاريخ الاوروبي الحديث ١٧٨٩ – ١٩١٤ ، ترجمة فاضل حسين ، ( بغداد – ١٩٨٧ ) .
- مصطفى الخالدي – عمر فروخ ، التبشير والاستعمار في البلاد العربية ، ( بيروت – ١٩٧٤ ) .
- محمد حسين هيكل ، الشرق الجديد ، ( القاهرة – بدون تاريخ )
- محمد فريد بك المحامي ، تاريخ الدولة العلية العثمانية ، ( بيروت – ١٩٧٧ م ) .
- محمد رجائى ريان، مصالح فرنسا الاقتصادية في السورية ١٥٣٥ – ١٩٢٠ ، مجلة الدراسات التاريخية، عددان ٢٧ – ٢٨ ، ( دمشق – ١٩٨٧ م ) .
- محمد سيد سليم ، تطور السياسة الدولية في القرنين ١٩ – ٢٠ ، ط٢ ، ( قاهرة – ٢٠٠٤ م ) .
- ميلاد مقرحي ، التاريخ الاوروبى الحديث والمعاصر ، ( طرابلس – ١٩٩٥ م ) .

- محمد كمال الدسوقي ، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية ، ( قاهرة – ١٩٧٦ م ) .
- نجيب صالح : تاريخ العرب السياسي ١٨٥٦ – ١٩٥٦ ، الطبعة الثالثة ، دار اقرأ ، بيروت ، ١٩٩٢ .
- وديع أبو زيدون ، تاريخ الأمبراطورية العثمانية من التأسيس الى السقوط ، ط١ ( عمان – ٢٠٠٣ م ) .
- هاشم صالح التكريتي ، المسألة الشرقية مرحلة الاولى ١٧٧٤ – ١٨٦٠ ، ( بغداد – ١٩٩٠ ) .

٢ – سەرچاوە کوردیەکان ( المراجع الكردية) :

- کامەران مەحەمەدحاجی ، کوردستان لە بازنەی کێشەی ڕۆژهەلاتی ١٨٠٠ – ١٩٠٠ ، چاپخانەی ڕۆشنبیری ، هەولێر ، ٢٠٠٧ .

٣ – نامە زانکۆییە بلاونەکراوەکان: الرسائل الجامعية (غير منشورة ) :

- محسن حمزة حسن حسين : الازمة البلقانية ١٨٧٥ – ١٨٧٨دراسة في السياسة العثمانية والدبلوماسية الاوروبية ، اطروحة دكتوراه غير منشورة قدمت الى مجلس كلية التربية ، قسم تاريخ ،جامعة الموصل ، ٢٠٠١.
- انس ابراهيم خلف : البوسنة ١٩٠٨ –١٩٠٩ ، رسالة ماجستر غير منشورة قدمت الى مجلس كلية الاداب ، قسم تاريخ ، جامعة بغداد ، ١٩٩٨ .

# نەوروز، زەردەشت، ئاستیاگ



سەید کەمال ئیبراهیمی

ئەم باسە تەرخان کراوە بۆ لێک جیاکردنەوەی سێ ناوی نەوروز، زەردەشت و ئاستیاگ کە زۆرجار لە نووسینی زۆرکەسدا وا هەست دەکرێ کە ئەم سێ ناوە پەیوەندی نزیک و گەرم و گوڕیان لە گەڵ هەیەو هەوڵ دەدەین لە روانگەیەکی تر ەوە باسی لێ بکەین.

ئەوەی راستی سروشتی گۆی زەوی بێت لە هەمووی گۆی زەوی، وەرزی بەهاری هەیە، بەڵام بۆ لای کورد سەرەتایی بەهار رێزێکی تایبەتی هەیە؟ زۆر لە گەلانی جیهان رێورەسمی نەتەوەیی و ئایینی لە بەهارو هاوین و زستان بەرێوە دەبن بەڵام نەوروز بۆ کورد جیاوازە.

زۆر لە مێژوو نووسان بە تایبەت ئەوانەی کە هەستێکی خاوێنیان بەرامبەر کوردو مێژووی کورد هەیە کاتێك ئاماژە بە ئەفسانەی زوحاك "ئاستیاگ" دەکەن ئاماژە بەوەش دەکەن کە ئەم باسە لە راستی بەدوورەو ئاماژە بەوە دەکەن کە سەردەمی زەردەشت زۆر لە پێش لە دەسەڵاتی دەوڵەتی مادو بەتایبەت ئاستیاگ بووە. بەڵام رێزگرتن لە نەوروز دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی هاتنی زەردەشت. "

جەژنی نەوروز لەوەی بەرپابوونی دینی زەردەشتی هاتووەتە مەیدان یان داهێنەری دینی زەردەشتی بووەو کۆڵەکەی گەورەی نیشانەکراوی دینی بووە، ئەگەرچی لای

ئەوان بەناوی "نوێبوونەوەی"گیانو گۆڕینی دنیای مادی بەرەو دنیای هەتاهەتایی بووە."[1] ئەم بیروبۆچوونە رەنگە هۆکاری بیروباوەڕی زەردەشتی کاریگەری لە سەری هەبووبێت بە تایبەت ئەو بەشە کە بیر لەوە دەکرێتەوە کە لەوانەیە رۆحی مرۆڤێك لە لەشی مرۆڤێکیتر بژی یان ئەوی پێ دەڵێن کراس گۆڕینو دۆنادۆنی، بەڵام بەشێك لەم زیندوو بوونەوە پەیوەندی بە سروشتەوە هەیە ئەوەی کە چەن جۆر دانەوێڵە لە رەشەمە لە ئاو دەکەن بزانن کامی بە باشی سەرهەڵدێنێ پاشان ئەو ساڵە دەزانن بەرهەمی کام دانەوێڵە باش دەبێو هەوڵ دەدەن ئەوساڵە تەرخان بکەن بۆ ئەو دانەوێڵە. بەڵام لە روانگەی ئایینی زەردەشتی بڕوایان بە ژیانی پاش مردن هەیەو بەشێك لە رێزگرتن لە سروشت لە بیرو باوڕی ئەوان بەم شێوە باس دەکرێ: "بەهەشت بەسادەیی گەڕانەوەیە بۆ ئەو بارودۆخەی کە زەوی تێیدا بووە، ژیان لە بەهەشت وابرێتیە لە کەماڵ بوونی سروشتی ژیان لە سەر زەوی کە لەوێدا لەش چێژ لە خۆشیە سروشتیەکان دەبینێت."[2] بە پێی ئەو بیروبۆچوونە دەردەکەوێ کە چێژوەرگرتن لە خۆشی سەرزەوی لە لایان خراپ نەبووەو، رێزی لێ گیراوەو لەوانەیە ئەم جەژن گرتنو هەڵپەرکێو شادیو خۆشیەو کۆکردنەوەی باشترین خۆراكو خواردن بۆ ئەو رێوڕەسمە هۆکاری ئایینی هەبێتو کۆبوونەوەی خەڵك لە شوێنێکی تایبەتو ئاگرکردنەوەو بازدان بەسەر ئاگردا لە نەورۆز تا درەنگانی شەو هەڵپەرکێو شادی لە ئایینی زەردەشتی خراپ نەبووە. دەکرێ ناوی نەورۆز کاریگەری ئەو بیروباوەڕە کە ژیانی نوێ دێتەوەو خەڵك هەر سەری ساڵ بە سەرەتای ژیانێکی نوێ پڕ لە سەرکەوتنو پێشکەوتن بزانن چ لە بواری ئایینیو چ لە بواری ئابووری. بەڵام ئەم جەژنە چۆن تێکەڵ بە سیاسەت بوو.

" نوێبوونەوەی نەورۆز سەردەمی لەوەی مادەکاندا، دەگەڕێتەوە بۆ دەمی یەکگرتنی مادەکانو دروستکردنی دەوڵەتی دینیو دنیایی مادی گەورە، بەرگی رامیاری جەژنی نەورۆز لەوەی فەرمانڕەوایی مادی یەکگرتوو پیادا کراوە."٣

ئەگەرچی بەڵگەیەك نییە بۆ ماوەیەك نەورۆز لە کولتووری کوردەواریدا لەبیرکرابێ بەڵام خەڵك بۆ ئەوە دەوڵەت پێك دێنن کە پارێزگاری لە زمانو ئاینو کولتوورو دابو نەریتی خۆیان بکەن. ئەگەر دەوڵەتی ماد ئەمەی کردبێ بەشێك لە شانازییەکانی دەوڵەتی ماد پاراستنی کولتوورو هیماکانی خەلکی ژێر دەسەڵاتی خۆی بووە.

بەڵام بەداخەوە نەیارانی کورد هەوڵیان داوە ئەم جەژنە پڕخۆشیو پڕ خەیرو بەیرە بکەن بە جەژنێ کە کورد وەك جەژنی ئەوان سەیری بکاتو کاتێك بگاتە ئاستێکی زانیاری بزانێ کە هۆکاری ئەم جەژنە رووخانی دەوڵەت مادو کاول بوونی دەسەڵاتی کوردی بووە، ئەوەش بە یارمەتی کوردێ کە پشتی لە هەموو هێما پڕشانازییەکانی خەلکی خۆی کردووەو ئیتر شانازی بەو جەژنە نەکاتو بۆی گرینگ نەبێت ئەم جەژنە، جەژنی چ نەتەوەیەك دەبێ.

" کاوە هیچ حەقیقەتێکی نەبووەو نەورۆزیش پێوەندی بە زوحاکەوە نەبووە بەڵکوو هەر جەنێ بەهارە."٤

بەڵام پاش ئەوەی زانرا نەورۆز رۆژێکی جیاوازە لەو باسە ئاماژە بەوە بکەین بۆ لە نەورۆز ئاگر شوێنێکی تایبەتی هەیە. هەموو ساڵێك هەوڵێکی تایبەت دەدرێ بۆ کۆکردنەوەی دارو پووش لە شاخەکانو کۆکردنەوەیان بۆ شەوی نەورۆزو

ئاگرکردنەوە لەسەر شاخەکانو زیندووڕاگرتنی یاسای کەلتووریو ئایینی ئەو سەردەمە.

لە بیرو باوەڕی زەردەشتی ئاگر هێمای خاوێنیو پاکیەو ئەوان ئاگر بە خوا نازانن بەڵکوو ئاگر بە هێمای پاکی دەزانن. " چاکە تۆی ئەی ئاگری خاوێن..... ئەی گەورەترین بەخشێنراوی ئەهوورا"٥

لێرەدا جارێکەتر نەیارانی کورد هەوڵیان داوە مێژووی کورد بە لاڕێدا بەرن کاتێك باسی ئەوە دەکەن کە زەردەشتی ئاگر پەرستنو سەر بۆ ئاگر دانەوێنن بەلاّم دەردەکەوێ ئەوان ئاگر بە یەکێ لە بەشەکانی ژیان دەزانن کە خوا داویەتە بە مرۆڤ. ڕێزگرتن لە ئاگر بەتایبەت پاش زستانێ کە ئەگەر بە هێمای ناخۆشیو سەرما بزانین بەهاری نوێ بە ئاگری خاوێن ڕووناك دەکرێتەوە کۆتایی بە زستان دێت. ئەو خراپ تێگەیشتنە لە ئایینی زەردەشتی دەبێ هۆکاری نەزانین بێت. "چوونکە زمانی ئاوێستا کوردی بووە، ئەو زانایانەی کە ئاوێستایان وەرگێڕاوە، کوردیان نەزانیوە، لە ئەنجامدا بە هۆی سەرچوونی ڕۆژگار وەرگێڕانی جیاجیای ئاوێستا پەیدا بووە."٦

ئەگەرچی دەکرێ ئەمە بەشێوەیەك خۆ فریودان بێت یان بەشێك لە ڕاستی بێت بەلاّم هەمووی نیە لە بەر ئەوەی ئەگەر زانابوون بۆ وەك خۆی وەرگێڕانیان نەکردووە؟ ئەگەر نەزان بوون بۆ پێیان بڵێین زانا؟ بەلاّم دەکرێ زانای چەواشەکار بووبێتنو هەوڵی تێکدانی مێژووی کوردیان داوە کە ئاماژەی پێ دەکەین.

" ئاوێستا نە ناوی شایانی مادی تێدایە، نە ناوی شایانی هەخامەنشیو ئەمە جۆرە دڵنیاییەکی تەواوە، کە ئایینی زەردەشتی وا لە پێش فەرمانڕەوای مادیشەوە."٧ لە کتێبە ئایینیو پیرۆزەکانی گەلانیتر زۆرجار ئاماژە بە دەسەڵاتدارانی پێش ئەو کتێبە کراوەو، لە زۆر شوێن باسی رووخانو لە ناوچوونی دەوڵەتانی پێشتر بە هۆی زۆردارو خراپکارییەوە کراوە بەڵام بە پێی ئەوەی ئاماژەی پێکرا لە باسی مادو هەخامەنشی نەکراوە بە دڵنیاییەوە کە سەردەمی هاتنی زەردەشتو هێنانی ئایینی زەردەشتیو کتێبی ئاوێستا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر پێشتر لە مادەکان. لە مێژووی دەوڵەت شارەکانیش کە هێشتا ماد پێك نەهاتبوو کۆنترە. " کاتێك سەرنجی رووداوەکانو بە یەکدادانو کێشەکانی سەردەمی ئاشوورییەکانو بابلیەکانو خوداکانیان دەکەین یان دوای لە ناوچوونی دەسەڵاتیان دەکەین، هیچ کاریگەریو نەخشێکیان راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە سروودەکانی گاتا بەدی ناکرێت. ئەمەش بە واتای ئەوەیە کە زەمانی زەردشت زۆر پێشتر لە هەبوونی ئاشوورییەکانو بابلیەکان بووە."٨

لە کتێبی ئایینی گەلانیتردا ئاماژە بە رووخانی بابل کراوە بەڵام لە ئایینی زەردەشتیدا ئاماژە بە رووخانی بابل نەکراوە پاش ئەم هەموو باسەی کە پێشکەش کرا کە تا سەردەمی بابلیو ئاشووری باسی لە ئاوێستادا نیە هەن سەرچاوەگەلێك کە باسی ئەوە دەکەن کە باسی زووحاك " ئاستیاگ" کراوە. ئەو شێوە نووسینە ناتوانێ کاری نەزان بێت بەڵکوو ئەوە دەکرێ کردەوەی زانایانی نەیار بێت کە ویستوویانە پێناسەی کەلتووری کورد لە ناو بەرنو هەستی کوردبوونو شانازی بە

مێژووی پڕشنگداری کورد لە نێو تاك تاکی کورددا بکوژن. " لە پشتی هەڤدەیەم (نەریشت)یشدا زەمی زوحاك کراوە. لە ئاوێستادا ستایش و پشتگیری زۆری فەرەیدوون کراوە تا بەسەر زووحاکدا زاڵ ببێ و بیکوژێ و جڵەوی پاشایەتی لێ وەربگرێ. گومان لەودا نییە ئەم شتانە لە دەقی بنەڕەتی ئاوێستا نین و بەڵگەش ئەوەیە کە ناوی "زووحاك ـ ئاستیاگ"یان تێدا هاتووە ئەمە لە کاتێکدایە کە زۆر پاش لە زەردەشت پەیدابوون."٩

نەیارانی نەتەوەی کورد سەدان ساڵە دژایەتی کورد دەکەن هەوڵی لە نێو بردنی دەدەن هێرش دەکەنە سەری زەوی و کێڵگەی ئاگر تێ بەردەدەن ماڵ وێرانی دەکەن ئاوارەی دەکەن دارو باخی دەسووتێنن و کاولی دەکەن بەوەش رانەوەستاون هەوڵ دەدەن زمانی بسڕنەوە مێژووی تێك بدەن تا جێگایەك لەم تێکدانە رۆیشتوونەتە پێش دەست تێوەردانی ئایینی گەلان دەکەن تا ئەوەی وانەبووە بیگۆڕن ئەوەی هەیە بیسڕنەوە یان حاشای لێ بکەن. "ئەم چەشنە شێواندنی مێژووە، کە لە راستیدا گەمژەیی و نەزانی شۆڤینیەکان پیشان دەدات هیچ نرخێکی نیە، مێژووی گەلی کورد بریتیە لە مێژووی خەباتی بێپسانەوە دژی داگیرکەران. ئاشوورییەکان و بابلیەکان بە دەست خێڵە شەڕکەرەکانی کوردستان گیریان خواردبوو."١٠شەڕکردنی کورد چەن هۆکاری بووە کورد لەوە تێگەیشتووە کە ئەگەر بەرامبەر دوژمن پاشەکشە بکات، ئەو پاشەکشە ناکات و بەردەوام دێنە پێشەو لەو سەردەمە هەوڵی داوە هێرش بکاتە سەر ئەوانەی کە تێدەکۆشن خاکی داگیر بکەن بەتایبەت لە ئایینی زەردەشتیدا باس لە پارێزگاری لە وڵات و بیروبڕوا بایەخی زۆری هەبووە، جێگای تایبەتی لە ئایینی زەردەشتی هەبووە.

" ئەو ئایینە وا هاتووە کە لە گەڵ میانەڕەویدا یەکسان بێت. هیچ فەرمانێك نادۆزرێتەوە کە دوژمنی خۆت خۆش بوێت."١١

پاش ئەوەی کە باسی زەردەشت کرا دەکرێ باس لە سەردەمی مادو باسی ئەو دەوڵەتە بکەین. بەشێك لە نووسەرەکان کە نەیارانی کوردن بەسەندەیان بە کوشتنو کاول کردنو دەست تێوەردانو چەواشەکردن نەکردووە هەنگاوێ: لە هاوڕێیانی خۆیان هاتوونەتە پێش ئەم جارە هەوڵیان داوەو کورد بەگشتی کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن نەتەوەی کورد لە مرۆڤایەتی دەربەرێنن.

"کوردەکان خۆیان بە ئەوەی ئەو میدییانە دەزانن کە لە (٦١٢ــ پ.ز) ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییان رووخاندو هێندێ ئەفسانەی سەر سووڕهێنەریش هەیە کە دەڵێ: ئەمانە نەوەی جنۆکەو جادووگەرانی مەلیك سلێمانن."١٢

لە نێو ئەم هەموو درۆو چەواشەکارییەدا نەوەی کوردی کوڵۆڵ لە دوای راستیدا بگەڕێت دەبێ چەند ساڵ ژیانی خۆی تەرخان بکات بۆ ئەوەی بگات بەو راستیە کە ئەوە دوژمن نووسیویەتی ئەو نەوەی جنۆکەو جادوگەر نیە مرۆڤێکی خاوێنو خاوەن شارستانیەتو کەلتووری تایبەتی خۆیە کە زۆر لە گەلانی تر زۆرتر خزمەتی بە شارستانیەت کردووە. مێژوو پیشان دەدات کە کورد لە چاخە جیاجیاکانی مێژوودا لە ژێر گوشارو هێرشی دوژمندا هەوڵیدا خزمەت بە شارستانیەت بکات لە زۆر بواردا داهێنەرو راهێنەر بووە. بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەوەیە ئەگەر کورد لە گەلانی تر پێشکەوتوو نەبووە بۆ چوار هەزار ساڵە خراپەی بەرامبەر دەکرێ بەڵام لە نێو نەچووە؟!

بۆ بەتەنیا لە سەر گۆی زەوی دەژی لە هەموو جیهاندا دۆستێکی نیە بەڵام لە ناو نەچووە؟ بەڵام کاتێك ئاماژە بە دەسەڵاتی دواین پاشای ماد دەکەین کە ئەم

هەموو درۆ دراوەتە پاڵی بەشێك لـە رووخـانی دەسـەڵاتەكەی دەكـرێ هۆكـاری لێبوردوویی خۆی بوو بێت.

لە دوای مردنی كیاكسار ئاستیاگی كوڕی چووە سەر تەختو ٣٥ سـاڵ حـوكمی كرد. بە هۆی جموجۆڵی هارپاگ كە یەكێ لە گەورە پیاوانی ماد بوو لـە كیاكـسار زویـر بـوود، بـە هـۆی كـورش كـوڕی مانـدانا كـچی ئاسـتیاگو كـامبیس "كەمبووجیە"ی پارس سەڵتەنەتەكەی دۆڕاند. "١٣

ئەگـەر نووسـەری كـورد وەك نـەیارانی كـورد هەڵویـست بگـرێ خزمـەتی بـە بەرژەوەندی كورد نەكردووە بەڵام دەكرێ ئەوەندە رەخنە لـە ئاسـتیاگ بگـرین كـە ئەگەر ئەو رێنماییەكانی ئایینی زەردەشتی لە پـێش چـاو گرتبـاو دوژمنـی خـۆی خۆش نەویستبا ئەمڕۆ كورد بەو شێوە ماڵ وێران نەدەبوو. دەكرێ بەشێك لـە مـاڵ وێرانی كورد بە درێژایی سەدان ساڵ بدرێتە پاڵ ئەو كـە بەرامبـەر دوژمنـی خـۆی هەڵویستی شلی هەبوو. كاتێكیش دەسەڵاتی دۆڕاند مافی سەركەوتووە چـۆنی پـێ خۆشە مێژوو تۆمار بكات. "ئەفسانەی دروستبوونی "ئەژدیها"و بەئـەژدیهابوونی ئاستیاگ پاشای مادەكان كە لەوەشدا زۆر راستی گۆڕاوو، خەیاڵاویو ئەفسانە كران ئەم پاشایە وەك مێژوو باسی دەكات یەكێ لە پاشا سـەركەوتووو دادپـەروەرەكان بووە، كەچی ئەفسانە ئاوا بەم دەردەی بردووەو بە تەواوی كردوویە بە درەندەیـەكی خوێنخۆر ئەمەش یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی ئەفسانەیە. "١٤

ئەو شێوە بە ئەژدیهاكردنی ئاستیاگ دوایین پاشای ماد زۆرتر لە سەردەمی پاش مادەكان پەرەی پێ دەدراو لە سەردەمی دەسەڵاتی سوڵتان مـەحموودی غەزنەویـدا كە فیردەوسی شانامەی نووسـیو باسـی زوحـاكی مـار لەسەرشـانیو ماچـكردنی ئەهریمەن لەسەر شان پاشـای كـردوو دوومـار لەسـەرشـانی رووا، پاشـا مێـشكی

دیلەکانی دەدا بە مارەکان بیخۆن بۆ ئەوەی مێشکی خۆی نەخۆن، بەڵام فیردەوسی ئەم دێڕەی لە ئاینی زەردەشتی نەدەزانی "لە روانگەی زەردەشتەوە (ئەهریمەن) بە شێوەیەکی بوونەوەرێك واتای نیە، ئەهریمەن لە ئاینی بەهدینی بە واتای بیری خراپە"١٥. ئەگەر ئەوەی فیردەوسی ئاماژەی پێ کردووە راست بێت ئاستیاگ لە هەر رۆژێ دووکەسی کوشتبێ‌و مێشکی دابێت بە مارەکان بیخۆن، ئەگەر پەنجا ساڵ ژیانی کردبێ، پاش ئەو رووداوە زۆر کەسی کوشتبێ پەنجا هەزار کەسی کوشتووە کە قەت وانەبووە، بەڵام لەهەر چاخێکی مێژوویی‌دا پاشاکانی هەخامەنشی لە هەر هێرشێك بۆ سەر وڵاتی کوردان پەنجا هەزار کەسیان کوشتووەو بە شانازییەوە لەسەر بەرد نووسیویانە کە ئەوەندە وڵات کەسە کەوتە بندەستی ئێمە ئەوەندە وڵات کاول کرا، ئەوەندە دیل گیراوو خزمەتی ئێمە دەکەن‌و پادشاکانی هەخامەنشی بۆ نەبوون بە ئەژدیهاو مرۆڤ خۆر؟

"زووحاك (ئەژدەهاك ـ ئاستیاگ)" کوڕی دوایین پادشای دەوڵەتی ماد بەو شێوە زانراوە زۆردار نەبووە، وەك فارسەکان شان‌و شکۆی ئەو پادشایەیان لەکەدار کردووە. ١٦" فێردەوسی هەنگاوێك لەوانی تر هاتووە پێش، کاتێك باسی چێشتخانەی زوحاك دەکات، دەڵێ: دوو کەسی هەبوو کە چێشتیان بۆ لێ‌دەنا بیریان لەوە کردەوە بۆ هەر رۆژە دوو گەنج بکوژن‌و بیدەن بە مارەکان با هەر رۆژ مێشکی کاوڕێ لەگەڵ مێشکی مرۆڤێ پێ‌بدەن بە مارەکان‌و بەم شێوەیە کەسێك لە مردن رزگاری ببێ، ماوەیەك ئەم بیرۆکەیان بەڕێوە برد تا کاتێك ئەو کەسانە بوون بە دووسەد کەس وا رزگار بوون‌و لە شاخەکان جێگایان پێیان دا تا لەوێ بژین. بە هۆی ئەوەی ئەوانە پێشتر لە دیلی هاتبوون‌و پاشان مەترسی ئەوە هەبوو (زوحاك ـ ئاستیاگ) پێیان بزانێ‌و بیانکوژێ. فێردەوسی لە درێژەدا دەڵێ: کوردی

ئەمڕۆ لەوانە پێکهاتووە کە دیل بوون و رزگاریان بوونو رۆیشتنە شاخو ترسیان لە خوا نییە ماڵەکانیان لە پێستی مەڕو بزن ساز دەکەنو نیشتەجێ نین.

"کنون کرد از این تخمه دارد نژاد

که از اباد بر دل نیایدش یاد

بود خانەهاشان سراسر پلاس

ندارند در دل زیزدان هراس"

بە روونی دەردەکەوێ کە هەوڵی داوە ئەو خەڵکانەی کە ئەمڕۆ پێیان دەڵێین نەتەوەی کورد لە مێژووو بسڕێتەوەو پاشان بە کۆچەرو هاوەردە ناودێریان بکات. لە دوایدا بێماڵو ژیانو دواکەوتوو لە کەلتوور و شارستانیەت پیشانیان بداتو ئایینی زەردەشت لەوان وەربگیرێتەوە بڵێت بڕوایان بە ئاینیش نیە جیا لەوە بڕوایان بە ئاین نیە لە خواش ناترسن. هەموو هەوڵی ئەوە بووە پێناسەی نەتەوەی لە کورد بسڕێتەوە کاتێك پێناسە نەبوو ئەو نەتەوە مافی نابێت لەبەر ئەوەی ناتوانێ خۆی بۆ نەتەوەکانی تر پێناسە بکاتو خۆی بناسێنێ.

کاتێك پرس بە رۆشنبیرو زانایانی ئەدەبی فارسی دەکرێت کە فیردەوسی بەو شێوە دژایەتی کوردی کردووە دەڵێن ئەوە شیعرەو شیعر مێژوو نیەو زۆر گرینگ نیە، بەڵام لەسەر قسەی فیردەوسی هەزار ساڵە کورد دەکوژرێ لەبەر ئەوەی دژ بە خوایە، کورد دەکوژرێ لە بەر ئەوەی کۆچەرە، کورد دەکوژرێ لەبەر ئەوەی دواکەوتووە. فیردەوسی وا پیشانی داوە کە ئەوان هەزار ساڵ خاوەن شارستانیەت بوون، پادشایان بووە، شارو شارۆچکەیان بووە، یاساو رێسای تایبەتیان بووە، بەڵام کورد هەر هیچ ....

"هەندێ لە مێژوو نووسان بە گژی ئەم ئەفسانەیەدا دەچنەوەو دەڵێن کاوە فارس بووەو زوحاك کورد بووەو پاشایەکی داد پەروەر بووەو کاوە کوشتوویەتی بۆ ئەوەی حوکمی وڵات بۆ فارسەکان بگەڕێتەوە؟"١٧ ئەگەر بەو شێوە بێت، پێشتر ئاماژەی پێکرا نەدەبوو ڕێز لە دوژمنەکەی بگرێو لێ خۆش بێتو دەبێ بەرامبەر دوژمن ڕق ئەستور بوویاو لە ناوی بردبا لە دەسەڵاتی نەتەوەیەك لە ناو ببا. ئەگەرچی ئاماژەی پێکرا پێکهێنانی ئەو ناوەو پەرەپێدانی لە لایەن کەسانێك وەك فردۆسی بوو، بنەمای مێژوویی نیە. "ناوی کاوە لە سەرچاوەکۆنەکانی سەردەمی زوحاك کوڕی کەیخەسرەو پاشای ماد "پاشای کورد" نەبراوە."١٨

کاتێك دەگەڕینەوە بۆ مێژووی سەردەمی مادو دەسەڵاتی ئەوانو پاشان ڕووخانی مادو بەدەسەڵات گەیشتنی کوروش بە ڕوونی دەردەکەوێ کە وتەکانی فیردەوسی پێچەوانەی راستییە زمانو ڕێنووسو کەلتوورو شارستانیەتو هەموو دەسکەوتەکانی کورد بە درێژایی هەزاران ساڵ دەکەوێتە بن دەست خەڵکانێکی بن دەستو لە ژێر دەستەی دەبنە سەردەستەو کەلکی لێ وەر دەگرن. "بێ سێو دوو دەتوانین بڵێین کانگەی شارستانیەت پێشکەوتووەکەی فارسەکان بریتیەلەو شارستانیەتەی کە باپیرە گەورەی کورد دایمەزراندو بەجێی هێشت."١٩ ئەوەی بە سەر کورد هات مێژوو نووسانی نەیاری کورد خۆشیان بە وردی باسی ناکەن ئەوەندە پڕ لە شەرمەزاریو سیخۆڕیو خۆفرۆشییەو خراپەیە بەرامبەر بە کورد بەڵام ئەو کەسەی کە بووە هۆکاری ئەو خراپە مێژوو چۆن بڕیاری لەسەر درا. "کە کورش شۆڕشی بەرپا کرد، کە شاری "ئەکباتان، گیرا، زوحاك (ئاستیاك - ئاژدیهاك)" خۆی شاردەوە بەڵام کە کورش بڕیاریدا ئازاری کچو خزمەکانی بدات، زوحاك بەزەیی بە خزمەکانیدا هاتەوەو خۆی تەسلیم کردو بەهارپاگی گوت: "تۆ

میللەتی مادت بە دیلیو ژێردەستەیی گەیاند" هیرۆدۆت هارپاگ بە "بێ عەقلترینو بێ ویژدانترین کەس داناوە" ."[20] بۆ هارپاگ ئەمە بەرامبەر بە کورد کرد ئەگەر لە کیاسار زویر ببو دەیتوانی تۆڵە لەو بکاتەوە یان بە جێی بێڵێو بڕوات پاشان ئەگەر لە گەڵ ئاستیاك کێشەی هەبوو دەیتوانی ئاستیاك لە ناو ببات‌و خۆی لە جێگای دانیشێو یان دەسەڵات بەجێ بهێڵێو بەو هەموو دەسکەوتە کە بووی ژیانی خۆش بۆ خۆی بباتەسەر. دەسەڵات ئەوەندە نرخی نیە کە کەسانێك لە مێژوودا تاوانی بۆ دەدەنو هەتاهەتایە ناویان بە رەشی تۆمار دەکرێت.

بەڵام پێش هەموو شتێك خراپەی بەرامبەر بە خۆی کردو لە نێو نەتەوەی خۆی لە پێش چاو خەڵك کەوت لە نێو گەلانی دیکەدا بە خراپی باسیان کرد پاش ئەوەی کوروش گەیشت بە دەسلات پەلاماری بابلیدا بەڵام پێش ئەم هێرشە پاشای بابل چەن قسەی لەسەر هارپاگ کردووە کە جێگای خۆیەتی باسی بکەین.

" پاشای بابل وتی: ئەی خەلکی بابل ئاگادارتان دەکەمەوە کە رۆژ رەشی دەبینم کەبە سەرماندا دێت: کەسێك دەبینم کە دوو رەگەی پارسو مادە بە تەنیا خواکەی خۆی خۆش دەوێت هاوکارەکەی کەسێك لە مادەکان دەبێ کە ئاشوور شانازی پێدەکرد، کاش پێش ئەوەی کردباو پشتی لە هاوشاریو هاوولاتیانی کرد باو ببێ بە خۆنرۆش، لە نێو دەریا لە نێو چوویا یان لە نێو دەشتو بیاوان سەرگەردان بوویا."[21] بەم دژایەتیە کە هاپارگ بەرامبەر ئاستیاك کردی هەموو دەسکەوتەکانی کورد کەوتنە بن دەست پارسەکان ئایا تۆڵەکردنەوە ئەوەندە تامو چێژی هەیە کە هەموو رابردوو بسووتێنێ بۆ چرکەیەك کە تۆڵە بکەیتەوەو بیر لەوە نەکەیتەوە داهاتوو چی دەبێ.گرینگترین شت لە هەمووی ئەوانە کە ئەمرۆ کورد

هێشتا نەیتوانیوە کێشەکەی چارەسەر بکات زمانە کە فارسەکان کەڵکیان لەو زمانە وەرگرت، ئێستا زمان بە یەکێك لە گەورەترین کۆڵەکان پێناسەی هەر نەتەوەیەك دێتە ئەژماردن، دەڵێن زمانی فارسیو لە کاتێکدا بنەڕەت ئەم زمانە کوردییە. "ئەوانەی وادەزانن زمانی کوردی زاراوەیەکی فارسییە مێژووو زانست پێچەوانەی بیرو بڕوایانە."٢٢ بە پێی ئەوە باس کرا شارستانیەتی کورد کەوتە بن دەستی فارس جا فارس مافی ئەوە بەخۆی دەدات دەست تێوەردانی زمان، مێژوو، ئاینو کەلتووری کورد بکاتو بە قازانجی خۆی داڕێژێتەوە کە بە پانی ئەمەی کردووە. ئایینی پیرۆزی زەردەشت پاش مادەکان رووخانی گەورەی بەسەردا هاتو بە پێچەوانەی ئەوەی واباس دەکرێ ئاین یەك خودایی زەردەشتی گۆڕانی بەسەر هات پاشای هەخامەنشی خۆی بە خوا ناساندو بە خەڵکیو خواکانی ئەوان وتی من خواکانی ئێوە رێز لێ دەگرمو خۆشی بە یەکێك لە خواکان ناساند. "کوروش یەکەم کەس بوو کە یاسای پیرۆز بوونی ئایینی بۆی بەرێوەچووە."٢٣ لە کاتێکدا زۆرلە مێژوونووسان دەڵێن پاشاکانی هەخامەنشی زەردەشتی بوون بەڵام کورش بە پێچەوانەی ئایینی زەردەشت کرداری کرد.

پاش ئەوەی کورش بووبە پاشای مادو خۆی بە خوا ناساندو لە دواییدا هێرشی کردە سەر بابلو پاش بابل پەلاماری لیدی دا کە کیاکسار شەش ساڵ شەڕی لە گەڵیان کردو گەڕایەوەو کورش هێرشی لیدی بە سەرکەوتوویی بردەسەر و شاری سارد ناوەندی لیدی داگیر کرد بڕیاری‌دا بە هارپاگ کە درێژە بە داگیرکاری خۆی بدات. "کورش بڕیاری داگیرکردنی شارەکانی تری ئاسیای بچووکی دابە هارپاگ بەرزترین بەرپرسی خۆی کە وەك جێگری وابوو."٢٤ دەردەکەوێ ئەو شارە کە کیاکسار داگیری نەکرد هارپاگ بۆ کورش داگیری کرد کیاکسار لە بن دیوارەکانی

شاری سارد راوەستا بەڵام هارپاگ ئەوەی بۆ کورش کردی قەت بۆ کورد نەیکرد. و ئەگەر لە دەسەڵاتی کورشدا بوویە جێگر خۆ لە دەسەلاتی ئاژدیهاك ـ ئاستیاك هەر جێگری ئاستیاك بووو گۆڕانکاریەکی ئەوتۆ نەکرا بۆ ئەو، بەڵام رووخانی بۆ کورد هەبوو.

"وتەی کۆتایی"

بە پێی ئەوەی باس کرا نەورۆز ژیانەوەی رۆح و سروشت و گیان و جیهان پیشان دەدات و نەورۆز جەژنێکی بەهارە بۆ شایی و خۆشی و پاراستنی کەلتوورو زمانی نەتەوەی کوردی ئەمڕۆ کە بە درێژایی هەزاران ساڵ ئەم داب و نەریتەیان پاراستووە.

زەردەشت ژیانی زۆر پێشتر لە دەوڵەت شارەکانی نێوان دوو ئاوان بووە لە بەر ئەوەی لە ئاوێستا ئاماژە بەو دەوڵەت شارانە نەکراوە پاش ئەوە بیرو باوەڕی زەردەشتی پاڵنەر بووە بەو کەسەود کە ئەو بیرو باوەڕەی پەسەن کردووە کە پارێزگاری لە نیشتمان و وڵات و هاوڵاتیانی خۆی بکات و بەرامبەر بە دوژمن راوەستێ و بەهەموو توانا پارێزگاری لە خۆی و نیشتمانی بکات. کورد هەزاران ساڵ بەرامبەر هەموو جۆرە تواندنەوەیەك خۆڕاگری کردووە لە کوشتن کە سەرەتای لە ناوبردنی بوو پاشان دەرکردن، ماڵوێران کردن، زمان گۆڕین و ئەژدیهاو جنۆکە ناودێرکردن و تێکدانی مێژووی و لە دوا قسەدا بە بێ وڵات، کۆچەر، بێ کەلتوورو شارستانیەت و شاخاوی و وشەیەکی خراپ لە زماندا نیە کە نەیارانی کورد بەرامبەر بەکورد کەڵکیان لێ وەرنەگرتبێ. بە هۆی ئەو خۆڕاگری و بەرپرچدانەوەی نەیارانی کورد ئیتر ئەو نەتەوە مافی خۆیەتی کە دەوڵەت و دەسەڵاتی سەربەخۆی هەبێ،

شانازی بە مێژووی پڕ لە شانازی خۆی بکات بە زمانی دایکی خۆی قسە بکات، مافی خۆیەتی هێماو یاساو ریسای خۆی هەبێتو لە ژێر ئاڵای وڵاتی خۆیدا بژیتو ئاینو بیروباوەڕی سەربەخۆی هەبێت کەس ناتوانێ ماڵوێرانی بکات بۆ ئەوە بیروبڕوای جیاوازی هەیە.

مافی خۆیەتی کە بۆ جارێکی دیکە بە هۆی درۆو چەواشەکاری نەیارانی خۆی کە بە درێژایی مێژوو کراوە نەکوژرێ.

باس ئەوە کرا کە هارپاگ لە بەر ئەوەی تۆڵەی خۆی لە کیاکسار یان ئاستیاگ بکاتەوە دەوڵەتی مادی وا پێکردووە، بەڕاستی تۆڵەکردنەوە ئەوەندە تامو چێژی هەیە بە تایبەت لە برای خۆت بە چ پێوانەیەك ئەوەی کرد. ئایا نابێ بەر لەوەی تۆڵە بکەینەوە بیر لە دوارۆژ بکەینەوە؟

ئاماژە بەوە کرا کە کوروش پەرەی بە ئایینی زەردەشتی نەدا، بەڵکوو لاوازی کرد، ئایینی یەك خواناسینی زەردەشت لەگەڵ ئەوەی کوروش بڕوای بە مەردوخ هەبوو کە لە بەردو ئاسن پێك هاتبوو، جیاوازە.

ئەوە زۆر سەیرە کە هارپاگ پاش ئەوەی تۆڵەی لە پادشای ماد کردووەو ئاوا ئاشیرین کەوتە، خزمەت کردنی کەسێك کە دەوڵەتەکەی رووخاند ئەگەر بۆ تۆڵە ئاستیاگی ئاوا پێکرد بۆ پاش ئەوە کۆتایی بە خۆفرۆشتنی نەهێنا. ئەگەرچی دەسەڵاتی مادو هەخامەنشی جیاوازی بۆ ئەو نەبوو هەردوو دەوڵەت ئەویان بە دووهەم کەس لە دەسەڵاتدا دەزانی پاش پادشا ئەگەر خەیانەت بۆ تۆڵە بوو بۆ کۆتایی پێنەهات پاش رووخانی ماد ئەگەر بۆ پلەو پایە بوو کە لە هەر دوو دەسەڵات بۆ وەك یەك بوو، بەڵام بەو کردەوە بێ قازانجە هەزاران خراپەی بە درێژایی هەزاران ساڵ بۆ خۆی کریو جیاوازییەکی ئەوتۆی پێك نەهێنا کە بێتە هۆی

شانازی بۆ ئەو یان بۆ کەسانێکی تر... ئیستا کاتی ئەوە هاتوەراستی میژووی نەتەوەی کورد بخرێتە بەر باس وئیتر درۆ وچەواشەکاری نە یارنی کورد کۆتایی پیێ بێت ئەگەر ناتوانین پێش بەوان بگرین با خۆمان درۆکان ئەوان دووپات نەکەینەوە.

سەرچاوەکان:

١ـ هەورامی، د.م.ا/مێژووی جوگرافیای کوردستان لە ئاڤێستادا/ بڵاوکراوەی ئاراس ـ ژمارە ٤٩٠، ل ٢٤٣ ـ چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٦ ـ ل ١٢٦.

٢ـ زینهەر، پرۆفیسۆر، ر.س/ پوختەیەك لە بیروباوەری زەردەشتی/ ئازاد حەمە شەریف لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردیو پێشەکی بۆ نووسیوە ـ چاپی دووهەم ـ ل ١٩٤ ـ ژمارە ١٨٢ ـ چاپخانەی ماردین، هەولێر ٢٠٠٤ ـ ل ١٧٣.

٣ـ سەرچاوەی ژمارە ١/ ل ١٤١.

٤ـ یوسف، عبدالرقیب/ شوێنەوارەکانی نەوێ لە شاخی سوورێن/ ساڵی ١٩٩٤ ـ ل ٦٨ ـ ژمارەی سپاردن ٥٠ بە یارمەتی رێکخراوی میدیکۆی ئەڵمانی چاپ کراوە. ل ٩.

٥ـ سەقزی، بابان/ گاتا، سروودە پیرۆزەکانی زەردەشت/ ژمارەی سپاردن ٧٣٧ ـ ل ٢٢٧. ساڵی ٢٠٠٦ـ چاپخانەی کارۆ وەزارەتی رۆشنبیری، ل ٣.

٦ـ ئیبراهیم حەسەن، مەولوود/ گەڕان بە دوای ئەمریدا/ بڵاوکراوەی ئاراس، ژمارە ١٣٥، ل ٢٦٣، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەدە ـ هەولێر، ل ٦.

٧ـ سەرچاوەی ژمارە ١/ ل ١٣٨.

٨ـ سەرچاوەی ژمارە ٥/ ل ١٥.

٩ـ سەرچاوەی ژمارە ٤/ ل ٥٥.

١٠ـ شەمزینی، د. عەزیز/ جووڵانەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردستان/ وەرگێڕانی فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێهەم، سلێمانی ١٩٩٨ ـ ل ٢٦٠ ـ بڵاوکردنەوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان ـ ل ٢٧.

١١ـ سەرچاوەی ژمارە٢/ ل ١٢١.

١٢ـ گەنتەر، مایکل/ فەرهەنگی مێژووی کورد/ وەرگێڕانی مامکاك/ ل ٢١٩ ـ چاپی یەکەم ـ هەولێر ٢٠٠٧، دەزگای ئاراس، ل ٢٤.

١٣ـ دیاکۆنۆف، ئی.م/ میدیا/ بورهان قانع لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی، چاپی یەکەم ـ ساڵی ١٩٧٨ ـ ل ٨٨٧ ـ لە نامەخانە رەسارەی ـ ١٦٨٨ پێدراوە ـ بەغدا ـ ل ٤١.

١٤ـ ئیبراهیم حەسەن، مەلوود/ پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی/ چاپی یەکەم ـ ل ٢٠٥ ـ ژمارەی سپاردن ١٠٠٤، ساڵی ٢٠٠٧ ـ چاپو بڵاوکردنەوەی چاپخانەی ردنج ـ ل ٤٧.

١٥ـ سەرچاوەی ژمارە٥/ ل ٤٣.

١٦ـ سەرچاوەی ژمارە ٤/ ل ٩.

١٧ـ سەرچاوەی ژمارە ١٢/ ل ٢٨٧.

١٨ـ سەرچاوەی ژمارە ٤/ ل ٥٤.

١٩ـ مەزهەر، د.کەمال/ چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد/ بەشی یەکەم ـ بە یاریدەی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە چاپ دراوە، چاپخانەی الادیب بغداد ـ ل ٣٢١ـ ساڵی ١٩٨٥ ـ ل ١١.

٢٠ـ سەرچاوەی ژمارە ٤/ل ٥٣

٢١ـ شاندر، البر/ کورش کبیر/ البر شاندور ـ ترجمە محمد قاچی (تهران) زرین ـ ١٣٧٥ ـ ص ٤٢٦ـ کتابخانه ملی ایران ـ ل٣٢٤،

.ISBN: ٩٦٤ – ٤٠١-٠١١-٩

٢٢ـ سەرچاوەی ژمارە١٩/ ل ١٨.

٢٣ـ سەرچاوەی ژمارە ٢١/ ل ٣٢٤.

٢٤ـ سەرچاوەی ژمارە ٢١/ ل ١٧٥

# مێژوو.. زانستی هەبوونی مرۆڤ،
## "هەوڵێك بۆ پەڕینەوە لەمێژوونووسی یەوە بۆ مێژووناسی"*

عەلی شەریعەتی
وەرگێڕانی: هاوار محمد ڕەشید

(١- ٣)

پێناسەکردنی مێژوو:

مێژوو بریتی نییە لە زانین دەربارەی بارودۆخەکانی ڕابردووان، یان زانیاری لەسەر کۆمەڵێك ڕووداو کە لە کاتی پێشتر، بەر لەم کاتەی ئێمە ڕوویانداوە، یان ناسینی شارستانی وکەلتوورە سەربەخۆکانی کۆمەڵگا سەربەخۆکان، یان زانین دەربارەی نەتەوە و ڕەگەزەکانی ڕابردوو، وە مێژوو کۆمەڵێك لە گۆڕانکاری و وەرچەرخانە جیاوازەکان نیە، یان مێژوو بریتی نییە لە مێژووی ئەدەبە جیاوازەکانی وەك شیعر و ئەدەب و هونەر، لە کاتێکدا کە هونەرمەند یان شاعیر بەناوی مێژوونووسەوە هەڵدەستێ بە هەڵبژاردنی ئەو تووخمانەی لە ڕابردوودا هەن، ولێیانەوە کەسایەتیە هونەرییە مێژووییەکان دەئافرێنێ و بەپێی سەلیقە و جیهانبینی یەکانی خۆی کە بەشێوەیەکی تایبەت دەیخاتەڕوو و واتایەکی تایبەتیشی پێدەدات.

مێـژوو واتـا لێکۆڵینــەوە و وردبوونــەوە ودووان دەربــارەی کاروبــار و ڕووداوەکان کە لە ڕابردوودا ڕوویانـداوە. و مێـژوو بریتـی یـە لـە جووڵەیـەکی هەمیـشەیی بـە ئاراسـتەی داهـاتوو، و تەمـەنی مرۆڤـە کـە ساڵەکانی ژیـانی دەگاتـە بـن بەسـت و کەسـایەتیەکەی لـە کـاتی لـەدایك بوونیـەوە تائێـستا پێکـدەهێنێ. جووڵـەی مـرۆڤ لـە میانـەی کـاروانی دووروودرێژیـدا بریتـی یـە لەمێژوو، لەکاتێکدا کە ئەم مرۆڤە ژیاوە و پێشکەوتووە و گەیشتۆتە ئەوەی ئێستای. مرۆڤ بوونێکە چییەتی(ماهیە)یەکەی پێکدێت لە میـانی مێـژووەوە، لەبەر ئەمە ئەوا مێژوو بریتی یە لە چۆنیەتی هـەبوون (صـیرورة)(١)ی مـرۆڤ، یان مێژوو بریتی یە لـە ڕابـردوو بـۆ ئـەم ئاژەڵەی کـە لەسـەر دوو پێیـەکانی دەڕوات و ئەم ڕابردووەش ئەوەیە کە پەیامێکی گەورە و وردی هەیە، وئـەم پەیام و ئەمانەتەشی بە وردی و دڵسۆزی بەجێ گەیاندووە و بۆئەوە نەبووە کـە هەرەمەکیانـە یـان بـەبێ ئامـانج هـەڵیبگرێت، دیـسان ئـەم پەیامـەی بـە ڕێکەوت وبێ ڕوونی ئامانج یان بە بێ هۆکار یان ڕاستی زانستی هەڵنەگرتووە.

هەروەکو چۆن تەمەنی مـرۆڤ ملکەچی یاسـا هەمـەکی و بنـچینەییەکانی شیاوی شیتەڵکردن وبەش بەش کردنە وقۆناغە جیاوازەکانی پـڕاو پـڕ بـەپێی پێوانە ووردو ودیاریکراو ولۆژیکی و زانستیە تێك ئاڵاوەکـانی نێوانیانـە، ئـەوا تەمەنی هەر کۆمەڵگەیەك یان هەر جۆرێـك لـە کۆمەڵـە مرۆڤێـك بریتـی یـە لـە واقیعێکــی پەیوەندیــدار و جــووڵاو بەدرێــژایی زەمــان(٢) و وەرچــەرخانە جیاوازەکانی تێدایە، و هەروەها پاشـکۆی یاسـا دیـاریکراو وجـێگیر ودەسـت نیـشانکراوەکانە، و ئەوەشــی ئــەم یاســاو بنــچینەو بناغانــە دەدۆزێتــەوە ودەیخاتەڕوو ولێی دەکۆڵێتەوە زانستی مێـژووە. لەبەرئـەوە دەتـوانین بڵـێین

کە زانستی مێژوو (مێژووناسی) بریتی یە لە زانستی هەبوونی مرۆڤ، کە لە دۆخی جووڵەو دروست بوونی هەمیشەییدایە، لێرەوە زانستی مێژوو بەواتای زانینی ڕابردووی مرۆڤ نییە، بەڵکو واتا زانینی ئەو چۆنیەتیەی کە مرۆڤ تێدا دروست بووە و تێیدا بۆتە مرۆڤ، و هەروەها زانینی ئەو هۆکار وکارکردانەی(العوامل) کە لە پشتی ئەم گۆڕان و وەرچەرخان وپێگەیین و کامل بوون و نەخۆشی وتەندروست بوون و توندوتیژی وقەدەرەوە، کاران، کە بۆ مرۆڤ یان بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی دروست دەبێ. سەرەڕای ئەمەش دەتوانین بڵێین کە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە و زانینی نەتەوە و کۆمەڵگا و ڕووداوەکانی ڕابردوو مێژوو نییە، بەڵکو نموونەگەلێکی بەشەکی ودیاریکراون و، مێژووناس لە دۆزینەوەی یاساکانی مێژوو سوودیان لێ وەردەگرێ، و ئەم یاسایەنەش زانینی خەڵکی و کۆمەڵگە مرۆییەکان و چۆنیەتی دروست بوونیان لە ئێستە و لە داهاتووشدا دەگرێتەوە، و هەروەها ناسینی جۆری مرۆڤ و چارەنووسی بەتایبەتیش ئەو مرۆڤە فێرکراوەی کە مێژوو پێیەوە نووساوە. زانینی مێژوو، هەروەها واتە زانینی یاساکانی جوڵە وگۆڕان ودروست بوونی کۆمەڵگە و شارستانیەت وجۆری مرۆڤ وهەروەها زانینی هۆ وچییەتی(ماهیە)ی ئەو یاسایەنەش.

ئەم تواناو زانینە کە لەڕێگای خوێندنەوەی زانستی مێژووەوە بەدەستی دێنین، چۆن ئەکرێت مێژوو بیخاتەڕوو یان بیسەپێنێت لەسەر ئەو ناچارەکیە بڕیاردەر(الجبر الحاکم)ەی لەسەر کۆمەڵگەیە؟ و دیسان چۆن ئەکرێت مێژووناسی ئەم زانین و زانیارییانە لەسەر کارکردی وەرچەرخان و گەشەکردن و داڕووخان و بڵندبوون وسڕبوون و بزووتنەوە هۆشیارانەکانی کە لە

کۆمەڵگەدا هەیە بسەپێنێ. و کۆمەڵگەش لە قەدەرێکی مێژووی سەپێنراوەوە دەرچێت بۆ قەدەرێکی ئازادانەی شیاو(مەعقول)؟ هەروەکو ئەوەی زاناکانی رووەك و ئاژەڵ و سروشت بەسەریدا دەسەڵاتدار دەبن، ئەو کاتەی یاساکانی ژیان و جووڵە دەدۆزنەوە، ئەوا ویست (ئیرادە)ی خۆیان بەسەر سروشتدا دەسەپێنن، دوای ئەوەی کە ملکەچ و ناچار بووبوون بۆی. لێرەوە ناچارەکی (جبر)ی سروشت بەدەست ئەوانەوە دەبێت نەك سروشت و، هەر بەم جۆرەش مرۆڤ بە ناسینی مێژوو دەتوانێ بەرووی جەبری مێژوویدا بوەستێتەوە، وکاتێکیش جۆر و دروست بوونی ئەو مێژووەی ناسی ئەوا ئەو جۆرییە و ئەو دروست بوونە دەگەڕێتەوە بۆ تەکاندانی مرۆڤ و تواناکەی بەهۆی ویست و دەسەڵاتیەوە، و بەم ڕێگەیەش مرۆڤ تەنها بۆ ئەوە نەبووە خۆی بناسێ، بەڵکو هەروەها هەوڵدەدات بۆ دروست کردنی خۆیشی و ئەم بوونەوەرە کە بوونەوەری قەدەرەکانی سروشت و مێژووە، دوای ئەمە دەبێتە ئافرێنەری خۆی و خواوەندی سروشت ومێژووش، و ئەو وونەیەی تێدا جێ بەجێ دەبێ کە ئەو جێنشینی خوادایە لەسەر زەمین.

لەمەوە (نیچە)ی فەیلەسووف دەڵێ: مرۆڤ بۆتە خواوەند. هەروەها ووتەیەکی (هیگل) کە خواوەند لەم مرۆڤەدا دەردەکەوێت و ئومێد و پێشبینییەکانی ئەفسانە یۆنانییەکان بەدی دێ، کە تێیدا هەمیشە لەگەڵ خواوەندەکاندا لە پێشبڕکێدا بوون، لەمەشدا کۆتایی سزای مرۆڤ و ئازارە هەمیشەییەکانی مرۆڤ، دەبێت. مرۆڤ جارێکی دی دەگەڕێتەوە بۆلای خودای خۆی ودەگات بە بەهەشتە لەدەست چووەکەی، دوای ئەوەی کە لە زیندانە کۆنەکەی وستەمی سروشت ولەجەبری کۆمەڵگە وبیروباوەڕەکان ڕزگاری دەبێ، هەموو ئەمەش دوای زانینی بۆ زانستی مێژوو دەکاتە ئەنجام.

قوتابخانە مێژووییە هزرییەکان و ڕێبازی ساغ کردنەوەیان

خەڵکی بە گشتی سوود لەو ڕاڤەکاریانەی مێژوو وەردەگرن و هەریەکێك لەوان بەڕێگای تایبەتی و تاکەکەسیانەی خۆی دەیبینێ و تێی دەڕوانێ. لەسەر بنچینەی ئەم تێڕوانین و ئەم بینینەوە ڕێڕەو وبیروبۆچوونە جیاوازەکان دروست بوون کە بۆ هەریەکێکیان شوێنکەوتەو لایەنگیر هەیە، دەتوانین وەکو ئەمەی خوارەوە دابەشیان بکەین:

١- بنچینەیی بوونی شارستانیەت: زۆرێك لەخەڵکان هەن لەوانەی کە باوەڕیان بە بنچینەیی بوونی شارستانیەت لە مێژوودا، هەیە و باوەڕیشیان بە ناسینی شارستانیەتەکان لە مێژوودا هەیە و...بەزۆریش ئەمریکیەکان باوەڕیان وایە کە مێژوو واتە ئاشنابوون بە شارستانیەت و مێژووی شارستانی، ئەمەش لقێکە لە مێژوو، و بگرە ئەوە خوودی مێژووە.

٢- بنچینەیی بوونی کەلتوور: هەروەها کەسانێك هەن باوەڕیان بە پێویستی بوونی ناسینی کەلتوورەکان و کاروبارە مەعنەوییەکان هەیە، جا چ ئاینی بێت یان نا-ئاینی، بۆنموونە ناسینی کەلتووری میسری، یان ئێرانی، یان ئیسلامی، چینی، و جگەلەمانەش لە کەلتوورەکان، لەکاتێکدا ئەوانە باوەڕیان وایە کە ئەم کەلتوورانە بریتین لە زانینی مێژوو یان بریتین لە خودی مێژوو، و ئەمانە پێیان وایە کە پێویست بوونی ناسینی ئەم کەلتوورانەی ڕابردوو دەبێت بەناونیشانی ئەو زەخیرەو توێشووانەی لە ڕابردوو ماونەتەوە، کە مرۆڤ، دەتوانێ لە ئێستای و داهاتوویدا سوودیان لێوەربگرێت و هەرچەندەش پێشکەوێت ناتوانێت دەست بەرداریان ببێت.

٣- ڕەوتی بنچینەیی ڕووداو و واقیعە سیاسی و جەنگیەکان: زیاتر لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە لە مێژوونووسە کۆنەکانن و ئەمانە باوەڕیان وایە کە بەخوێندنەوە وتێگەیشتن لەم ڕووداو و واقیعانە، مرۆڤ توانایی بۆ ناسینی مێژوو دەبێت ودەتوانێ لێیەوە ڕۆح و مەعنەوییەتی مێژوو هەڵبهێنجێنێ.

٤- نکۆڵیکارانی مێژوو و کۆمەڵناسان: ئەمانە هەرگیز و بەڕەهایی باوەڕیان بە مێژوو نییە و پێیان وایە کە مێژوو شتێکی پابەندکراوە و لەسەر دالّفە (وەهم) و خەیاڵ بنیاد نراوە. کاتێک ئەوانە باوەڕیان وایە کە ئەم زانیارییانە چەوتن چونکە ئەم واقیعانە ناتوانرێت بەو واقیعەیەوە لە زەین و یادەوەریدا هەبێت، لەبەرئەوە کەم و کورت و چەوت و درۆزنانەن، کاتێك کە ئەم زانیارییانە بریتین لە زانیاری کۆتایی پێهاتوو کە هیچ سوودیان تێدا نییە وئەم زانستەش (واتە مێژوو) بێ سوود و قازانجە ومەحاڵ و ئەستەمە. ناپلیۆن دەربارەی مێژوو دەپرسێ و دەڵێ مێژوو چی یە؟ دواتر دەڵێ مێژوو هیچ نییە، ئەفسانەیەکە هیچ بنەمایەکی نییە. بەڵام جیاوازی لەنێوان مێژوو ئەفسانەدا بریتی یە لە بەرهەمی قبوڵکردنی خەڵکی. تەنیا ناپلیۆن نییە کە باوەڕی بەم بۆچوونەیە، کەسانێك و زاناگەلێك هەن کە باوەڕیان بەم مەسەلەیە هەیە و لەوانەش (ڕابت فالّیۆل) کە ئەم لە هەموویان بێ باوەڕترە بە مێژوو و زۆرترین دەمارگیریشی بۆ نکوڵی کردنی هەیە. ئەو دەڵێت: مێژوو بریتی یە لە بنەمای درۆ. بەڵام تیاشیاندا هەیە کە بە میانەگیری لە مێژوو دەڕوانێ و لەوانەش (بۆستیك) کە دەڵێ: مێژوو بریتی نیە لە واقیعەکانی ڕابردوو، بەڵکو ئەوە مێژوونووسە کە لەنێوان واقیعەکاندا ئەوە هەڵدەبژێرێ کە ئەیەوێت وبەپێی سەلیقە ورای خۆی ڕێکی دەخات.

بەڵام پارێتۆ (pareto) کە یەکێکە لە کۆمەڵناسە ناسراوەکان ولە سیاسیە ئیتالیە دیارەکانە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا ژیاون، خاوەنی کتێبی (مرۆڤ لە دواتر)ە، هەروەها ئەمیش نکوڵی لە مێژوو دەکات و باوەڕی بە بوونی نییە، و لەوانەی تر کە نکوڵی مێژوو دەکەن نووسەری ناسراو (بۆبەر ئەسقیمن)ە دانەری کتێبی (لینین و زانست).

نکوڵیکارانی مێژوو لە نکوڵیکردنیاندا بۆ مێژوو پشت بە تەنیا ڕێگەیەك نابەستن، هەندێ لەوانە پێیان وایە مێژوو زانستێکە کە نەبنەمای هەیە و نە حەقیقەتێك، هەندێکی تریان لەوانەن کە دەڵێن مێژوو مەحاڵەو نەشیاوە، هەندێکی تر دەڵێن مرۆڤ چۆن دەتوانێ کە لە پارچە ماوە پەرت وبڵاو و ڕەنگ وروخسار گۆڕاوەکان کە لە ملیۆنان پەیکەردا هەبووە، پەیکەرێکی تەواو پێکبهێنێ، کە مێژوویەکی دروستمان پێبدا بتوانین پشتی پێ ببەستین، بویەر کە باوەڕی بە مێژوو نییە دەڵێ: مێژوو بریتی یە ڕووداوەکان و وەرچەرخانەکان و ئازارەکان و خۆشیەکان، خۆ ئەگەر مێژوو بەم واتایە بێت ئەوا زانستی مێژوو مەحاڵ و نەشیاو دەبێت.

پێویستە مێژوو بەم واتایە تێنەگەین. وەهەروەها کۆمەڵگەش واتایەکی تری لەو واتایەی کە بۆی خراوەتە ڕوو، هەیە. زانینی هەر کۆمەڵگەیەك پێویسی بە ناسنی هەریەك لە تاکەکانە کە تێیدا دەژین، چونکە بارودۆخ و تایبەتمەندی و هەست و سۆزی تاکەکان یەکسان نین. خاسیەتە دیاریکراو و پەیوەستیە گشتیەکان هەروەها تایبەتمەندییە هەمەکیەکان و پەرچەکردار و هەستیارییە گشتیەکانی کۆمەڵگە کە مەبەست زانینیانە ئامانجی کۆمەڵناسی یە، کە کۆمەڵناسی کردۆتە زانستێکی شیاو. ململانێی ئالۆزیکی و خێزانی و

ــشتومڕە ڕەگەزییــەکان و درۆ و فڕوفێــڵ و هــەرزەگۆیی و ساختەچــێتی و لەخــشتەبردن لــەپێناو گەیــشتن بــە پلــەو پایەیەکــدا ئــەم کاروبارانــە لــە کۆمەڵناسیدا نین سەرەڕای ئەوەی کە بەشێکن لە کۆمەڵگە، بەڵام بەو جۆرەنین کە لە شێوازی ڕێکخستن و خاسیەتە دیاریکراوەکانی کۆمەڵگە کاریگەر بن.

مێژووناسی لە کۆمەڵناسی دەچێ و هەروەها لە ڕووەکناسی وئاژەڵناسی وئەستێرەناسی، کە پشت ئەبەستێ بەتایبەتمەندی و ڕاستیە سەرەتاییەکان و پــشت دەبەســتێ بــە دۆزینــەوەی گەیەنــەرە زانــستیەکان و نــەزانراوە زانستیەکان (المجهولات العلميه)، کە تێگەیشتن لەم بوارانە زۆر گرنگە و لەپێناو گەیشتن بەزۆر بوار کە بابەتی گرنگ لە ژیانی مرۆڤدا پێکدەهێنن، لەبەر ئەمە زانستی مێژوو پشت نابەستێ بە بەشەکیە تاکیەکان بەڵکو دەوەستێتەسەر هەمەکی وگشتەکیە گرنگەکان. هەروەکو زانای ئاژەڵی کە بەرپرس نیە لە ساغ کردنەوەی ئەو مەسەلەی کە تەمەنی مانگای فلانەکەس چەند ڕۆژە؟ یان بۆچی زیاتر لە کاو دانەکەی ناخوات؟ مێژووش هەر بەم جۆرە نا بەرپرسە لە لێکۆڵینەوە دەربارەی بەشەکیەکان، مێژوو بوونی هەیە و هەروەها زانستی مێژووش شیاوە. هەروەکو ئەوەی کۆمەڵناسی بریتی یە لە زانستی کەسەکان و زانستی جۆری مرۆیی و واقیعێکی زانستی هەیە و لێکۆڵینەوەی کارێکی بەسوود و شیاوو واقیعی پێکدێنی و زانستێکە لەسەر یاسا زانستیەکان بنیادنراوە، مێژووش زانستێکی کۆمەڵایەتیە دەربارەی کۆمەڵگاکان کە لە زەمەنەکاندا ژیاون وهەروەها پەیوەستیە هۆیەکیەکان جا چ ناچارەکی (جەبری) بن یان نا- ناچارەکی (غير جبرية) پێکەوەی

بەستوونەتەوە و کاریگەری دەستیاوانە (متبادل) لەنێوانیاندا هەبووە. ئەم کارتێکردن و کارتێکرانە لەنێوانیاندا شوێنکەوتەی واقیع و ڕاستێتی یەکانی ئەم جیهانەیە وشوێنکەوتەی بنچینە ویاسا باوەڕپێکراوەکانە. ئەمەش ناکرێت شتێکی وەهمکرد وبێ بنچینەو بنەما بێت یان لە ڕێگەی هەوانتە وڕێکەوتەوە هاتبێت، بەڵکو مێژوو شوێنکەوتەی ئەم بنچینە و یاسایانەیە کە لەسەریانەوە بنەما وبنچینەکانی خۆی بنیادناوە.

مرۆڤ کەلەسەر ئەم زەمینە لە زیاتر لە سەدان هەزار ساڵەوە دەژی زەمینە واقیعی و دیارەکانی وبیرو بۆچوونەکانی و بارو دۆخەکانی و خاسیەتەکانی و سۆزو هەستەکانی و کارەکانی، ئەو بوار و کاروبارانەیە کە بابەتی مێژوویان پێکهێناوە. مێژوو بەخوێندنەوە و تێگەیشتن لەم بوار ومەسەلانە ولێکۆڵینەوەیان و زانینیان دەگات بە هەموو هۆکار وڕێکخەر وبنچینە گومان هەڵنەگرەکان ویاسا زانستیەکان کە حوکمی مێژووی ژیانی مرۆیی دەکەن وبەمەش مێژوو سەرکەوتوو دەبێت لە کاتی گەیشتن بەم ئامانجە.

ناکرێت مێژوو کۆمەڵێك ڕووداوی بێ ڕواڵەت وبنچینە بێت، بەڵکو ڕێڕەوێکی پەیوەنددار وگۆڕاوو تەواوکار (متکامل)ـە کە مرۆڤ دەتوانێت پێیدا تێپەڕێت.

(فردریك شلیگل)ی مێژووناس دەڵێ: ئەوەی کە دەربارەی مەسەلەکانی رابردوو هەواڵمان پێئەدا وئاگادارمان ئەکاتەوە، ئەوەی لێی داواکراوە ئەوەیە کە لەسەریەتی لە مێژووی گشتی مرۆییدا قووڵ بێتەوە، و کاتێکیش بەم جۆرە دەبێت بە کۆمەڵگاکان ئاشنا دەبێت وبەم شێوەیەش دواتر تەواوکاری

بەدەست دێنیێ بۆیەکتریش دەبێتە میرات وقۆناغە دیاریکراوەکان دەبڕن وئەگەرچی ئەوان لە بارودۆخە تایبەتیەکاندا جیاوازن بەڵام لە مەسەلە گشتیەکاندا هاوبەشن.

ئەگەر هەموو ئەمانەمان لەبەرچاو گرت ئەوا دەبینین مێژوو بابەت و بوارەکەی ڕابردووە، بەڵام ئامانجەکەی ئێستا وداهاتووە و سەرەڕای ئەوەی بابەتەکەی کۆتایی پێهاتووە، بەڵام ئامانجەکەی بوونی هەیە، مادام ئامانجی مرۆڤە کە هەمیشە هەیە ئەوا ئەویش بوونی دەبێت.

مێژوو دەچێتەوە بۆ ڕابردوو بۆئەوەی دەنگ وباسمان دەربارەی مرۆڤ پێبدات، و ئەگەر بێتوو کە نیوەی مرۆڤ لە ڕابردوو ژیابێت ونیوەکەی تریشی لە داهاتوو، ئەوا ئەو دەربارەی مرۆڤی ڕابردوو هەواڵمان پێئەدا و، بەمەش دەتوانێ دەربارەی مرۆڤی داهاتوو ئاگادارمان بکاتەوە، دوای ئەوەی کە مرۆڤی ڕابردوومان ناسی و ئەوەمان زانی کە ئەم مرۆڤە چی کردووە و چۆن بووە. چونکە مرۆڤ لە درەختێك ناچێ کە لەکاتی خۆیدا دەژی وکۆتایی پێدێ و لەناودەچێ، بەڵکو مرۆڤ ڕەگ وڕیشەگەلێکی لە قووڵایی سەدەکانی ڕابردوودا هەیە، و ئەگەر مرۆڤی ئێستا توانا و بنەڕەت بێت لە بڕیارێکی باڵای دەرکراو لەسەر خوێندنەوەی مێژوو، ئەوا دۆخەکە بەو جۆرە دەبێت کە (لتۆرنۆ) بۆی وێنا کردووین: ئێمە هەر لەخۆوە و بێ هوودە هەوڵماندا هەتا کتێبێکمان دانا و دەربەستیمان تەنیا لە لاپەڕەی کۆتاییدا بوو و وازیشمان لە لاپەڕەکانی سەرەتای هێنا.

هەروەها کۆمەڵناسانیش لە بیریارانی مێژوون، ئەمانە تەنیا باوەڕیان بە کۆمەڵناسی مێژوویی هەیە. وای دەبین کە خوێندنەوەی کۆمەڵگاکانی ڕابردوو

پێویستە وەکو خوێندنەوەی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ وابێت. چونکە وادەڕوانن کە گرنگــی خوێندنــەوەی مێــژوو تــەنیا لــە کەڵکیــدا بــۆ کۆمەڵناســی خــۆی حەشاردراوە، لەکاتێکدا دەتوانین تەنیا ئەو بابەت وشتانە بخوێنینەوە کـە بـۆ ئـەم زانسـتە سـوودی هەیـە" بۆنموونـە خوێندنـەوەی کۆمـەڵگای ئەسـینا لـە هەردوو سەدەی سێیەم و چوارەمی پێش زایـین تـەنیا لەبەرئـەوەی کـە ئـەم خوێندنەوەیە بۆ کۆمەڵناسی بەکەڵکمان دێت، بـەڵام بابەتـەکانی تـری وەکـو (چیرۆکی داراب، و نامەی ئەسکەندەر، ونامەی ئەبو موسلیم و حوسێن کـورد ومێژووی شار وەکو: قوم و یەزد وبەڵخ و ئەوانی تر، ئـەوا خوێندنـەوەی ئـەم بوارانــە زیــاتر بەهایــەکی نووســراوییان هەیــە لــەوەی کــە سەرچــاوەی باوەڕپێکراوی مێژوویی بن).

ئەمەش واتـە کتێـب و سـەرچاوە مێژووییـەکان وەکـو تەبـەری و ئـەوانی ترهیچ بەهایـەکی مێـژووییان نییـە، بـەڵام کتێبـە گشتیەکانی تـر، ئاشـنامان دەکەن بە دۆخی ژیان و بیروبۆچوون و سروشتەکانی خەڵکی کە لەو زەمانەدا هــەبوون و ئەمــەش ڕۆح وبــارودۆخ و کرۆکیــەکانی ســەردەمێکی زەمــەنی دیاریکراو یان کۆمەڵگایەکی دیاریکراو دەدۆزێتەوە. هەروەك چۆن گومان نییە لەوەی کە گواسـتنەوەی ڕووداوەکـانی ڕابـردوو هـیچ سـوودێکی نییـە، بـەڵام گرنگی لە گواستنەوەیاندا بۆ زانینی ڕووداوەکان وناسین وتێگەیشتنیانە. ئەو وێنەیەی کە کۆمەڵناسان دەربارەی مێژوو بۆیان کێشاوین ناکرێـت بڵـێین کـە تەنیا یەك مێژووی سەربەخۆ وزینـدووە. چـونکە ئەگـەر مێـژوو گوزارشـتە لـە کۆمـەڵگایانی پـەرت وبـڵاو، ئـەوا لێـرەدا گومانێـك نیـە لـەوەی کـە زانیاریـە کۆمەڵایەتیەکانمان قووڵ و ناکۆتا دەبێت بەڵام ناتوانین مێژوو وەکو مێـژووی

نا–پەرت و نا– دابەشبوو تێبگەین. هەروەها ناتوانین مێژوو وا بناسین کە ئەو تەنیا کارکردە کە ڕەوتێکی دیاریکراوی لە زەماندا هەیە وهەروەها بەناونیشانی واقیعێکی سەربەخۆوە ژیان وئامانجی هەیە، کۆمەڵگا وکەلتوور وشارستانیەتە جیاوازەکانیش بریتین لە بەشەکانی ئەم (یەک)ـە. بەپێی گووتەی (گۆرفیچ) ئەگەر مێژوو وەکو جەستەی مرۆڤ لە بەشە جیاوازەکان پێکهاتبێت، کەواتە دەمرێت و ئەمەش واتە ئێمە زانیاری تەواو وتەواوکراومان دەربارەی خودی مێژوو بەو شێوەیەی کە هەیە دەبێت، وەکو بەشانی ناتەواو. ووردترین پێناسە دەربارەی مێژوو لایەنگرانی سروشت خستیانە ڕوو، ئەمەش ئەم پێناسە گشتگیرەیە کەبە (ڕێگای ناسینی مێژوو) ناسراوە ودواتر باسکردنی دێت بە پشتیوانی خودا.

## ڕێگای زانینی مێژوو

ئامانج لە خوێندنەوەی مێژوو بەدەستهێنان وگەیشتنە بەو یاسا ونەزانراوانەی کە لە مێژوودا هەن وشاردراوەن، و بۆ گەیشتن بەم نەزانراوانە پێویستە لەسەرمان کە هەستین بە لێکۆڵینەوە وتوێژینەوەی قووڵ بۆ مێژوو(٣)، لەدیدی منەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە وەها بابەتێك و لەپێناو گەیشتن بە ئەنجامگەلی باش پێویستە لەسەرمان کە سوود وەربگرین لە ڕێبازی زانستی کە پرۆسەی لێکۆڵینەوەکەمان لەسەر ئاسان دەکات و لەوانەش ڕێگەی (ناسینی مرۆڤ)، چونکە مێژوو لە لێکۆڵینەوەکردنیدا ڕێك لە مرۆڤ دەچێ، ئەو مرۆڤەی کە بەدرێژایی ئەم زەمانە ژیاوە ولە قووڵایی سروشتدا، و لەناو ئەو یاسایانەی کە لە ناخی و تایبەتمەندییە خوودییەکانی و چییەتی (ماهیەت)ی خۆیدا هەیە.

بەڵام ئەوانەی کە باوەڕیان بە ڕەسەنایەتی کلتوور هەیە وایدەبینن کە ئەگەر مێژوومان وەك مرۆڤ وەرگرت ئەوا لەسەرمانە کە لەم مرۆڤە بکۆڵینەوە وبیناسین لەڕووی زانستی و هەست و سۆزەکانی وئاکاری و بوارەکانی تریەوە. بەڵام تێڕوانینی ئەوانەی وایدەبینن کە لە لێ توێژینەوەی مرۆڤدا گرنگ بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی ڕووداوە مێژووییەکانە کە پێیدا تێپەڕیوە، واتای ئەوەیە کە ئەوان لەو مرۆڤە دەکۆڵنەوە تەنیا لەم لایەنانەوە (ئایا نەخۆش کەوتووە، لەچ کاتێکدا سەفەری کردووە، لەچ قۆناغێکی تەمەنیدا هاوسەرگیریی کردووە...تاد). هەرچی کۆمەڵناسانە باوەڕیان بە پێویست بوونی ناسین ولێکۆڵینەوەی کۆمەڵگاکان هەیە، بەڵام بەشێوەی بەش بەش کراو (ژیانی تاك، پاداشت و کرێی ڕۆژانەی، تایبەتمەندییە خێزانی و کۆمەڵایەتیەکانی).

گومانی تێدا نییە کە ئەمانە بەدوای مەسەلە گەلێکی گرنگدا دەگەڕێن وەکو گەیشتن بە قازانج و هەست و سۆزەکان و نەخۆشیەکان، و سەفەر، و ژیانی ڕۆژانە وبارودۆخی خێزان وئەوان تر لە بوارە گرنگەکان لە ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگادا. بەڵام سەرەڕای گرنگی ئەم بوارانە کەچی هێشتا ناگاتە ئامانجی خوازراو کە بریتیە لە ناسینی مرۆڤ بەشێوەیەکی تەواو. چونکە هەر تاکێك بە تەنیا واقیعێکی هەمەکی پێکدێنێ کە هەموو ئەم بابەتانە لەخۆ دەگرێت.

هەندێ کات هەڵەیەك لە تێگەیشتنی مەسەلەکاندا ڕوودەدات ئەویش ئەوەیە کە (گشت) هەموو بەشەکانی (واتە بەشە پێکهێنەرەکانی) نانوێنێ وتەنیا بۆ هەموو بەشەکانی گشتگیر دەبێت. بەستەرەکانی ئەم بەشانەو ڕۆحی بەدەستهێنراو لەم پەیوەستیەدا و هەروەها ئەو وەرچەرخانانەی

بەسەریدا هاتووە بە درێژایی زەمان کە پێویستە بۆی زیاد بکرێ لەڕاستیدا بارێکی (هەمەکی) دەنوێنێ، ئەوەش ئەم ڕۆحەیە، چونکە درەخت تەنیا گوزارشت نیە لە ڕەگ و گەڵاو لق و پۆپەکان، یان ڕووبار گوزارشت بێت لە بەشەکانی ئاو و ڕێڕەوی ڕووبار بەڵکو شتێکی تر هەیە وئەویش هۆکاری زەمەنە کە بوونی هەیە.

ڕاستە کە پێکهاتەی ئەم درەختە گوزارشتە لە پێکهاتەی ئەم بەشە دیارانە، بەڵام هەروەها پێویستە هۆکاری زەمەن بۆ بابەتەکە زیاد بکەین، ئەمەش واتە زیاد کردنی گۆڕان وگۆڕانکاری وئەو ڕوودوانەی کە بەسەر ئەم درەختەدا هاتووە، ئەمەش واتە حەقیقەتی هەمەکی بۆ ئەم درەختە بریتیە لەکۆی بەشەکان لەگەڵ کارکردی زەمەن یان وەرچەرخان وگۆڕانکاری و ڕووداوەکان کە پێیدا تێپەڕیووە.

چەندین پێشنیار وبیروبۆچوون بۆ زانینی توێژینەوەی مێژوو خراوەتە ڕوو، بەڵام لە دیدی منەوە هەموو ئەم تێزەووردانە لاوازیان تێدایە یان بواری لێکۆڵینەوەکە ئاڵۆز وقورس دەکەن وبەزۆریش مەبەستی خوازراو نادەن بەدەستەوە ونامان گەیەننە ئامانجە بڵندەکە کە گەیشتنە بە مێژوو. هەرچی ئەو پێشنیار و ڕێگایەیە کە من ئەیخەمە بەردەست، ئەوەیە کە هەوڵمداوە ئامانج و ئەنجامە بەدەستهێنراوەکان لەو تێزانە کۆبکەمەوە، بەپشت بەستن بە زانستەکان لەپێناو گەیشتن بە ئامانجێکی باڵا و ڕێگایەکی نوێ بۆ زانینی مێژوو. ئەو ڕێگەیەش کە ئەیخەمە ڕوو بریتیە لە:

١- دابەشکردنی مێژوو بۆ سووڕگەلێك (دورات)ی دیار ودەست نیشانکراو، لەکاتێکدا کە هەموو خولێك لەم سوڕانە دەکرێت دابەشی بکەین بۆ

خولگەلێکی دیار وڕوون ئاشکرا وەکو سووڕی منداڵی و سووڕی دوای منداڵی پاشان سووڕی گەنجی و سووڕی پێگەیشتن و تاد. پێویستە توانای هەر سووڕێك پشت نەبەستێت بە تەمەن وساڵ بەڵکو پشت ببەستێت بە تایبەتمەندی و هێما ڕۆحی و جەستەییە دیاریکراوەکان، لەکاتێکدا لەڕێگای ئەم دابەشکردنەوە دەتوانین پێناسەیەکی گشتی و لۆژیکی بخەنەڕوو. ئەم کارەش لە کاری جوگرافیاناس و سروشتناسەکان ئەچێ کە زەوی بۆ چەند سووڕێك دابەش دەکەن، هەروەها مێژووش دەتوانرێت وەکو ئەو دابەشکارییە دابەش بکرێت(٤).

(لێرەدا خاڵێکی زانستی گرنگ هەیە دەتوانین هەر بۆ زانیاری ئاماژەی پێبدەین ئەویش ئەوەیە کە مێژووی مرۆڤ واتە، مرۆڤ لە مێژوودا، ئەم گوزارەیەش لەناو دەبرێت لە گوزارشت و لە ڕشتەی ئەدەبیدا، بەپێچەوانەی بابەتی مێژووەوە کە چەماوەیەکی واقیعیمان بۆ مێژوو دەداتە دەست، لەکاتێکدا کە کۆمەڵێك هەن مێژوویان بە پێناسەگەلێکی گرنگ و ئاڵۆز ناساندووە، بەڵام گەر لەم پێناسە سادە وکورتەدا بگەڕانەیە ئەیانتوانی بگەنە واتای خوازراو لە پێناسەکردنی مێژوودا).

مەبەست لە ووشەی (سووڕ) کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا هێنرایە ئاراوە، بریتی یە لە ماوەیەکی زەمەنی(٥). لەکاتێکدا کۆمەڵگا لەم سووڕەدا ڕۆحێك و ڕواڵەتێکی دیار وتایبەتمەندی کۆمەڵایەتی و کەلتووری وسیاسی و مەدەنی جیامەندی هەیە، لەبەر ئەمە ئەو یەك سووڕەیە ئەکرێت کەمتر لە یەك سەدە یان زیاتر لە هەزار ساڵ بەردەوام بێت. سەدەکانی ناوەڕاست تەنیا یەك

سووڕبوو کەچی هەزار ساڵی خایاند، هەروەها سەرەتای ئیسلام وکۆمەڵگەی ئیسلامی وسووڕی خەلیفەکانی ڕاشدین سووڕەکەیان ٤٠ ساڵ بوو.

٢- زانینی هەر سووڕێك لەم سووڕانە و هەستان بە ووردبینیکردن و دیاریکردنی خاسیەت و حاڵەت و تایبەتمەندی ورۆحیەت و ڕواڵەتە گشتیەکانی ئەم سووڕەو گەیشتن بە پێناسەیەکی لۆژیکی و کۆگیر (الجامع) بۆ هەر سووڕێك لەم سووڕانە، و هەورەها توێژینەوە و خوێندنەوە و تێگەیشتن و شی کردنەوە و ڕوونکردنەوەی هەموو بوارە پەیوەستەکان بەو سووڕەوە وئەویش بوارە مێژوویی وئەدەبی وهونەری ودینی وهزری و ئابووریەکانە وهەروەها ئاداب ونەریتە جیاوازەکان ورۆحی ئەو سووڕە وئەو هەستیاریانەی کە تێیدایە و هەروەها بەستەرەکان وڕواڵەتی ئاراستەکان و ئارەزووەکان وپێتەوی ولاوازی ئامادەکارییە جیاوازەکانی کۆمەڵگەیەك بەیەك ڕێگە ئەو کاتە ولەمیانەی توێژینەوەی ئەم بوارانەوە دەتوانین هێڵێکی وورد وبنچینەیی بۆ ئەم سووڕە بکێشین.

٣- گواستنەوە و وەرچەرخان :

أ- پێوانەکردنی ئەم سووڕانە لەگەڵ یەکتردا و بەتایبەتیش لەگەڵ سووڕە هاوشێوەکانیان لە مێژووی کۆمەڵگاکانی تردا، ئەمەش بەکارێکی زۆر گرنگ دادەنرێ چ لە کاتی ئێستادا بێت یان داهاتوو، لە کاتێکدا توانای خوێندنەوەی مەسەلە جیاوازەکانمان لە بوارە جیاوازەکاندا دەبێت وبەم ڕێگەیەش تەنها لە ڕاستی زانیاریەکانمان دڵنیا نابین، بەڵکو هەروەها دیاردەگەل و تایبەتمەندگەلی نوێمان بۆ دەردەکەوێت، لەمەش گرنگتر بریتی یە لە حوکمە گشتیەکانی مێژوو، کە زانستی مێژوو (مێژووناسی) ئەیدۆزێتەوە

وەهەروەها کەشفکردنی پەیوەستیە زانستی یە لۆژیکیەکان لەنێوان دیاردە مێژووییەکاندا کاتێک کە زانینی ئەو پەیوەستیانەی لەنێوان دیاردە مێژووییەکاندا هەیە، یەکیەتی مێژوو و پەیوەستیە مێژووییەکانمان بۆ دەسەلمێنێ وجێگیردەکات.

٤- دیاریکرنی چەماوە یان هێلێکی گشتی بۆ کەسایەتی مێژوو یان تاك. بەدەربرێنێکی تر، زانینی چۆنیەتی ناسینی مێژوو یان تاك و ئەمەش ئامانجی سەرەکیە لە لێکۆڵینەوەکە وبەزانینی مێژوو زانینی جووڵەی کۆمەڵگە بەدرێژایی کات (شیاو وگونجاو) دەبێت وەهەروەها زانینی سوورە جیاوازەکان کە پێیدا تێپەڕیووە وپاشان دەتوانین وێنەی چەماوەیەکی گشتی بۆ ڕێڕەوی وچۆنیەتی نرخاندنی مێژووەکەی بکێشێن.

٥- لێکۆڵینەوە وشی کردنەوەی هێڵە جیاوازەکان وبەشێوەیەکی گشتیش دوو هێڵی سەرەکی، ئەوانیش ڕژێمی کۆمەڵایەتی و ڕژێمی کەلتووری بۆ یەك مێژوو وزانینی خاسیەتە هاوبەشەکانی نێوان ئەم دوو سەردەمە هەروەها بەش بەش کردن و شی کردنەوەی گەیەنەرە هۆییەکان لەنێوان ئەم دوو سوورەدا ونووسینەوەی ڕێڕەوە گشتیەکانی کە پێی دەگەین لەپێوانە کردن وچوونیەك کردنی ئەم دوو سوورەدا.

٦- لەکۆتایشدا زانینی مێژووی هەمەکی بۆ مرۆڤایەتی، ئەمەش لەڕێگەی خوێندنەوەی بواری کەسێتی چەماوەکانیەوە واتە زانینی ڕەوتی گۆڕانکارییە مێژووییەکانی کۆمەڵگە جیاوازەکان و بەراووردکردن وچوونیەککردنی ئەم بوارانە لەگەڵ یەکتریدا وهەڵهێنجانی یاساکانی ژیان و هەروەها جووڵەی مێژوو بەو پێیەی واقیعێکە بوونی هەیە وسروشتێکە سەرەتایەکی هەیە. هەروەها

زانینی دەستکەوت ورەوت و قۆناغە جیاوازەکان لە ژیاندا ولەپاشان زانینی یاسا لۆژیکی و زانستیەکانی مێژوو وبارودۆخ وجوولەکانی لە کوێوە هەڵدەقوولێ؟ ولەکوێوە دەژی؟ کێیە کە لاواز وبەهێزی دەکات؟ نەخۆشیەکانی چین؟ هەروەها زانینی تەندروست بوونی و هۆکارەکانی بڵندبوون و داڕووخانی و کارکردە کاریگەرەکان لە گۆڕان وگۆڕانکارییەکەیدا، بە دەربڕینێکی تر، دۆزینەوەی یاساکانی مێژوو وزانینی مرۆڤی مێژوو (مرۆڤی ئێستا) و ئەمەش واتە زانستی مێژوو وپێشبینیە زانستیەکان بۆ مێژووی داهاتوو. هەتا بتوانین زانیاریمان لەسەر خۆتێهەڵقورتانێکی زانستیانە بۆ گۆڕانکاری چارەنووسی کێشراوی ناچارەکی، هەبێت. ئەمەش لە خۆهەڵقورتانمان (تدخل) لە گۆڕانکاری یاسا زانستیەکان لە ڕەوتی سروشتیی جوولەی ڕووەکەکان دەچێ، وە دەتوانین بەشێوازێکی زانستیانە دەستوەردەین لە گۆڕانکاری ڕەووتی مێژوو لە داهاتوودا.

ئەو ڕێگەیەی کە بۆ زانینی مێژوو پێشنیارمان کرد دەتوانین بە شێوەیەکی ڕوون تر و وردتر تێبگەین لەمیانەی چاوخشاندنێك بە مێژووی کلتووریی ئێراندا وەکو نموونەیەك.

یەکەم: دابەشکردنی مێژوو بۆ سووڕە کەلتوورییە دیاریکراوەکان:

توانای زانینی دوو سووڕ وجیاوازییەکان لەنێوانیاندا بریتی یە لە زانینی گۆڕان لە بارووودۆخی کۆمەڵایەتی هەردووکیاندا. هەورەها زانینی سیستەمی کەلتووری و خێزانی و ئایینی و ڕۆحیەکانی هەردووکیان، لەبەرئەمە لەپێناو دابەشکردنی مێژوودا بۆ سووڕە جیاوازەکان، لەسەرمان پێویستە کە بەشێوەیەکی گشتگیرانە شارستانی وکەلتوور و ڕووداوەکانی ئەو کۆمەڵگەیە

بناسین، هەتا بتوانین سنووره سەرەتاییەکانی ئەو سووڕانە دیاریبکەین. بەڵام ئەگەر بەتەنیا ڕووداوە میژووییەکانمان زانی، بەبێ خوێندنەوەی بوارەکانی تر، ئەوا ئێمە سەرکەوتوو نابین لەگەیشتن بە ئامانجە خوازراوەکان. لەبەرئەوە ئەگەر ویستمان میژووی ئێران بزانین، لەسەرمان پێویستە کە دابەشی بکەین بۆ ئەم سەردەمانەی خوارەوە(٦):

١- سەردەمی کۆن یان سەردەمی ئەفسانەکان.

٢- سەردەمی کەلتووری نەتەوەیی ئێران.

٣- سەردەمی ژیانی یۆنانی.

٤- سەردەمی نەتەوەیی ئاینی.

٥- سەردەمی ئیسلامی.

٦- سەردەمی کاریگەری نوێی ڕۆژئاوایی.

دووەم: پێویستە هەر سووڕێك لەم سووڕانە بەشێوەی تاکی بزانین و بگەینە پێناسەیەکی لۆژیکی بۆ هەریەکێکیان، بۆنموونە لەپێناو زانینی سەردەمی ئەفسانەکاندا پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و ووردی بۆ بخەینەڕوو. لەم سووڕەدا دەبین کە کلتووری گشتی لەم کاتەدا باڵادەست بووە، چیرۆك و ئەفسانە وشعرەکان لە دیاردە وخاسیەتەکانی ئەو سەردەمەن. هەروەها لە خاسیەتە جیامەندەکان بوونی کتێبی گرنگی وەکو ئاڤێستا(٧) و کتێبی پەهلەوی وشانامەیە وجێگای تێبینیە کە چیرۆك و ئەفسانەکانی ئەم سەردەمە تاڕادەیەك لە ئەفسانە یۆنانیەکان وئەفسانەکانی وولاتی نێوان دوو ڕووبار وئەفسانە میسرییەکان وئەفسانە ئارياییە هندییەکان دەچێ، ولەمیانەی توێژینەوەی ئەم دیاردانەوە وخوێندنەوەی ئەو شوێنەوار

وپاشماوانەی کە هەیە دەتوانین بگەین بە تەواوی زانیارییەکانی ئەم سەردەمە ودواتر دەتوانین پێناسەیەکی لۆژیکی وشی کردنەوەیەکی زانستی ولۆژیکی بۆ سەردەمی ئەفسانە ئێرانیەکان بخەینەڕوو.

سێ یەم: گواستنەوە لە هەر سەردەمێك بۆ یەکێکی تر:

أ- بەراووردکردنی ئەم سووڕانە لەگەڵ یەکتردا، لەم قۆناغەدا بەراووردکردنی سووڕی ئەفسانەیی لەگەڵ سووڕی نەتەوەیی ئێرانیدا ئەنجام دەدرێت، بەم بەراووردکردنەش دەتوانین لێکۆڵینەوەی ئەو گۆڕانکارییانە بکەین کەلە کاتی گواستنەوەی مێژوو وکۆمەڵگای ئێرانیدا لە سووڕی ئەفسانەییەوە بۆ سووڕی نەتەوەیی ڕوویانداوە، وهەروەها تێبینی کردن و زانینی زانیاری خەڵکی و تێڕوانینیان دەربارەی ئەم وەرچەرخانە بەدەستهێنراوە، پێویستە. هەروەها دەتوانین چاودێریی لێکۆڵینەوە وتێبینی ڕووداو وگۆڕانکارییە هزری و کلتووری و ئاکارییەکان و پەیوەستیە کۆمەڵایەتیەکان و کارکردە ناوەکی و دەرەکی وئابووری وسیاسی وباوەڕییەکان بکەین، لەمیانەی ئەو وەرچەرخانە گەورانەی کە لە سووڕێکەوە بۆ ئەوی تر ڕوویانداوە وپاشانیش تێبینی کردنی ئەوەی کە کلتووری ئێرانی چی بەسەردێ کاتێك کە کۆمەڵگاکە لە ئاینی زەردەشتیەوە خۆی ئەگوازێتەوە بۆ ئاینی ئیسلام. هەموو ئەم بوارانە نووسینەوە و لێکۆڵینەوە بەراوووردکردنیان لەگەڵ یەکتریدا لەو سووڕانەدا پێویستە.

ب- بەراوورد کردنی هەر سووڕێك لەم سووڕانە لەگەڵ سووڕە هاوشێوەکانیاندا لە کۆمەڵگاکانی تردا، لەپێناو ئەم بەراووردکارییەشدا

لێکۆڵینــەوە و ئاشــنابوون بــەو ســووڕەی کــە ئــەکرێت نزیــك بێــت وزۆر هاوشــێوە بێــت بــەو ســووڕەی کــە مەبەســتە بخوێندرێتــەوە و بــەراوورد بکرێــت، پێویــستە، پاشــان دەتــوانین ڕووە لێکــچووەکانی نێوانیــان وپێوانــەکردنیان بەیــەکتری تۆمــار بکــەین و بنووســینەوە. بۆنموونــە بەراووردکردنی سووڕی یۆنانی کە بەسەر ئێراندا باڵادەست بووە لەگەڵ سووڕی یۆنانی کەبەسەر ئاسیای بچووکدا دوای ئەسکەندەر باڵادەست بووە، کە بــەراووردکردنی ئــەم دوو ســووڕە لەگــەڵ یــەکتردا پێویــستە و، هەرچــەندیش ســووڕی زەمــەنی بــۆ ئــەم دوو ســووڕە نزیــك و کورتتربێــت لەیەکتر، ئەوا لێکۆڵینەوەکە زیاتر سوودی دەبێت.

چــوارەم: کێــشانی چــەماوەی تــەواو بــۆ گــۆڕانی ئــەو ســووڕە بەدوایەکــدا هاتووانەی کۆمەڵگەی کلتووریی ئێرانی، لەسەردەمی ئەفسانەی ئێرانیەوە بـۆ ســەردەمی نوێبوونــەوە وهەیمەنــەی کلتــووری ڕۆژئــاوایی، لەکاتێکــدا کــە ئەوگۆڕانکارییانەی بەرزبوونەوە ونزمبوونـەوەی خێـرا یـان هێواشـیان هەیـە، لەســەر ئــەم چــەماوەیە بەدەردەکــەوێت. هــەروەها دەتــوانین لێکۆڵینــەوە وتێبینــی گۆڕانکاریــە شۆڕشــگێڕییەکان ودۆخــە هێرشــکاری و بــەرگریکاری وکــەلتووری وکاریگەرییــە جیاوازەکــانی شارســتانیمان لەســەر ئــاین و نەتەوەخوازی ولەسەر هزرمان، بکەین، هــەروەها دەتــوانین تێبینــی کرانــەوە وداخران وتێبینی بنچینە کلتووری و فەلسەفیەکان وزانست و ئاداب و هونـەر وئــاین وڕێگــای پەرســتش ودەمــارگیری نەتــەوەیی وبــوارە مــاددی و مەعنەوییــەکان، بکــەین، کــە تێبینــی کردنــی ئــەم بوارانــە ولێکۆڵینــەوەی گۆڕاوەکانی لەمیانەی ئەو سووڕە جیاوازانەوە دەتوانێت کۆمەکمان بکـات لـە لێکۆڵینەوەی ئەو سووڕانە وناسینیان بەشێوەیەکی باش.

پێنجەم: دوای ئەم لێکۆڵینەوە و بەراووردکارییانە دەتوانین بگەینە کۆتایی چەماوەکە کە ڕەوتی ئەو سووڕانە دەنوێنێ و هەمووشیان ئەو مێژووە کە دەمانەوێت بیزانین، دەنوێنێ.

کاتێک توێژینەوەی دەروونزانی کۆمەڵایەتی دەکەین، ئەوا ئێمە هەڵدەستین بە توێژینەوەی دەروونیی تاک و کۆمەڵگای ئێرانی و تایبەتمەندییەکانی چین و ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەریدا هاتووە چین. هەروەها دەتوانین لەم چەماوەیەوە ڕەوتی شارستانیەت هەڵبهێنجین وهەروەها ڕەوتی ئابووری لە لێکۆڵینەوەی باری دارایی تاک (دەوڵەمەندی و هەژاری و بڕی ئەو سامانەی کە خاوەنیەتی)، کە ئەم بارودۆخە لەسەر ڕەوتی شارستانیەت کاریگەری دەبێت. لەپاشان بەراووردکردنی شارستانیەتی ئێرانی لەم لایەنەوە لەگەڵ سووڕی ئیسلامیدا لەئێران ئەنجام دەدرێت. ئەکرێت کە جیاوازییەک لەنێوانیاندا لەڕووی پلەو قەبارەوە نەبێت، بەڵام ئەکرێت تێبینی جیاوازییەکان لەبوارەکانی تردا بکەین و هەروەها دەتوانین وێنەی چەماوەیەک بکێشین کە ڕۆحی بەرگریکاریی ئێرانی لەبەرامبەر داگیرکارییەکانی بێگانە وشیاوییەتی قبوڵکردنی دوژمن وهێرشە ئەنجامدراوەکە بنوێنێ. پاشان دەتوانین وێنەی چەماوەیەکی تر بکێشین کە گەشەکردن وکامڵ بوونی مرۆیی و پەروەردەیی وئاکاری میللەتانی ئێران دەنوێنێ.

دەتوانین وێنەی چەماوەیەکی تر بکێشین زانیارییە خودی ونەتەوەیی وسیاسی وسروشتیەکان دەنوێنێ. وچەماوەیەکی تر دەتوانین وێنەی بکەین ئاراستە ئاینەکان دەنوێنێ ویەکێکی تر دەست کەوت وهێزی شارستانیەکانی

تر دەنوێنێ وهەروەها چەماوەیەکی تر ژێرخانی ئـابووری وڕژێمـی چینـایەتی ومیبــستەمی سیاســی ورەگــەزە بنەچــەییە بێگانــەکان و گۆڕانکــاری و وەرچەرخانەکانی دۆخـی جیهـانیی ئێرانـی ورووداوە مێژووییـە جیهانییـەکان وڕێکخەرەکان وشوێنگەی جیهانی بـۆ ئێرانـی جـێگیر وگـۆڕاو بنـوێنێ. دواتـر بەراووردکرنی ئەم چەماوانە لەگەڵ یەکتردا لە سوورە جیاوازەکاندا وگەیـشتن بەو پەیوەستیە هۆییەی نێوان جووڵە وگۆڕانکارییەکانی ئەو چەماوانە، پاشان شیتەڵکردن وبەش بەش کردنی زانیارییە بەدەستهێنراوەکان بـۆ گەیـشتن بـە چەماوە وڕێژەیەکی نەگۆڕ. ئەم چەماوەی کۆتایی کە لە بـەراووردکردنی ئـەو چەماوانەوە بەدەستی دێنین مێژووی ئێرانی دەنوێنێ.

بەدواداچــوونی ئــەم لێکۆڵینەوانــە (واتــە لێکۆڵینــەوەی ســوورەکان و چــەماوەکان) ڕووبــەڕوودانیانیان (مطابقــة) لەگــەڵ یەکتریــدا ئــەنجامێکی بەرهەمدار دەداتە دەستمان کـە ئـەکرێت کاریگـەری لـە توێژینـەوەی ڕەوتـی کۆمەڵگاکانی تردا هەبێت، هەروەها ئـەم توێژینەوانـە لـە کەشـفکردنی بنـەما گـشتیە هاوبەشـەکان کـە زانـستی مێـژوو بۆمـان دەدۆزێتـەوە، سـوودمان پێدەگەیەنێ.

توێژینەوە وخوێندنەوەی مێژوو پێویستە بەشێوەیەکی زانستی ئـەنجام بدرێت، وەکو ئەوەی لە خوێندنەوە وتوێژینەوەکردنی زانستەکانی تردا باوە، وەکو زانستی ئابووری (ئابووری ناسی) وکۆمەڵناسی وزانستەکانی تر. کاتێـک توێژینــەوە بــەم ڕێگــە زانــستیە ووردە دەبێــت، ئــەوا ڕێگــەی بۆچــوون و پێشبینییەکان لە نووسینەوەی مێـژوودا کـەم دەبێتـەوە وناشـتوانرێت وەکـو مەسەلە وڕاستیەکی واقیعی دەستی تێوەربدرێت.

خۆ ئەگەر مێژوو لەو وێنە ورووداوە ناواقیعیانە داماڵرێت ئەوا وێنەی مێژوو دەبێتە وێنەیەکی فەلسەفی وزەوقی ونەدەبی، ئەگەر ساغکردنەوەیەکی لەم شێوەمان بۆ کرا، ئەوا واتە توانیومانە ڕەوتی زانستی بۆ کۆمەڵگەی ئێرانی لەڕێگەی خوێندنەوەی کۆمەڵگەی ئێرانیەوە لە سوورە جیاوازەکان و بەراوردکردنی ئەو سووڕانە لەگەڵ سووڕەکانی تری زۆرێك لە کۆمەڵگاکان، دیاریبکەین، و بەم خوێندنەوەیەش زانستی مێژوو دێتە دی و ساغ دەبێتەوە و بوونی دەبێت.

شەشەم: زانینێك هەیە بەناوی مێژوو:

ئاشنابوون بە شتێك بەناوی مێژووی گشتی، بەشێوەیەك زیادەیەك نەبێت بۆ سەر شتێکی تر وەکو مێژووی ئێران یان مێژووی ڕۆم واتە توێژینەوەی واقیعێك یان مەسەلەیەکی مێژوویی ناپەیوەست بە سەردەمێکی دیاریکراو یان دەوڵەتێکی دیاریکراوەوە، وئەگەر لێکۆڵینەوەمان بەم شێوەیەبوو دەتوانین بلێین کە مێژوومان ناسیووە. پرسیاری خراوەڕووش ئەوەیە کەی دەگەینە ئامانجی سەرەکی لە مێژوودا؟ وچۆن دەتوانین بگەین بە حەقیقەتێکی هەمەکیانە بەناوی مێژوو؟ کاتێك ئەم ڕێگەیە لە لێکۆڵینەوەی هەموو شارستانیەت و کۆمەڵگاکاندا بەکاربێنین ئەوا چەماوەگەلێکی گرنگ و پێویستمان بۆ ٢٧ ئەزموون کە ٢٧ شارستانیەتی(٨) جیهانی دەنوێنێ، کێشاوە. لەوەوە دەتوانین مێژوو بناسین، واتە ئێمە بە لێکۆڵینەوەمان لەو شارستانیانە و بەراوردکردنیان بەیەکتر گەیشتووین بە حەقیقەتێکی گەورە، ناوی مێژووە، ئەم کارەش لە کاری دەزگایەك دەچێ بۆ توێژینەوە وناسینی مرۆڤ، کە ئەم دەزگایە زانیاری جیاواز لە بوارە پسپۆڕیەکان وزۆرێك لە

لەزانستیەکان کۆدەکاتەوە، وەکو زانینی خوێن و دەمار، یان توێژینەوەی خانەکان و دڵ ومێشك، و هەناسەدان و هەستەوەرەکان، و دەروناسی و عارەق کردن وبۆماوەیی، ئەم لێکۆڵینەوانە دەربارەی ئەم بوارانە لەگەڵ یەکتردا کۆدەبنەوەو بەیەك دەگەن لە خاڵە هاوبەشەکانیاندا وپاشان پوختەی ئەنجامە خوازراوەکان کە ئەمانگەیەنێت بە زانینی حەقیقەتی مرۆڤ، دەدەنە دەست، مێژووش هەر بەم جۆرەدەبێت وزانینیشی لە کۆکردنەوە ولێکۆڵینەوەی ئەو بوارانەوەیە کە پێشتر خرانەڕوو.

– بۆچی ئەفسانەکان ڕۆحی شارستانیەکان دەنوێنن؟

مێژوو بریتی یە لە زانستی پرۆسەی هەبوون (صیرورة) ی مرۆڤ. ئەم زانستەش لێکۆڵینەوەی مرۆڤێك کە لەڕابردوودا بووە ناینوێنێ، بەڵکو توێژینەوەی مرۆڤ کە لەحاڵەتێکی هەبوون و دروست بووندایە دەینوێنێ. ئێمە کاتێك دەڵێین درەختی قۆخ یان بۆنموونە دەڵێین شیرینی هەنگوین و یان هەر شتێکی تری لەم بابەتانە، ئەوا پێناسەکردنی ئەم شتانە پێناسەکردنێکی جێگیر دەبێت لە ڕابردوو لە ئێستاشدا. بەڵام مرۆڤ بەم جۆرە نیە چونکە هەر خاسیەتێك لە کۆمەڵگەدا خاوەنیەتی لە حاڵەتی گۆڕاندایە. لەبەر ئەمە پێناسەی مرۆڤ پێناسەیەکی گۆڕاوو جیاوازبوو دەبێت بەدرێژایی زەمان چونکە مرۆڤ لەحاڵەتی دروست بوون وگۆڕاندایە. لەبەر ئەوە تەنیا لە ئاخر زەماندا دەتوانین پێناسەیەك دەربارەی مرۆڤ بخەینەڕوو کە مرۆڤ لەو کاتەدا گەیشتۆتە کۆتایی ومێژووناسیش بەرلەوەی شارەزابێت لە مێژوودا پێویستە هەروەها بەمرۆڤ زانا بێت.

دوای ئـەو گرنگیـە زۆرەی کـە ئەفـسانەکان دایـان بەدەسـتەوە، ئـەم ئەفسانانە بوون بە مێژوویەك کـە پێویـست بـوو لـە بوونـدا دەرکـەوێت بـەڵام نەبوو، یان کۆمەڵێکە لە ڕووداوەکان کە دەبوو ڕووبدەن بـەڵام ڕوویـان نـەدا، هەرچی پاڵەوانانی ئەو ئەفسانانەیە کەسانێکن کـە دەکرێـت بوونیـان هـەبێت بەڵام مێژوو ڕێگەی بە دەرکەوتنیان نەداوە.

ئەفسانەکانی جیهان بریتین لە دەرکەوتەکانی هزرو ڕاسـتی و بـەها ڕەهـا مرۆییەکان بۆ یەك سووڕ یان بۆ یەك نەتەوە وگەلی دیاریکراو. بـەزۆریش ئـەم ئەفسانانە بۆجۆرێکی تایبەت لە مرۆڤ نین.

لێکچوون وبنچینەی هاوبەش لـەنێوان ئەفـسانە یۆنانیـەکان و ئەفـسانەی هندییە سوورەکان وسامیەکان و عەرەب و ئێرانیەکان و یەهوود وهند و چین ونەتەوەکانی تری جگە لەماندا، هەیـە. ڕەنگـە بـۆ ئـەم لێکـچوونە کاریگـەری هەبووبێت لە لێکچوونی خـەڵکی وجیاوازییەکانیانـدا لـە هـەموو ڕووەکانـەوە، هەمیشەش لە زانستی ئەفسانەکاندا ڕووی جیاواز لەڕووی لێکچوو گرنگترە.

زانینی ئەفسانەکان و ناسینی پاڵەوانەکانی کۆمـەکی زۆرمـان دەکـات بـۆ ناسـینی مرۆڤـی ئـەمڕۆ، چـونکە ئەفـسانەکان ڕووداوە دەرەکیـەکانمان بـۆ ئاشکرا دەکەن کە لەڕابردوودا ڕوویانداوە، مـرۆڤ وهـەروەها خـودی خـەڵکیش هەمیشە لە ئەفسانەکاندا زیـاتر بـە ڕوونـی دەردەکـەوێت، چـونکە وێنەیـەکی زینـدوو واقیعـی دوور لـە ڕەگەزپەرسـتی وسـووڕە مێژوویـەکانیان دەربـارەی خۆیـان پێدەبەخـشن. ئـەم وێنەیـەش کـە پێیـان دەدەن لەمیانـەی ئـەو ئەفسانانەوە کە باوەڕیان پێیەتی یان ئەینووسنەوە دەردەکـەوێت، و کاتێـك مرۆڤ دووردەبێت لە کۆتەکانی سروشت وڕووداوە دەرەکیەکان، یان زۆرلێکراو

وناچار نابێت بۆ مەسەلەیەك، ئەوا ئەتوانێ کە دەربارەی خۆی وڕای خۆی بەشێوەیەکی گەورەتر وڕوونتر، گوزارشت بکات، لەبەر ئەمە ئێمە کاتێك ئەڵێین ئەفسانەکان بەم شێوەیە ئەخوێنینەوە ئەوا هەست دەکەین کە زیاتر زیندوویێتی وسوودی بۆ مرۆڤی ئێستایی هەیە لەوەی کە لە زۆرێك چەمکەکان لەخۆ دەگرێت.

کاتێك ئەفسانەکان ئەخوێنینەوە ئەبینین کە بوونێك بۆ بەها مرۆییەکان وڕاستیە مرۆییەکان هەیە و هەروەها بۆ مێژووش. لێکۆڵینەوە وزانینی ئەم ئەفسانانەش بۆتە گرنگیەکی سەرەکی، ئەمەش لەپێناو زانینی شارستانی وئاین یان کلتووری هەر نەتەوە یان کۆمەڵێك، بەدەربڕینێکی تر، ئەگەر ئێمە ناسینی شارستانیەکان وئاینەکانمان ویست پێویستە بەو جۆرە بیانخوێنینەوە کە نمایندەی مرۆڤن ، چونکە مێژووی ئەم شارستانیەت وئاینانە وێنەی مرۆڤیش دەنوێنێ، بەڵام ئەفسانەکانی ئەم شارستانی وئاینانە گوزارشتە لە بیروبۆچوونەکانی مرۆڤ وباوەڕ و پێشبینی و بڕواو هەست وسۆزەکانی، ئێمە کاتێك ئەفسانەکان، واتە ئاینزا یان ئاینێك، ئەخوێنینەوە، بەو واتایەیە کە ئێمە هەست و بۆچوونەکانی ئەو ئاینزایەمان خوێندۆتەوە. هەندێك لە ئاینەکان ڕەنگە ئاینی ئەفسانەیی بن، کاتێك کە ڕووخساری خۆی لە قۆناغە کۆنەکان کە پێش مێژوو کەوتوون وەرگرتووە، و پاشان چۆتە ناو مێژووەوە بەو ڕووخسارەوە وبەو وێنەیەوە.

هەروەها چەندین ئاینی مێژوویی هەیە، ڕووخسارو وێنەی کۆتایی خۆی وەرگرتووە لە قۆناغی مێژووییدا، وەکو ئاینی ئیسلام ویەهوودی ومەسیحی، بەو مانایەی کە موسا وعیسا وپێغەمبەری سەروەر(د.خ) کاتێ دەرکەوتوون

مێژوو بوونی هەبووە. زانینی ئەفسانەکانی ئاینزا مێژووییەکان کۆمەکمان دەکەن بۆ ناسینی خودی ئەو ئاینزایانە وتەنانەت ئاینی ئیسلامیش کە لە گەورەترین ئاینەکان دادەنرێت و لەڕووی ڕوونیشەوە بەڕوونترین ئاین، لەم مەسەلەیە بەدەر نییە، چونکە لێکۆڵینەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری سەروەر (د.خ) و یارانی وئەو ڕووداوانەی کە لەدوای کۆچی دوایی ئەو ڕوویاندا و هەورەها مێژووی ئیسلامی، مەعریفەیەکی تەوامان دەربارەی ئیسلام و واتا ڕاستەقینەکەی ناخاتە بەردەست، بەڵام لێکۆڵینەوەی زانینی چیرۆکە ئیسلامیەکانی وەکو چیرۆکی ئادەم وحەواو چیرۆکی دەرکردنی ئادەم لە بەهەشت وچیرۆکەکانی تر دەبێتە یارمەتیدەرێکی گرنگ بۆمان لە تێگەیشتنی ڕۆحی ئیسلام. بەڵام بۆچی؟ وەڵام ئەوەیە چونکە مێژوو نمایشکار وئاشکراکەری بارودۆخی میللەت یان نەتەوەیەکی دیاریکراوە. زانستی ئەفسانەکان بریتی یە لە زانستێکی تایبەت وجیایە لە زانستی مێژوو وفەلسەفە وزانستی شارستانی، وبریتی یە لە زانست و هونەرێکی سەربەخۆ لەخۆیدا، لەبەرئەوە ئەو کەسەی لەم زانستەدا ئەیەوێت پرۆفیشناڵ بێت پێویستی بە بەرهەم یان دەستکەوت وپاشخانێکی زەینی فراوانە هەتا بتوانێ ئەو ئەفسانانە ڕوون بکاتەوە وبگاتە حەقیقەتەکەی. بەشێوەیەکی گشتی ئەو مرۆڤەی کە لەم بوارەدا سەرقاڵە پێویستی بە عەقڵیەتێکی ئەفسانەیی هەیە و کاتێکیش ئەفسانەکان دەخوێنێتەوە، ئەوا ئەو دەبێتە شارەزا تێیداو بەڵام زانانییە بەو زانستە، چونکە زانایەك کە پسپۆڕ دەبێت لە ئەفسانەکاندا پێویستی بە سەلیقەیەکی تایبەتە وئەم سەلیقەیەش میراتێکی بۆماوەیی نییە یان سروش (ئیلهام) ێك نییە کە ئافرێنەر ڕەوانەی بکات بۆ ئەو بەندەیەی

هەڵیدەبـژێرێ. ئـەم زانـستەش بەدەسـت دەهێنرێـت لەڕێگـەی مومارەسـە وپێگەیشتن وخوێندنەوەوە لەلایەن مرۆڤەوە (ئەمەش لەشارەزایەك دەچێ لە شـعرەكاندا، كـە ئـەم زانـستە لای ئـەو بەدەسـت دەخرێـت لـە ئـەنجامی مومارەسەكردن و خوێندنەوەی شعرەكانەوە).

زانینـی ئەفـسانەكان كلیلێكـە بـۆ ناسـینی هـەموو شارسـتانی وئـاین وكلتوورەكـان چـونكە ئەفـسانە گوزارشـتە لـە مێژوویـەك كـە پێویـست بـوو ڕوویدابا بەڵام ڕووینەدا. (ئەمەش واتە مرۆڤ دەیویست مێژوو بەو شێوەیە بێت بەڵام بەو جۆرە نەبوو كە مرۆڤ دەیەوێت).

مرۆڤ قوربانی مێژووە ودیلیەتی وهەمیشە یـاخی دەبـێ وشـۆڕش دەكـات بەسەر مێژوودا چونكە كەسە تایبەتمەند و جیامەندەكان هەمیشە لەسـەرووی مێژووەوەن. ڕەوتی مێژوو لە ڕەوتی قافڵەیەك دەچێ كاتێك كـە ڕێبوارەكـان بەدەستی كۆمەڵێكی تایبەتەوە (واتە كاروانچیەكان) كـە قافڵەكـە لێـدەخوڕن وئاراستەی دەكەن، دیلن.

ماكس ڤیبەر دەڵێ: خەڵكان ئەوانەن كە دروست كراوی مێژوون و لەوانـە دەچن كە لەناو گالیـسكە (تروشـكە)دا دانیـشتوون كاتێك كـە ئـەم خەڵكانـە دۆخی خۆیان داوتە دەست خەڵكانی تـر، بـەڵام ئەوانـەی كـە مێـژوو دروسـت دەكەن ئەوانەن كە سەریان لە گالیـسكەكانەوە دەرهێنـاوە و بـەدەنگی بـەرز هاوار دەكەن بۆ گۆڕانی ڕێڕەوی قافڵەكـە، خـۆ ئەگـەر نـەیانتوانی ڕێڕەوەكـە بگۆڕن بەدڵنیاییەوە لە گۆڕانی ئاراستەكەیدا كاریگەرییان دەبێت.

دەسـتە (فرقـة)ی مەلامەتیـە دەسـتەیەكی ناسـراون لـە مێـژووی ئیسلامیدا(٩)، یاخیی بوون دژی هەموو ئەو بەهایانەی لە كۆمەڵگەدا هـەبوون

وڕەخنەیان لێگرت. یارانی ئەم دەستەیە شارستانیەتی ڕەسەنی یۆنانی دەنوێنن، و لە کارە ناسراوەکانیشیان خۆدەرخستنیان بوو بە گەندەڵی کۆمەڵایەتی لەکاتێکدا ئەوان لە حەقیقەتدا گەندەڵ و لەڕێ دەرچوو وگومڕا نەبوون. مەلامەتیەکان هەموو ئەو بەهایانەیان ڕەت دەکردەوە، کە ئەو کاتە حوکمی کۆمەڵگەی دەکرد. مەلامەتی ئەو کەسەیە کە قبوڵی سەرزەنشتکرن وسەرکۆنەکردنی خەڵکی دەکات بۆی، بەڵام نایەوێت بەهای باوی کۆمەڵگە بەهایەك بێت کە ویست و دەسەڵاتی سەریدا هەبێت یان لەسەر خەڵکانی تری جگە لەخۆی وبەم ڕێگەیەش ئەو ئەتوانێ توانا مەعنەوییەکەی خۆی تاقی بکاتەوە ولە مەحەکدا دایبنێت. نیچە دەڵێ: خودا مرد، ئەمەش بە گورزێك دادەنرێ لە هەموو بەها ناسراوەکان لە کۆمەڵگەدا، بەڵام لە هەمان حاڵدا نکوڵی لە بوونی ئافرێنەر ناکات، چونکە ئەگەر بیویستایە بوونی ئافرێنەر ڕەت بکاتەوە ئەیووت کە خودا بوونی نییە، بەڵام کاتێك دەڵێ خودا مرد ئەمە واتە ددان پێدانان بە بوونی ئافرێنەردا. بەڵام ئەم ووتەیەی ئامانجی ئەوەیە بڵێت هەموو بەهاکانی کۆمەڵگە کە هەبوون یان ئەدرانە پاڵ ئافرێنەر یان گەورەی مەسیح کۆتایی پێهاتووە وبوونی نیە، چونکە لەکاتێك لە کاتەکاندا لای مەسیحیەت باوەڕێکی پتەو ودامەزراو هەبوو کە مرۆڤ ڕاسپێردراوە لە ناخی خۆیدا مرۆڤێك بنیاد بنێت ووتەی گەورەی مەسیح بەسەریدا بچەسپێ وئاکاری ئەوی تێدا ڕەنگ بداتەوە وکۆمەڵگەش ببێتە کۆمەڵگەیەکی مەسیحی.

ئامانجی نیچە ئەوەبوو کە خودا بوونی هەبوو تا سەدەی نۆزدەی زاینی، دەیەوێت بڵێت خودا مردووە تا بەها وئاکارێکی نوێ بینا بکات، جیاواز

لەوەی لە کۆمەڵگەدا هەیە ودەیدەنە پاڵ خودا یان گەورەی مەسیح. کەواتە ئامانجی کلتووری یۆنانی(١٠) چ لە رۆژئاوابێت یان لە رۆژهەلات، هەروەها لە هەموو کۆمەڵگا ئاینی یان نائاینیەکاندا، یان لە بۆرژوازی یان لە چینی دەرەبەگدا بریتی یە لە رەت کردنەوەی ئەو بەها ئاینیانەی باون لەو کۆمەڵگایانەدا، لەبەر ئەوە ئەو مەسیح دەکەژێ هەتا پێگەی مرۆڤ والێبکات کە ئەو دەیەوێت، واتە مرۆڤی نوێ(١١)، لەبەر ئەمە ئەبینین کە شارستانیەتی یۆنانی لەسەر رەت کردنەوەی بەهاکان جا چ لەرۆژهەلات بێت یان لەرۆژئاوا یان لە کۆمەڵگە ئاینی و نائاینیەکاندا بێت، دادەمەزرێت، کەواتە ئامانجیش لێی رەت کردنەوەی بەهاکان و هەڵگرتن ولابردنیانە لە کۆمەڵگەکاندا.

کاتێك بوونی کلتووری یۆنانی لە کۆمەڵگەیەك لە کۆمەڵگە دەرەبەگیە ئاینییە رۆژهەلاتیەکان رادەگەیەنن، ئەوا ئەم کەلتوورە لەو کەلتوورە یۆنانیەی لە کۆمەڵگەی بۆرژوازی رۆژئاواییدا هەیە جیاوازە، چونکە مرۆڤ دەبێتە دیل کاتێك بەهای ئەو کۆمەڵگەیەی کە تێیدا دەژی، رەت دەکاتەوە.

بۆنموونە (خەیام)(١٢) لە گومانکارەکان یان راراکانە کاتێك کە دەقەکانی دەربارەی ئیسلام روون و ئاشکران، سەرەرای ئەم رەت کردنەوە ودوودڵ بوونە، دەرکەوتەی مانای ئیسلام لە گووتارەکانیدا هەیە، هەندێ کات دەبینین خەیاڵ هەر یەکە وهاوشێوەیە، بەلام خەیاڵی رۆژهەلاتی بەتەوای جیاواز دەبێت لە خەیاڵی رۆژئاوایی، ئەوەش ئاشکرایە کە خەیاڵ جۆرێکە لە بیرکردنەوە بەلام بەسەر واقیع و حەقیقەتدا ناچەسپێ. خەیاڵەکانی تاکەکان جیاواز دەبێت بەپێی جیاوازبوونی چینەکانیان بۆنموونە خەیاڵی کچە منداڵێك (طفلة) کە لە خیزانێکی هەژاردا دەژی جیاوازە لە خەیاڵی کچە منداڵێك کە لە

خێزانێکی خۆشگوزەراندا دەژی وەهەروەها خەیاڵی هونەرمەندێك یان شاعیرێك یان فەیلەسوفێکی ڕۆژهەلاتی خەیاڵیان جیاواز دەبێت لە ڕۆژئاواییەکی هاوتای خۆیان، و ئەم جیاوازییە بەدەست هێنراوەش ئەنجامی ئەو زەمینە کۆمەلایەتیەیە کە لایان بوونی هەیە.

هەرچی ئەفسانەکانە جۆرێکن لە خەیاڵکردنەکان، گوزارشتن لە ئاوێنەکان، تێیاندا هەموو کارتێکەرەکان کە بوونی هەیە وکە بوونی نیە لەیەك قۆناغی کۆمەلایەتیدا، ڕەنگ دەداتەوە. هەر لەڕێگەی ئەم ئەفسانانەشەوەیە دەتوانین کە چین ئەو بوارو پێویستی وشتانەی کە لەو قۆناغە کۆمەلایەتیەدا بوونیان هەیە یان هەروەها ئەو بوارانەی کە بوونیان نییە، بزانین؟ چونکە ئەفسانەکان ئومێد وزانیارییەکانی ئەو مرۆڤەن کە لەو کاتەدا بوونی هەبووە، جیهانی ئەفسانەکان جیهانێکی سەر سووڕهێنەرە، پێویستە لە قووڵایی هونەردا بن، بەو مانایەی ئەوە بوونێکی هونەرییە و ئەم بوونە هونەریەش بریتی یە لە کۆمەلانی بەشەری وئەم کۆمەڵبوونەش، ئارەزووکردنی پەیوەست دەبێت بە شتێکی ترەوە و بەلام نەمێژوو نەزانست ونە کۆمەڵگە ناتوانن بوونی ئەو شتە بهێننە دی و لەپێناو بەدەستهێنانی ئەو شتەدا کە ئەمەش نابێت تەنیا لەڕێگای دروست کردن وگێڕانەوەی ئەفسانەکانەوە نەبێت.

لەمیانەی دەرککردن و خەملاندن وخوێندنەوەی پێداویستیەکانی ئەو کۆمەڵگە و ئەو قۆناغەوە، دەتوانین ئەو شتانەی کە لایان بوونی هەیە و ئامادەیە ودابین کراوە، بزانین.

ئومێدەکان لە هەموو ئەفسانەکاندا هاوشێوەن، چونکە هەموو خەڵکی هاوشێوەن یان لەبەرئەوەی کە کۆمەڵگاکان هەموویان لێکچوون، بەڵام لێکچوون چیە لەنێوان ئەو مرۆڤەی کە فڕوفێڵ و تەڵەکە ڕێکدەخا ولەنێوان ئەو مرۆڤەی کە دەبێتە قوربانی ئەوە؟ مرۆڤەکان هاوشێوەنین لە ڕواڵەتەکاندا، واتە لە چاوو گوێ، بەڵام ئەگەر ئەو لێکچوونانەمان لابرد کە لەنێوان خەڵکیدا هەیە لەڕووی مرۆییەوە، ئەوا ئەکرێت جیاوازییەکی گەورە لەنێوان مرۆڤێك و یەکێکی تردا هەبێت، ئەم جیاوازییەش دەکرێت گەورەتر بێت لەو جیاوازییەی لەنێوان مرۆڤێك و ئاژەڵێکدا هەیە.

مرۆڤایەتی ئەمڕۆ قوربانیی باوەڕی بنچینەیی بوونی تاکەکەسە (فرد) کە لەجیهاندا ڕاگەیەنراوە و ڕێزگرتنی مرۆڤ و مرۆڤایەتیش درۆیەکە مرۆڤ و مرۆڤایەتی پێ گومڕا دەکەن لەبەرئەوە پێویستە ململانێ لەگەڵ ئەم بیروبۆچوونانەدا بکەین ورووبەڕووی ببینەوە بۆ لابردنیان.

ئەفسانەکان گوزارشتن لە جیهانێك کە مرۆڤ لەبەرامبەر جیهانێکدا کە خودا بنیادی ناوە، بینای کردووە، ئەوە گوزارشتە لەمێژوویەك واقیعێکی لەبەرامبەر ئەو مێژووەدا نییە کە خودا دروستی کردووە، بەڵام ئەفسانەکان بریتین لە ئامانجی خوازراو لەلای مرۆڤ- واقیعێکی نییە بەڵام حەقیقەتێکی هەیە جیاواز لەو مێژووەی کە واقیعێکی هەیە بەڵام حەقیقەتی نییە.

ئەفسانەکان لەبەرامبەر وهاوتەریبی مێژوو یان هاوشانی مێژوو دەمێننەوە، ئەو چیرۆکانەشی کە ئێستا ئەگێڕدرێنەوە ودووبارە دەکرێنەوە بەشێکە لە ئەفسانەگەلی میللەتانی دیاریکراو وئەفسانەکان وادادەنرێن لەگەڵ هونەردا هاومانان، هونەر بەشێکە لە ئەفسانەکان وئەفسانەکانیش بەشێکن لە هونەر.

ئـەو نیازمەندییـەی کـە لای پیکاسـۆ هـەبووە ومرۆڤـی بـە دوو ڕوخـسار (وجهین) پێ وێناکردووە، هەمان نیازمەندییە کەلای ئەو هونەرمەندە هـەبووە کە پێش پێنج هەزار ساڵ ژیاوە وکاتێك ئەویش مرۆڤی بە دوو ڕوخسار (یـان لەدوو ڕووکارەوە) وێناکردووە (جانوس). لەبەر ئەمـە لێـرەدا زۆر بـوار هەیـە پێویستە بیخوێنینەوە ولەبەرچاوی بگرین لەئەفسانەکاندا وئەوانیش:

١- دۆخی هەبوونی مرۆیی کە لەو ئەفسانانەدا هاتووە، ئێمە کاتێك لەمیانەی مێژووەوە دەکەوینە بەردەم دۆخی مرۆیی لە هەردوو سەدەی ڕابردوودا و دەیخەینەڕوو، دەشتوانین دۆخی ئەو مرۆڤەی کە بەر لە پێنج هەزار ساڵ ژیاوە بزانین ئەمەش لەڕێگای ئەفسانەکانەوە.

٢- زانینـی کـەم وکـورتی و پێویـستیەکانی مـرۆڤ، ئەمـەش واتـە دەتـوانین لەمیانـەی ئەفـسانەکانەوە ئـەو بوارانـە بخوێنینـەوە کـە بـوونی نـەبووە وهەمیشە خەڵکی لە باری خواستنی وداواکردنی وبەدەستهێنانیدا بـووە. ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە خەیاڵکردنی مرۆڤ پابەندی ئەو دۆخەیـەتی کـە هەیە و پابەندی ئەو پێویستیانەیەتی کە نیەتی، زیاتر لەوانەی کە هەیە. لەبەرئەمە کاتێك لەمیانەی ئەفسانەکانەوە لەقۆناغێك دەکۆڵینەوە، واتای ئەوەیە ئێمە بەدوای شتێکدا ئەگەڕێین کە نایزانین؟

یـەکێك لـە ڕووە هاوبەشـەکانی نێـوان هـەموو شارسـتانیەتیەکان ئـەو ئەفسانانەیە کە پەیوەستە بـە ئافرانـدنی مرۆڤـەوە، تەنانـەت لـە شـعرەکانی هیندییە سوورەکانیشدا(١٣) ئاماژەی واهەیە پەیوەسـتە بـە ئافرانـدنی مـرۆڤ ودروست بوونیەوە، و لەهەموو ئـەم فەلـسەفە پەیوەسـتانەدا بـە بـەدیهێنانی مرۆڤـەوە چ لـە شارسـتانیەتی ڕۆژهەڵاتـدا بێـت یـان یۆنانیـدا و تەنانـەت لای هیندییە سوورەکانیش دوو ڕووی هاوبەشیان تێدایە ئەوانیش:

١- هەموو ئەم چیرۆکانە پەیوەستن بە ئافراندنی مرۆڤەوە.

٢- لێکچوون لەهەموو چیرۆکەکاندا هەیە، کە بوونی قۆناغێکی زێڕینە لەهەموو ئەم چیرۆکانەدا، پاشان دوای ئەم قۆناغە تاوانێك یان ڕووداوێك ڕوودەدات مرۆڤایەتی یان کۆمەڵگە تووشی داماوبوون ورسوابوون وسەرشۆرشی دەبێت و خەڵکیش ئاواتەخوازی هاتنەوەو ڕوودانەوەی ئەو قۆناغە زێڕینەن.

لە چیرۆك و ئەفسانە ئیسلامیەکان چیرۆکی نوحـ(ع)ـە کە خەڵکی بۆ دوویەش دابەشدەکات، بەشێك بەخۆشی و شادمانی چێژیان وەرگرت وئەمانە بەرلە نوح ژیاون، بەلام بەشی دووەمیان ئەمانە کڵۆڵ وبەدبەختەکانن وبەرهەمی نەفرت وبەلان و دوای سەردەمی نوح (ع) ژیاون. لەو لەوحەو کتێبانەدا کە دەست کەوتوون هاتووە کە قۆناغی زێڕین ئەو قۆناغە بووە کە پێش سەردەمی نوح بووە، ئەم واتایە لە ئەفسانە و چیرۆکە یۆنانیەکانیشدا دووبارەدەبێتەوە ، کە تیایاندا هاتووە مرۆڤ بەختێکی باشی هەبوو دوای ئەوەی کە خواوەند هەموویانی بەدیهێنا کاتێك بوو لەگەڵ خواوەندەکاندا دەژیا پاشان خواوەند زیۆس هات کە بەسەر هەموو خواوەندەکاندا باڵادەستی سەپاند، ئەمەش ئەو کاتەیە کە کۆمەڵگا لە ستەم و تاریکی و گەندەڵیدا ژیا.

بەڵام ئەفسانە و چیرۆکەکانی هیندییە سوورەکان کە لەشعرەکانیاندا هاتووە، ئەویش ئەم واتایە دەگێڕێتەوە وتێیدا هاتووە، کە مرۆڤ لەژێر بارانێکی بەهاریدا لەدایك بوو، خۆشبەخت بوو، جگە لە خۆشەویستی هیچی تری نەدەزانی، بەڵام خودا خراپەکارەکان فوویان لەدنیاکرد وباڵادەست بوون

بەسەریدا پاشان خوای مردن ونەخۆشـی ورق وتـورەیی، کـە دەسـتیان گـرت بەسەر ئەم جیهانـەدا، ڕۆحیـەتی مرۆڤایـەتیان تێکشاکاند وکەسـیش کەسـی نەپاراست جگە لە خزم وکەس وکارەکانی خۆی، لەبەرئەمە تـاریکی و سـتەم وتاوان بەسەر مرۆڤایەتیدا باڵیکێشا، بـەڵام ئـەو کەسـانەی کـە دەتـوانن لـەم ستەمکارییە هەڵێن جگە لە سزا هیچی تر نابیننەوە کاتێك کۆتاییـان هـەر بـۆ ئاسمان دەبێـت. بـەڵام ئـاین و ئـاینزا ئەرکەکـەی بـووە ڕێنمـایی خـەڵکی بـۆ نزیکبوونەوە لە ئاسمان وهەڵبژاردنی گۆشەگیری ودوورکەوتنەوە لە کۆمەڵگـە ئەمەش بە جۆرێك لە تەسەوف دادەنرێت.

لـە (چـین) قۆنـاغی زێـڕین ئـەو قۆناغەیـە کـە بـە (شـانکتی) ناسـراوە، وهەروەرها لە ئێرانیش قۆناغی زێڕین هەیە ولە چیرۆکی (جەمشید و کیانیان)دا پێناسەکەی هاتووە، کاتێك کە ئەم سووڕە بۆیان بە سووڕی زێڕین دادەنرێت ودوای ئەم سووڕەش دۆخەکە دەگۆڕێت بۆ بارێکی خراپ کاتێك کە دەسەڵات لەم قۆناغەدا بۆ (مادیەکان) یان بۆ میللەتانی (عاد)ە.

هەرچـی چـیرۆك و ئەفـسانە بابلیەکانیـشە دیـسان دەربـارەی بـوونی سووڕێکی زێڕین دەدوێن.

لەمەوە دەتوانین ئەو ئەنجامگیرییە بکەین کە سووڕێکی زێڕین بەدرێژایی مێژوو بوونی هەبووە ومیللەتـە دیاریکراوەکـان یـان کۆمەڵگەیـەکی دیـاریکراو بەم سـووڕەوە خۆشـی دەبینـێ وچـێژ وەردەگـرێ بـۆ ماوەیـەك لـە زەمـەن، پاشـان ئـەم سـووڕە تێدەپـەڕێ و لەناودەچـێ وکۆمەڵگـەش بـەرەو سـتەم وگەندەڵی و ڕقی هۆزێك یان کۆمەڵگەیەك یان نەتەوەیەك یان ئیمپراتۆریەتێك پێشڕەوی دەکرێت و لێژدەبێتەوە، لەبەرئەمە هەموو نەتەوەیەك پێویستە بە

سووڕی زێڕیندا تێپەڕێت پاشان ئەم سووڕە تێئەپەڕێنێت بۆئەوەی ستەم وجەورو گەندەڵی بیگرێتەوە.

ئەم چیرۆك و ئەفسانانە دەربارەی حاڵەتێکی واقیعی دەدوێن، ئەم دۆخەش پەیوەستە بە یەك مەسەلەوە ئەویش خۆرسکی مرۆییە.

پرسیاری خراوەڕووش لێرەدا ئەوەیە کارکردی هاوبەش لەنێوان ئەم چیرۆك و ئەفسانانەدا چی یە؟ وەڵام ئەوەیە کارکردو هۆکارێکی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە ئەویش سووڕی زێڕینە، لەکاتێکدا کە هەموو چیرۆك و ئەفسانەکان دەربارەی بوونی ئەم سووڕە ئەدوێن، ئەوا هەندێك کات سووڕێك لە سووڕەکان هەیە خەڵکی تێیدا هاوبەشن و پێی دەڵێن سووڕی گشتیانە (الدورة العمومية)، دوای ئەو سووڕەکانی تر دێن وخاوەندارێتی و خاوەندارێتی تایبەتی تیایاندا دەبێت. خاوەندارییەتی لێرەدا بەناونیشانی ژێرخانی یەکەمیەوەیە و لە دووەمیشیاندا خاوەندارێتی تایبەتی دەبێت. بەڵام گەورەترین دابەشکاری هاوبەش لەنێوان ئەم سووڕانەدا وەکو ووتمان بوونی سووڕی زێڕینە پاشان سووڕی نەگبەتی و کوێرەوەری وکلۆڵی کاتێك کە مرۆڤایەتی بەگەورەیی و لووتکەی شارستانیەتیەوە بە بیروباوەڕییەوە پارێزگاری لەم مەسەلەیە کردووە.

مەبەست لە ژێرخان بریتی یە لە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ ئامرازەکانی بەرهەم هێنان نەك لەگەڵ ڕوخساری بەرهەم هێناندا، خۆ ئەگەر ڕووی هابەشی ژێرخانی هۆزەکانی هیندییە سوورەکان و ئیمپراتۆریای ڕۆمانی وەربگرین دەبینین کە (خاوەندارێتی) ژێرخان پێکدێنێ و بونیادیش لەم دوو کۆمەڵگەیەدا لە کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی و بارەکانی تری جگە لەماندا

خـۆی دەنـوێنێ، بـەڵام ئەگـەر ژێرخانمـان وادانـا کـە بریتـی یـە لـە نەخشەسازییەکان ئەوا ڕوویـەکی هاوبـەش لەنێوانیانـدا بـوونی نییـە. چونکە نەخـشەسازییەکان و دابەشـکارییەکان ناکرێـت ژێرخـانی ئـەو چـیرۆك و ئەفسانانە بن، لەبەر جیاوزبوونیان و نەبوونی لێکچوون لەنێوانیاندا، ئەوا خود بەخود ئەفسانەکانیش جیاواز دەبن. وئێمەش دەڵێین کە ئەفسانەکان ناکرێت لـە ژێرخانەکانیانـدا جیـاوازبن، واتـە ئـەو بیرۆکـە و هـزرە سـەرەکیەی کەلەسەریەوە بنیات نراون.

بنچینەی دووەم کـە دەکرێت لـە ئەفـسانەکاندا بیـزانین ئـاڵوگۆرپێکردن (إسـتبدال)ی ئـەو کەسـایەتیانەیە کـە کـە لـەناو ئەفـسانەکاندا هـەن، بـە کەسایەتیە ئاینیەکان، دواتر ئەم کەسایەتیانە پێگەیەکی تایبەت داگیردەکەن ئەم (ڕۆڵ)ـە یان (پێگە)یە کـە ئـەو کەسـایەتیانە وەریدەگرن گوزارشـتە لـە زانین یان دەست نیشانکردنی جیاوازییە چینایەتی وڕەگەزی و تایبەتیـەکانی ژیانی مرۆڤ.

ئەوانـەی خـاوەن یـان ئـەربابی جۆرەکـان و بتـەکانن کەسـایەتیە ئەفـسانەییەکانن، لەبەرئەمـە هـیچ پیرۆزکردنێـك بـۆ ئـەم بتـە لـە هـیچ قوتابخانەیـەکی پەرستـشدا کـە بتـەکان بپەرسـتێ، نیـە، واتـە پیرۆزکـردن وڕێزلێنان بۆ خودی بتەکە نیە، بـەڵکو بـت پاراسـتنی ئـەو کەسـایەتیەی کـە دەویـسترێ بپەرسـترێ، دەنـوێنێ. (یەسـەوەع و نائیلـە) دوو بـت بـوون کـە وەختی خۆی پێشتر لە کەعبەدا هەبوون لە چیرۆك و ئەفسانە عەرەبیەکانـدا وێنەی عاشق ومەعشوقیان دەنواند، کە ئەم دوو کەسە هەریەکێکیان پەنایان بردۆتـە بـەر کەعبـە ودواتـر بوونەتـە بـەرد، دوای ئەمـەش بوونەتـە دوو بتـی

پەرستراو، خۆ عەرەب ئەم دوو بتە ناپەرستن، بەڵکو دوو دیاردە یان دوو شت ئەپەرستن کە بۆیان واتایەك ومێژوویەکیان هەیە..

هەورەها هۆزی سەقیف لە پەرستشیدا بۆ (لات)ی بت، ئەمانە ئەو ڕۆحە کۆمەڵایەتیەی هۆزەکەیان دەپەرست کە لەم بتەدا دەنوێنرا، کە لای ئەوان ڕەسەنایەتی بنەچەی هۆزی سەقیفی لەبەرامبەر هۆزەکانی تردا، دەنواند.

هەروەها لە هۆزی نەوەکانی ئیسرائیل (بەنی ئیسرائیل) بەرلەوەی ببنە گەلێك و میللەتێك (یەهوە)ی خواوەندی خۆیان دەپەرست، کاتێکیش بوونە گەلێك (یەهوە) خاسیەتێکی جیهانیانەی وەرگرت، و ئەمەش بریتی یە لەڕێگای پەرستنی تەوتەم کە تێیدا باپیرەی گەورە دەگۆڕێت بۆ خوایەك ئەپەرسترێ، دوای ئەوەی کە لەتێڕوانینیاندا ڕۆحەکەی لە ئاژەڵ و ڕووەك یان بەرددا جێ دەگرێتەوە وئەو شتەش دەگۆڕێت بۆ پەرستراوێك ناوی ئەو باپیرەیە هەڵدەگرێت.

لە ئەفسانە ئێرانیەکانیشدا مانگایەك لە کەنارێك لە کەنارەکانی ڕووباری (سیمون) هەیە کە یەکێك لەتەنیشتەکانی ئەو ڕووبارە بۆتە قامیشەڵان وگژوگیایەکی سەوز، مانگاکە دەردەچێ ولەتەنیشت کەنارەکەی تریشەوە پادشا کیومرس. کەواتە مانگاکە و کیومرس لەیەك سەرچاوەوە لەدایك بوون و ئەویش ئەو ڕووبارەیە کە مانگاکە لەلایەکیەوە دەرچوو، پادشا کیومرسیش لە لایەکەی تریەوە.

ئەم باوەڕە لای ئێرانیەکان بۆتە تەوتەم، لای ئێرانیەکان(١٤) یان ئارياییەکان ڕژێمی خواوەندیی (گەورەکان وبچوکەکان) بریتی بوو لە سیستەمی نەتەوەیی یان گەل، وتەنیا ڕێگاش بوو بۆ دۆزینەوەی پەیوەندیە

ناوەکی و خێزانیەکان، دواتر دەبێتە هۆیەك بۆ بەدیهێنانی نەتەوەخوازی گەورە کە دەبێتە ئەو سیستەمە ئاینیەی کە ئەو بیروباوەڕانە بنەماکانی بۆ داناوە. کاتێکیش خێزانێك دەبێتە میللەت یان گەلێکی گەورە، ئەوا تەوتەم یان خواوەندی ئەو خێزانە یان بتەکانیان دەگۆڕێت بۆ بتی گەورەی جیهانی، پاشان ئەم بتانە دەچنەناو ژیانی کەلتووریانەوە ودوای ئەمەش ئەو بتانە دەبنە خواوەندی ئاسمانی.

* بەرلە خوێندنەوەی ئەم باسە باشتر وایە خوێنەر سەرنجی ئەم خاڵانە بدات:

١- لەڕاستیدا ئەم بابەتە کە ئێمە لێرەدا وەکو لێکۆڵینەوەیەك لە چەند ژمارەیەکدا دەیخەینەڕوو بەشێکە لە کتێبێکی گرنگی بیرمەندی ئێرانی (عەلی شەریعەتی)، بەڵام شەریعەتی کتێبەکەی بەسەر بەشەکاندا دابەش نەکردووە، واتە بابەتەکانی بەشێوەی (بەش- فصل) جیانەکردۆتەوە و بۆسەرەتای هەر بەشێك ناوێکی تایبەت دابنێ، بەڵکو تەنها ئەوەندەی کردووە کە بۆ سەرەتای هەر بابەتێك یان کۆمەڵە بابەتێك کە پێکەوە پەیوەست بن ناونیشانێکی داناوە ولەکتێبەکەشدا بەڕەنگێکی تۆخ تر لەوانی تر دانراوە.

٢- لەبەر ئەو خاڵەی سەرەوە ئێمە ناونیشانێکی کۆگیرمان بۆ ئەم بابەتەی شەریعەتی داناوە و پاشانیش ناونیشانێکی لاوەکی، کە مەبەستەکانی دەقەکە لەخۆ دەگرن (ئەمەش لە ئەخلاقی وەرگێڕاندا ڕێپێدراوە). بۆیەشە ئەو ناونیشانەمان دانا چونکە هەم بەلای شەریعەتیەوە وهەم بەلای مێژووناسان وبیرمەندانی نوێوە وەکو (پیر بۆردیۆ وبرۆدوێل وفۆکۆ وئەوانی تر) مێژوو

بەتەواوی مانایەکی جیاوازی هەیە لەوەی کە تا ئێستا زانیومانە، کەبریتی بووە لە ڕووداوەکان وبەتایبەتیش ڕووداوەسیاسی وجەنگیەکان پەیماننامەکان وتۆمارکردنی ئەم ڕووداوانە. بۆیە ئەوەی لەمێژوودا گرنگە لێکۆڵینەوە ولێووردبوونەوە و تێگەیشتنی ئەم ڕووداوانە وبوارە بچووک، بەڵام گرنگەکانی تریشە، لەمێژوودا، هەر بەهەمان لۆژیك، ئەوەی گرنگە (مێژوونووسی) نیە، بەڵکو (مێژووناسی) یە. هەروەها ئێمە پێمان وایە کە باشتر وایە سەرلەنوێ واتاکانی ئەم دوو چەمکە دابڕێژرێنەوە.

٣- ئەو پەراوێزانەی کەنووسەر خۆی دایناوە، وەکو خۆی دەنوسینەوە، بەڵام هەندێك پەراوێز هەیە کە وەرگێڕی عەرەبی دایناوە لەکۆتایی هەر پەراوێزێك لەو پەراوێزانەدا هێمای (و. ع) واتە (وەرگێڕی عەرەبی) دادەنێین، بەڵام ئێمەش لەچەند شوێنێکدا دانانی پەراوێزمان بە پێویست زانیوە، بۆیە لەو پەراوێزانەی کە ئێمە دامانناوە هێمای (و. ك) واتە (وەرگێڕی کوردی) دادەنێین.

## پەراوێزەکان :

[1]-صیرورة: لە کرداری (صار)وە هاتووە کە مانای (بوو) دەدات، بەلام (صار)، (بوو)یەك نابێت لە نابوون یان عەدەمەوە، بەڵکو شتێك ئامادەگی هەیە وکاتێکیش لە رابردوودا گۆڕاوە بۆ شتێکی دی ئەوا ئەو شتە -بووە- بە شتێکی دی، هەرچی (صیرورة)یە واتە شتێك کە لەحاڵەتی یان پرۆسێسی (بوون بە- شت)ی شتەکەدایە، یان (بوون بە- شت)ی شتەکەدا بووە، لە روانگەی فەلسەفیەوە (صیرورة) دۆخی هەبوونی شتێکە کە لەگۆڕان و گۆڕانکاریدایە. هەر لەم دیدە فەلسەفیەوە گەر بمانەوێ (صیرورة) دیاریبکەین ئەوا ئەبێ لە (بوون- وجود) جیای بکەینەوە. بوون (وجود-Being) چ وەکو خودی بوون وچ لەبوونی شتێکدا، یان بوونەوەرێکدا، جەوهەری ونەگۆڕە، هەرچی (صیرورة-Becoming) یە، ئەوا لەحاڵەتی شکڵ گرتن وگۆڕانی بەردەوامدایە، بۆیە ئێمە لەکۆی ئەم باسەدا بۆ ووشەی (صیرورة)ی عەرەبی (هەبوون) بەکاردەهێنین. (و.ك)

[2]-هەندێك کەس ووشەی (کات) لەزمانی کوریدا بەرامبەر ووشەی (زمان)ی عەرەبی بەکاردێنن، بەلام ئێمە پێمان وایە جیاوازیان هەیە، بۆیە ووشەی (زەمان) وەکو خۆی بەکاردێنین، بەو ئومێدەی لەداهاتوودا ووشەیەکی گونجاوی بۆ دابنرێت. (و.ك)

[3]-لەبواری زانستیدا، خوازراو بریتی یە لە گەڕان بەدوای حەقیقەتدا، نەك گەڕان بەدوای سووددا، لەکاتێکدا کە حەقیقەت مەسەلەیەکی گرنگەو هەموو حەقیقەتێکیش کۆت کراوە، خۆ ئەگەر وامان وێنا کرد کەحەقیقەتێك هەیە، ئەوا پێویستە لەسەرمان بۆنموونە هەوڵبدەین پێگەیشتنی، بەلام ئەم حەقیقەتە بەرژەوەندی نەتەوە دەخاتە مەترسی یەوە، ئەوا لێرەدا کارەکەمان کارێکی مەترسیدار وبێ سوودە، چونکە هەموو سوودێك کە پێی دەگەین رووبەڕوو دەبێتەوە لەگەڵ حەقیقەتی زانستی داواکراودا. بەلام ئەوانەی کە زانست وڕاستیە زانستیەکان بەمەودای سوود بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی پێوەند ئەکەن، ئەوا ئەمانە بەدوای زانستێکی واقیعی بەسووددا دەگەڕێن، هەرچی زانستێکیش کە هیچ سوودی نیە ئەوان دەیخەنە لاوە، بەلام ئەوانەی کە زانست بۆ بەرژەوەندی بەکاردێنن

ئەوا زانست بە بەرژەوەندی ئەوانەوە کۆت وپێوەند ئەبێت، نەك بەرژەوەندییان بەزانست کۆت وپێوەند کراوبێت. مرۆڤ لەسەریەتی کە شوێنکەوتەی زانست بێت. بەبڕوای من شتێکی گرنگتر لە حەقیقەت بوونی نییە، هەندێ کات دەڵێین کە لەپێناو بەرژەوەندیدا پێویستە حەقیقەت بشاردرێتەوە. دەی لە ڕاستیدا ئەوانە نەحەقیقەتیان ناسیووەو نە بەرژەوەندی، بۆنموونە ئەگەر زانستی مێژوو وەربگرین، پێویستە ئامانجمان لە لێکۆڵینەوەکردنی زانینی ئەو مەسەلە شاردراوانە بێت کە تێیدا هەن نەك بەرژەوەندی کۆمەڵگە، چونکە کاتێك تێڕوانینمان دەبێتە تێڕوانینێکی زانستی ئەوا ئەم دۆخە لە خزمەتی کۆمەڵگا وبەرژەوەندی کۆمەڵگادا دەبێت، چونکە دیاریکردنی بەرژەوەندی کۆمەڵگا پێویستە بەرێگەی زانستی و لەرێگەی زانستەوە بێت. کاتێ واهەیە دەبینین لە چەند ماوەیەکی دیاریکراودا عەقڵ وزانست هەمیشە لە سڕبوون و چەتیدا بوون ئەمەش لەبەرئەوەی کە شوێنکەوتەی باوەڕو بەرژەوەندییەکان بوون و لەژێر باڵادەستیاندا بوون، تەنانەت لە ئاینیشدا نابێت کە سوود لە زانست وەربگرێت لەپێناو بڵاوبوونەوەیدا، وپێویست بەو جۆرەبێت کە ئاینزاکانی پێ ساغ بکرێتەوە، وبەم رێگایەش ئێمە زانست بە بیروباوەڕ کۆت و بەند بکرێت. ئەم حەقیقەتە وئەم گووتارە ئەوانە تێیدەگەن کە شەیدای حەقیقەتن وئەوانەی کە حەقیقەت لەسەرووی بەرژەوەندی تاکەکەسیانەی خۆیانەوە دادەنێن.

٤-پێویستە مێژووی هەر کۆمەڵگایەك بۆ کەرتە جیاوازەکان دابەشبکرێت و بەم رێگەیەش دەتوانین بەدوای ڕوخساری کەرتی ڕۆشنبیری، ئابووری، سیاسی وئاینیدا بگەڕێن وبەلام دوو کەرتی گرنگ هەیە یەکێکیان ماتریالی و ڕژێمی وەبەرهێنان، ڕژێمی چینایەتی و ئابووری) و دووەمیان مەعنەوی (بیروباوەڕ، ئاکار، ئەدەب، هونەر، تایبەتمەندییەکانی کلتوور) و بەدەربڕینێکی تر، ئەگەر مێژوومان بەپێی تەمەنی مرۆڤ وەرگرت، ئەوا لێکۆڵینەوەی بوارەکانی فیسیۆلۆژی وسایکۆلۆژی و، ڕەوتی جوڵە وگۆڕانکاری و ڕووداوە جەستەییەکان وشۆڕشە هزری وئەخلاقی وڕۆحییەکان وسەلیقە وباوەڕ دەبێت بە نیشانەی هێمای کارتێکەر لە ژیانی میللەتانی دیاریکراو.

[5]-دەکرێت زەمان بۆ سێ بەش دابەش بکەین:أ- زەمانی ڕۆژمێری: لێرەدا مەبەست لەو زەمانە سروشتیەیە کە کاتژمێر بۆمان دەردەخات، کارکردنی ئەم زەمەنەش بریتی یە لە جووڵەی زەوی و سووڕانەوەی بەدەوری خۆردا، وبەشەکانی ئەم زەمانەش هەر یەکێک وجووڵەیەکی هاوشێوەی زەمانی هەیە. ب- زەمانی کۆمەلایەتی: ئەمە چەمکی (گۆرڤیچ) کۆمەڵناسی گەورەی هاوچەرخە، هەروەك چۆن کارکردنی زەمەنی ڕۆژمێری جوڵەی سروشتیە، ئەوا جووڵەی کۆمەڵگە بنەما وتوانای زەمانی کۆمەلایەتیە. ج- جۆرێکی تر لە زەمان هەیە کە هەموومان هەستی پێدەکەین و لەدیدی منەوە جۆری سێیەمە بۆ زەمان کە لەجۆرەکانی تر ناچێ بنەمای ئەم زەمانەش دیسانەوە جووڵەیە. جوڵەی ئەم زەمەنە نە لەسروشتدایە ونە لە کۆمەڵگەدا بەڵکو لە ڕۆحدایە، ئەمەش بریتی یە لە زەمانی دەروونی وەك ناووم ناوە. لە کاتێکدا کە چۆنیەتیەکان (کیفیات)ی ئەم زەمانە سۆزگەراییە. بەگوزارشتی (ماسینۆن) خەلاتێکی تایبەتە بۆ ژیانی تاکە مرۆڤێك وهەندێ کات لە زەمانی کۆمەلایەتی و ڕۆژمێری وەریدەگرێ وهەندێ کاتیش لە کارلێکی ئەم دوو زەمانەوە دروست دەبێت و ڕەوتی خۆی وەردەگرێ و هەندێ کات بە هێواشی دەبزوێ و لۆژیکی دەبێت و هەندێ کاتیش بەخێرایی دەبزوێ وجووڵەکەی جوولەی شۆڕشگێڕییە، وئەم جوولانەش بریتین لە تایبەتمەندییەکانی ئەم زەمەنە. تەنیا ناسینی کەسایەتیەکان وتاکەکان بۆمان گرنگ نیە، بەڵکو ئەو لەم دەروازەیەوە کاریگەری بەسەر بزوتنەوەی کۆمەلایەتیەوە جێدێڵێ وتەنیا ئەمەش بۆ کۆمەڵناس یان نووسەر یان مرۆڤناس (ئەنسرۆپۆلۆجیست) ومامۆستا وپەروەردەکار گرنگ نیە، بەڵکو گرنگیشە بۆ ڕۆشنبیران بەگشتی و بەهایەکی زانستی گرنگیشی لەم بوارەدا هەیە.

[6]-ئەم دابەشکارییە بریتی یە لە پرۆژەیەکی سەرەتایی لەپێناو سەرەتا وشەرعیەت دان بە کارەکەدا، هەروەها خاسیەتی زانستی و لۆژیکیشی هەڵگرتووە.

[7]-ئاڤێستا بریتی یە لە کتێبی پیرۆزی ئاینی زەردەشتی. (و.ع)

[8]-خوێندنەوە وتوێژینەوەی شارستانیەت بە (ابن خلدون) دەست پێدەکات وبە (توێنبی) کۆتایی دێ، لەکاتێکدا ئەمەی داوییان لە گەورەترین کۆمەڵناسەکان دائەنرێ

کــە ٢٧ شارســتانیەتی ناســاندووە، ئــەوەش بەرهــەمی پــشت پێبەســتنی هــەموو کۆمەڵناسانە.

٩-مەلامەتیــە دەســتەیەکی ســۆفیگەریوون، وەهەنــدێك لــە ســۆفیگەران وزانــین دۆستان(أصحاب المعرفة) لە گروپە ئیسلامیەکان دایان نانێن، بە لەبەرچاو گرتنی بوونی لادان وچەوتی لە بیروباوەڕیاندا. (و.ع)

١٠- لێرەدا مەبەست لە کلتووری یۆنانی ئەو کلتوورە نیە کە تەنیا لە ماوەیەکی زەمەنیدا لە کۆمەڵگای یۆنانی کۆندا هەبوو، بەڵکو مەبەست لە کلتووری ڕۆژئاوایە لە سەردەمەکانی دواتریشدا تا دەگاتە سەردەمی ئێستامان، وەك درێژکراوەی کلتووری یۆنانی. (و.ك)

١١- نیچە ناو لەم مرۆڤە نوێیە دەنێ (سۆپەرمان- مرۆڤی باڵا) واتە مرۆڤێك کە لەسەرووی کۆمەڵگە و بەهاکانی کۆمەڵگە وئەخلاقەوەیە. (و.ك)

١٢- (خەیام) شاعیری گەورەی ئێرانی، کە شعرەکانی دوودڵیەکی زۆری تێدایە بەرامبەر بە خودا وئاین وبەتایبەتیش ئاینی ئیسلام، و زۆرجاریش مرۆۆ پێی وایە کە جگە لە گومڕایی هیچی تر نین. (و.ك)

١٣- لێرەدا نووسەر مەبەستی لە دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەمریکایە، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە دەقە فارسیەکەم لانەبوو، نازانم خودی نوسەریش ووشەی (هیندییە سوورەکان)ی بەکارهێناوە یان وەرگێڕی عەرەبی ئەم ووشەیەی بەکارهێناوە، بەڵام هەرکامیان بەکاریان هێنابێت ئەوا ئێمە پێمان وانیە کە ئەم ووشەیە بۆ ئاماژەکردن بە دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەمریکا شیاو بێت، چونکە ڕەنگە ئەم ناوە بەهۆی ئەو باوەڕەی کۆلۆمبسەوە لەو دانیشتوانانە نرابێت، کە کۆلۆمبس هەتا مردیش پێی وانەبوو زەمینێکی نوێی دۆزیوەتەوە، بەڵکو هەر پێی وابوو گەیشتۆتە هیندستان وخەڵکانی ئەو ناوچەیەش هیندین. ئێمەش لێرەدا لەبەر ئامانەتی وەرگێڕان ئەم ووشەیە وەکو خۆی دادەنێینەوە. (و.ك)

١٤- بۆ هەر هۆزێك لە هۆزەکان لە سەردەمی پێش مێژوو تەوتەمێك هەبوو ئەپەرسترا، ئەم تەوتەمەش جێ گرتنەوەی ڕۆحی باوباپیرانی دەنواند، ڕۆحەکە لە ئاژەڵ یان درەختێکدا جێی دەگرتەوە، و بۆ ئەو ئاژەڵ یان درەختەش لەسەرەتاوە وێنەیان لەسەر جەستەیان و لەسەر جل وبەرگیان دەکێشا، لەپاشانیش بتێکیان بۆ هەڵدەکۆڵی ولە دێیەکەیان یان شارەکەیاندا دلیان دەنا وقوربانی وکەس وکاریان پێشکەش دەکرد ودواتر بتەکە دەگۆڕا بۆ پەرستراوێك کە ڕۆحی خواوەندی دەنواند. (و.ع)

# ڕاڤە شارستانیەکانی مێژوو

و. بەدەسکارییەوە: جوامێر محەمەد

پێشەکی :

شارستانیەت سەرجەم چالاکییە مادی و مەعنەوی و هزریەکانی مرۆڤ لە تێکڕای سەردەمەکان دەگرێتەوە، لەبەرئەوە شارستانیەت خاوەنی هەردوو ڕەهەندەی مەعنەوی و مادییە، واتا هەموو ئەو کاریگەرییە هزری و مادیيانەی کە مرۆڤ لەقۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا بەجێی دەهێڵێ، لەگەڵ سەرهەڵدانی شارستانیەت و ڕوخانی.

لە تێڕوانینی مێژووەوە دەبینین کە نەتەوەگەلێك سەریان هەڵداوەو هەندێکی دیکەش تیاچوون، ئاماژەکانیش سەبارەت بە سەرهەڵدانی نەتەوەو شارستانیەتەکان بریتین لە چەند فاکتەرێك لەرزین و پارچەپارچە بوونەوە تا دەگاتە گەندەڵی، یاخود ڕاڤەی ئایینی کە بریتییە لاری کردن لە فەرمایشتەکانی خودا، هەندێك لە بیرمەندانیش تێبینی ڕوودانی چەندین سوڕیان کردووە لە بوژانەوەوە بۆ ڕوخان، لە جەنگەوە بۆ بوژانەوەو، لەداگیرکاری و هەژاری و برسێتییەوە بۆ بەهێزی و پەرەپێدان و بەرزبوونەوەو سەرکەوتن، هەروەها سەرهەڵدان و دروستبوونی شارستانیەتەکانی وەکو بابلی و ئاشوری و ڕۆمانی ، کە فاکتەرەکانی ڕوخان

و هەرەس هێنان تیایاندا وێکچووە، هەروەکو چۆن لە بوارەکانی کارگێڕی و ئابووریدا وێك چوونیان هەیە، تەنگژەکانیش یان لەنێوخۆدا ڕوودەدەن یاخود بەهۆی داگیرکاری دەرەکیەوە وەکو ئەوەی تووشی ئەو ئیمپراتۆریەتانە بوو کە بەربەرییە داگیرکەرەکان ڕوخاندنیان.

پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە: ئایا شارستانیەت لە هەڵسەنگاندنیدا پشت بە چوارچێوەی سیاسی دەبەستێت؟ یاخود ڕواڵەتی سیاسی یەکێکە لە ڕواڵەتەکانی شارستانیەت؟ سیاسەت یاخود ڕواڵەتی شارستانیانەی شارستانیەتێك و پێکهێنانی چێوەی ئاسایش و کارگێڕی شارستانیەت و تێهەڵکێش بوونی سیاسەت بەدەسەلات و هێز، کە ڕواڵەتێکە لەڕواڵەتەکانی دەسەلات، فەیلەسووفەکان پشت بەوە دەبەستن کە هێز هەر دەبێ هەبێت لە بەڕێوەبردنی کارەکانی مرۆڤدا، چونکە لە نەبوونی هێزدا پشێوی و توندوتیژی سەرهەڵدەدات و خواست و غەریزەکان بەئاراستەی کاولکاریدا ڕێ دەکەن، هەر بۆیە دەبێ ڕێکخستنی چالاکیەکانی کۆنترۆڵ بکرێت، بەلام لێرەدا جیاوازی لەبارەی شێوەو چەشن و هەروەها جۆری دەسەلاتە، و زۆرێك لەکارو چالاکییە ئابووری و هونەریەکانیش دەسەلات ئاراستەی دەکات، و بە هەرەسهێنانی ئەمەی دوایی دیواری سیاسی و ئاسایشیش هەرەس دێنێ.

بیرمەندانی دیکەش کە بە شێوەیەکی تر سەرهەڵدان و ڕوخانی شارستانیەتیان چارەکردووە هاتنە ئاراوە، کە کۆمەڵێکیان گەشبینن و کۆمەڵەکەی دیکەش ڕەشبین، کۆمەڵی یەکەم دەیگووت هەموو شارستانیەتێك هەر لە لەدایك بوونیەوە مردنیش لە چارەیدا نووسراوە، چونکە خودی هۆکاری سەرهەڵدان هۆکاری ڕوخانیشە، لێرەشدا شارستانیەتیان چواندووە

بـە بوونـەوەرێكی زینـدوو لـە سـەرەتای منداڵیـەوە تـامردنی، لەمانـەش وەك (ئیبن خەلدون– ڤیكۆ– شپینگلەر).

كۆمەڵەی دووەمیش پێیان وایە كە شارسـتانیەت سـەرهەڵدەدات، بـەلام لەهەمان كاتدا مەرج نییە بڕوخێت لەمانەش وەك خاوەن بیردۆزە شۆڕشگێڕیە مادییەكان و نەتەوەخوازو سۆشیالیسـتە پێشكەوتوخوازەكان، و ئـەو پارتـە شۆڕشـگێڕییە هاوچـەرخانەی كـە باوەڕیـان بـە ڕوخـانی شارسـتانیەت نییـە، چونكە ئەمانە لە یاساكانی مێژوویان كۆڵیوەتەوەو باوەڕیان بە گەشـەكردن و بنیات نانی مرۆڤە بەشێوەیەكی باشتر وەكو ماركسیستەكان، هەروەكو پێـان وایە كە بوژانەوەی شارسـتانیەت دووبـارە لـەدوای ڕووداوەكـان سـەر لـەنوێ سەرهەڵدەداتەوە ئەمەش بە كردەی مرۆڤ لەڕێگـەی توانـا شـاراوەكانیەوە، و ئازادببونی مرۆڤ لە تاریكایی مێژوو و یاسا دووبارەكانی و ئافراندنی یاساكانی ئاشتی و بنیاتنان و پێشكەوتن و سۆشیالیستی و هاوكاری لەگەڵ گەلانـدا، و یەكسانی نێوان گەلان، كە ئەمانەش هزرگەلێكی گەشبینن .

یەكەم / ئیبن خەلدون :

بیرمەنـدو مێـژوونووس و كۆمەڵناسـی عـەرەبی و ئیـسلامی و هـەروەها جیهـانی (١٣٣٢–١٤٠٦ز)، كـە لەلایـەن عـەرەب و ڕۆژئاواییەكانـەوە بایـەخی پێدراوە بەو پێیەی یەكێكە لـەو زانـا بلیمـەت و ناوازانـەی كـە شارسـتانیەتی ئیسلامی هێنایەبوون لە ئەسـتەم تـرین سـەدەكانی عـەرەبی كـە ڕووبـەڕووی بەرەنگاری بێگانەو پارچەپارچە بوونی ناوخۆیی بووبووەوە.كە هەندێك پێیـان وایەئەم هەلومەرجە ئیبن خەلدونی زیاتر دنەداوە لەسەر دانـانی تیۆرەكـەی و ئەو ناوبانگەی كە بەدەستی هێنا، كە تیۆرێكی فەلسەفی زەمینـی (وضـعي)

لەخۆ دەگرێت، و وەسفی ئەو سەردەمەیەتی بەهەموو دژیەکەکانیەوە لە سیاسەت و کۆمەڵگەو ئابوری و فەلسەفە، ئەزموون و شیکاریەکانیشی لە کتێبی (پێشەکی)دا خستۆتەڕوو، لەم ڕووەوە لە تیۆرەکەیدا ئەوە دووپات دەکاتەوە کە شارستانیەتەکان سەرهەڵدەدەن و گەشەدەکەن پاشان دەڕوخێن هاوشێوەی بوونەوەرێکی زیندوو، کە لەدایك بوونی هەیەو پاشان گەشە دەکات و دواتر پیێ دەگات و بزڵە دەبێ تا دەگاتە مەرگ و تیاچوون. لێرەشدا ئیبن خەلدون قۆناغەکانی سەرهەڵدان و گەشەکردنی شارستانیەتی دابەشکردووە بەسەر سێ بەشدا :

١- قۆناغی دەوارنشینی .

٢- قۆناغی شارنشینی

٣- قۆناغی خۆشنوودی (شاد ژیانی)

لە قۆناغی یەکەمدا ئیبن خەلدون ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە قۆناغی یەکەم لەسەر بنەمای دەمارگیری سەرهەڵدەدات کە لەزۆربەی کاتدا گەلێك پێی هەڵدەستێ کە بە دەوارنشینی جیادەکرێنەوە، وەکو بیابان نشینەکان و مەغۆلەکان و ئەو گەلانەی کە دوور لەشارستانیەتەوە ژیان دەگوزەرێنن، ئەمانەش بە بنیات نەری شارستانیەتی بەربەری دادەنرێن، و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەم نەتەوانە بە سەرسەختی و ئازایەتی و یەکانگیری جیادەکرێنەوە، کە زۆربەی کات بەدەست سەختی گوزەران و لاوازی باری ئابوریەوە دەناڵێنن کەچی خۆیان گونجاندووە لەگەڵ کەموکورتی ئابوریی ئەمەش بە قەرەبووکردنەوە لە ڕێگەی داگیرکاری و ئەو فەزیلەتانەی کە هەیانە وەك لێهاتوویی و پیاوەتی و ئابڕوو و کەرامەت و ئەو دەمارگیریەی کە

لەنێو دەوارنشیندا بوونی هەیە، لەبەرئەوەی سروشتی ژینگەکەیان گونجاندوونی بۆ ئەم دەمارگیرییە کە جیاوازە لە هەزاران دەمارگیری دیکە کە ئێستا لە سەرجەم کۆمەڵگەکاندا هەیە.

لەسەردەمی ئیبن خەلدوندا هەلومەرجی هەرەسهێنانی شارستانی لە باکووری ئەندەلوس و سەردەمی تایەفەکان و دەوڵەتەکانی باکووری ئەفریقیا سەری هەڵدا، هەروەها خۆیشی هاوچەرخی داگیرکاری بێگانەکان بووە، تیۆرەکەیشی وەك وەسفێکی ئەو ململانێیەی نێوان شارنشین و دەوارنشین لەسەر دەسەڵات هاتە ئاراوە، هەرچەندە تیۆرەکەی لەگەڵ سەردەمەکەیدا دەگونجا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێ ببێتە یاسایەك لەسەردەمی نوێدا، لەبەر ئەوەی پێشفەچوونی مرۆڤایەتی چەندین ئامرازی نوێ ی هێناوەتە ئاراوە بۆ بنیات نانی شارستانیەت، تەنانەت زۆرجاریش خەڵکی شارنشین و دەوارنشین هاوکارو پشتگیرن لە پێناو بنیات نانی شارستانیەتێکی دیاریکراودا وەکو سەرهەڵدانی ویلایەتە یەکگرتووەکان کە لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە ڕەوکردووەکانی لە وڵاتان و شارستانیەتەکانی دیکە لە ئامێز گرت.

ئیبن خەلدون باسی لەوە کردووە کە دروست بوونی کۆمەڵگە لە ناوچەیەکی سەرزەویدا ڕویداوە، و شوێن و سەرزەمینەکانیش یەك لەوی دیکە جیاوازە، و ئەمەش وای کرد کە کەش و ئاووهەواو کۆمەڵگەکان جیاواز بن لەیەکتر، کە کاریگەریەکی ڕوون و ئاشکرایشی هەیە لە جیاوازی کۆمەڵگەدا، ئەمەش لە جۆراوجۆری مرۆڤەکان و ڕەنگ و ڕەوشتیان و ژیریاندا دەردەکەوێ، پاشان لە سەرجەم لایەنە جیاوازەکانی ژیانداو لە شێوەی ئەو ئاوەدانییەی بنیاتی دەنێنن تا ئەندازەی ئەو شارنشینییەی پێی دەگەن.

هەروەها ئیبن خەلدون باسی لەوەش کردووە کە کۆمەڵگەی مرۆیی پێشدەکەوێت و ڕێدەکات هەروەك بوونەوەرێکی زیندوو لە منداڵی / لاوێتی / چوونە ساڵەوە / پیری / مردن، هەروەها ژیانی گەلان و نەتەوەکان لە ڕێی زەمانەوە گوزەر دەکات بەشێوەی سوڕەکان ئەوەتا هێشتا کۆمەڵگەیەکی کۆن کە خەریکە پیر ببێت نزیك ببێتەوە لە تیاچوون کەچی کۆمەڵگەیەکی نوێ تێکی دەشکێنێ جێی دەگرێتەوەو ڕێڕەوەکەی ئەو دووبارە دەکاتەوە کە لە دۆخی دەوارنشینیەوە پێ دەکات پاش ئەوەی بەدۆخی داگیرکاری یان فەتح کردندا گوزەری کردووە و پاشان بەدۆخی شارنشینی کۆتایی پێ دێت .

ئەم دۆخانەش بریتین لەمانە :

١- دۆخی دەوارنشینی:

دەوارنشینی لای ئیبن خەلدون بریتییە لە نیشتەجێ بوون لە پانتاییەکی زەویداو پشت بەستن بە باران و ئەوەی لێی بەرهەم دێت، یاخود هەندێکیان پەنا دەبەنە بەر بەخێوکردنی ئاژەڵ لەمەڕو مانگاو حوشتر، بژێوی دەوارنشین لە دابینکردنی پێداویستیەکانی وەکو خواردن و پۆشاك و دەوارێك دا کورت دەبێتەوە،لەبەرئەوە زبری ژیانی دەوارنشینی پێش خۆشنودی شارستانیەتە، وە دەورانشینی دۆخێکی پێشکەوتووە لەشارستانیەت و بگرە بایەخدارترو نزیکترە لە هەژاری وچاکەو خۆرسکی و بوێرترن لە شارنشین و حەزیان لە متمانە بەخۆبوون و ئازادی و دەست پێشخەرییە لە فتوحاتدا. لێرەشدا خێل کرۆك و ناوکی دەوارنشینی کۆمەڵایەتییە و کە تیایدا دەمێننەوە یان کۆچ دەکەن و هەر لەمیانەیەوە هاوکاری یەکدی دەکەن،و پەیوەستیەك کۆیان دەکاتەوە کە ئەویش دەمارگیری و پەیوەستی ڕەچەڵەك و خوێنە کە

دڵسۆزی و کۆدەنگی و هاوپەیمانی خێڵەکی بەرهەم دێنێ، لێرەدا توخمە سەرەکییەکانی دەوارنشینی بریتین لەمانە :

هەژاری ← بیابان ← دەرمارگیری ← شکۆمەندی بەبێ زەبوونی ← توانا بەسەر زاڵبووندا .

٢- دۆخی داگیرکاری (فەتح کردن) :

کاتێك کە دەوارنشین بەدەست زیادبوونی دانیشتوان لە ساراکان و تەنگ و چەڵمەی گوزەرانەوە ناڵاندی، ئیدی داگیرکاری و ناکۆکی لە سارادا سەری هەڵدا، وای لێهات هەر دەستەو گرووپێك لە سەردارێکی خێڵەکی و سەرکردەیەك لە جەنگدا کۆببنەوە، بەڕادەیەك کە هێرش بکەنە سەر خێڵەکانی دیکەو هەرچی مەڕو ماڵات و خەرمانیان هەیە تاڵانی بکەن، و دەستیش بەسەر لەوەڕگاو کێڵگەکاندا بگرن، و پیاوەکان کۆیلە و ئافرەتەکانیش دیل و نامۆ بکرێن، و جەنگ داگیرکاریش لە نێوان دەوڵەتە دراوسێکادا زیاتر دەبێت لەگەڵ زێدەبوونی ڕادەی تێکەڵاوبوون و لایەنگیری و پێویست بوون بە هۆو پێداویستیەکانی ژیان و خۆشنودی و دەسەڵات گرتنەدەست و دەسکەوتەکان و پێویستی بۆ گۆڕانی دەوارنشینی بەڕادەیەك کە لە دۆخی دەوارنشینیەوە بچێتە دەرەوە بەرەو شارستانیەت و شارنشینی، کەواتە لێرەدا داگیرکاری بریتییە لە دۆخێك لە نێوان دەوارنشینی و شارستانیەتدا .

٣- دۆخی شارستانیەت :

لەوانەیە پاڵنەری سیاسی و ئایینی هۆکارێك بێت بۆ بەهێزی خێل تاکو ببێت بە ڕکابەری بەهێزترین دەوڵەت، ودوای بەدەستهێنانی داگیرکاری یاخود

فەتح کـردن دەوڵـەت دادەمـەزرێت و کۆمەڵگـەش لـە دۆخـی دەوارنـشینیەوە بـەرەو دۆخـی شارسـتانی بـوون تێدەپـەڕێ، ئەمـەی دوابیـان بریتییـە لـە هونەراندن لە خۆشگوزەرانی و لێزانی لە کارو فرمـان و کارامـەیی لـە پیـشەو بایەخدان بە خواردن و خواردنەوەو جل وبەرگ و ناومالّ و پێخەف و چێژ لـە کاتی هەوەس و ئارەزوودا، و ڕواڵەتـە کۆمەلاّیەتیـەکانی وەکـو گـزی کـردن و دزی و تێکچوونی ڕەوشت و خۆڕوتکردنەوەو شـوێن کـەوتنی ئارەزووەکـان و خۆدزینـەوە لەبەرپرسـیارێتی و بـەڵێن وبەیمانـەکان و هونەرانـدن لەگـەڕان بـەدوای هەوەسـدا لەگـەلّ لاوازبـوون و بەرزبوونـەوەی نرخـەکان و پێویـستی بوونی زێدەتر بەسامان و دارایی و دەست بڵاوی لە خۆشنودیدا، هاوڕێیی ئەم دۆخەیە.

هەرچـی ڕواڵەتـە ئابوریەکانـە بریتییـە لـە دامەزرانـدنی پیـشەسازی و کشتوکالّ و بازرگانی و فرەبوونی ئاوەدانی و کارکردن و شان وشکۆو سـامان و سەرهەڵدانی ڕوپامایی کـردن بـۆ خـەڵکانی خـاوەن شـکۆو سـامان و هـەنێ جاریش ئەوەی لە ئاستی نزمدایە بەسەر دەکەوێ و ئەوەشـی لەسـەرەوەدایە نزم دەبێتـەوە، هـەروەها پاشـکەوتوویی بـالّ دەکێـشێ بەسـەر دەوڵەتـدا تـا لەکۆتاییدا دەگاتە قۆناغی هەرەسهێنان و ڕووخان.

ڕواڵەتە ڕۆشنبیریەکانیش بریتین لە خەریك بوون بە زانـستە گوێزراوەکـان (العلـوم النقلیـە) وەکـو قورئـان و ڕاڤـەکردن و فیقهـو قـسەزانی، و زانـستە ژیریـەکانی وەکـو ئەنـدازیاری و مۆزیـك و لۆژیـك و پزیـشکی و ژمێریـاری و گەردوونناسی، و زانستە سروشتیەکان و مرۆییـەکانی وەك زمـان و ڕێزمـان و ڕەوانبێژی و هی دیکە .

هەرچی ڕواڵەتە سیاسیەکانیشە، ئەوا پاشا سەری دەوڵەتە و سەرەتاش کەس و کارەکەی و تیرەکەی بەدەوریدا کۆدەبنەوە تا بەهۆیەوە دورترین کەسیش لێیەوە لە فەرمانڕەوایی و پۆستە فەرمیەکاندا دەگاتە دەسەڵات و تەفرەیان دەدات وپەنیان پێ دەدات پاشان لایەنگرەکان لەخۆی نزیک دەکاتەوەو ئەوانیش سەرکێشی دەکەن و دەبنە ستەمکار بەو پێیەش دوای لاوازبوونی دەوڵەت باڵ دەکێشن بەسەر خەلافەتتدا تائەو ڕادەیەی خەلیفە لادەبەن هەروەکو لە دەوڵەتی عەباسی و پاشان لە دەوڵەتی مەملوکیدا ڕویدا، بەم شێوەیە دەوڵەت یان نەتەوە بەچەند قۆناغێکدا گوزەر دەکات کە بریتین لە :

١- زبری و سەختی لە دەورانشیندا .

٢- خۆشنودی شارنشینی بوون و خۆشکۆدارکردن و گەندەڵ بوونی تیرە (تاقم و دەستە) .

٣- لەبیرکردنی دەمارگیری و فرەکردنی لایەنگیری .

٤- لاوازی و پیری و تیاچوون پاشان ڕوخان .

**دووەم / ڤیکۆ :**

جیۆڤانی باتیستا ڤیکۆ لە ناپۆلی ساڵی ١٦٦٨ز هاتۆتە دنیاوە، کەسێکی خاوەن زانست بوو پاش ئەوەی باوکی لە کتێبخانەیەکدا کاری دەکرد، پاشان چووەتە کۆلێژی یەسوعی و زمانە کۆنەکان و فەلسەفە و لاهوت و یاسای خوێندووە، لەساڵی ١٦٩٥ز وەك مامۆستای یاسا کاری کردووە، پاشان گەڕایەوە بۆ شارەکەی و دەستی کرد بە گرنگی دان بە توێژینەوە کلاسیکیەکان و دواتر بووەتە مامۆستای یاسای شارستانی لە زانکۆی ناپۆلی، گرنگترین دانراوەکانیشی بریتییە لە :

" سروشتی هاوبەشی نەتەوەکان" کە ساڵی ١٧٢٥ز بڵاوی کردەوە، تیۆرەکەی ڤیکۆ لە بەدوایەکدا هاتنی سوڕی شارستانیەتەکان پشت چەند ڕاستیەکی بەڵگەنەویست دەبەستێت، ئەویش ئەوەیە کە چاخەکانی مێژوو هەروەکو خاوەن تایبەتمەندی گشتین، ئاواش ڕوونی کردۆتەوە کە چاخە جیاوازەکان تایبەتمەندی هاوبەشیان هەیە، وە هەموو ماوەیەکی مێژوویی لەسەر هەمان هێڵ بەدوای ئەوی تیدا دێت، وە ماوەکانی پاڵەوانێتی بەدوایدا ماوەکانی هێزر دێت پاشان سەرهەڵدانی ئەندێشەو پەخشان و شیعرو پیشەسازی و گۆڕان بۆ کشتوکاڵ و، ڕەوشت و ئاشتی یاخود بە پێچەوانەوە، دواتر لەبەریەکهەڵوەشانەوەو پاشان بەربەریەت.

لێرەدا ئەم بزاوتە بازنەییەی کە ڤیکۆ ئاماژەی بۆ دەکات مانای ئەوەنییە کە ڕێڕەوی مێژوو بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، بەڵکو بزاوتێکی پێچاوپێچە (حلزونی) لەبەر ئەوەی مێژوو خودی خۆی دووبارە ناگەڕێنێتەوە بۆ هەمان شێواز، بەڵام بەوێناو شێوەی جیاواز لەڕابردوو دووبارە دەبێتەوە، کەواتە مێژوو لەنوێ بوونەوەی بەردەوامدایە و بەدوایەکداهاتنی سوڕیی تێایدا ڕێ نادات بە پێشبینیکردن، لێرەشدا مێژوو دابەش دەکات بەسەر سێ بەشدا:

بەشی یەکەم/ ڕۆڵی خوداوەندەکان: لەم قۆناغەدا گەلانی نێو نەتەوەیی لەسایەی حکومەتەکانەوە کە یاساکانیان دادەڕشت بەوپێیەی کە ویستێکی خواوەندە لەڕێگەی سروشی پیاواتی ئاینی و سەردارە ئاینیەکانەوە، ژیانیان دەگوزەراند.

**بەشی دووەم/ ڕۆڵی پاڵەوانەکان:** لێرەشدا فەرمانڕەوایی بەدەستی پاڵەوانە جەنگاوەرەکانە و خوڵکیش باوەڕیان وایە کە ئەمانە لە مرۆڤی ئاسایی باڵاترن، و لەسیستەمی فەرمانڕەواییشدا ئەرستۆکراتیەت باڵا دەبێت، لەم سوڕەشدا سوارچاکێتی و جەنگی خاچ دروشمەکان سەرهەڵدەدات.

**بەشی سێیەم/ ڕۆڵی مرۆڤەکان:** لەم سەردەمەشدا یەکسان بوونی مرۆڤەکان دانی پێدانرا، ئەمەش وای کرد کە سیستەمی دیموکراتی لەپاش سیستەمە پادشاییە ستەمکاەرکان سەرهەڵبدات.

هەموو گەلانیش ئەم سوڕانەیان بڕیوەو بەردەوامیش لە مێژوویاندا دەیبڕن، کە لەبەدوا یەکداهاتنی سوڕیدا بەدوای یەکدا دێن و لەکۆتایی سوڕی سێیەمدا پەیوەست دەبێت بەسوڕی یەکەم، کەواتە بزاوتێکی بازنەیی ئەزەلی بڵندە بۆ هەموو نەتەوەیەك.

ڤیکۆ لە میتۆدە مێژووییەکەیدا باسی لە ڕاڤەی شارستانی مێژوو کردووە، و لەم بارەوە ڤیکۆ ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە مێژووی شارستانیانەی مرۆڤ بەسێ قۆناغدا دەگوزەرێت، قۆناغی یەکەم بریتییە لە قۆناغی خواوەندێتی یاخود ڕۆڵی خواوەندەکان کە لەنێویدا کاهینەکان و پیاوانی ئایینی بزوێنەری مێژوون و دەسەڵاتی پیاوانی ئاینییش ڕژێمی فەرمانڕەوایەتی پێك دێنێ ، لێرەدا تێبینی دەکەین کە فاکتەری ئایینی زاڵە و بزوێنەری کۆی بزاوتە مرۆییەکانە کە دەیبزوێنێ و ئاراستەی دەکات، سەرەڕای جیاکردنەوەی نێوان خواوەندەکان لەلای ڤیکۆ لەبەرئەوەی بیروباوەڕی بت پەرستی هەیە و ئایینی ئاسمانیش هەیە بەو پێیەی فاکتەری ئایینین ڤیکۆی ڕووبەڕووی گازاندەی ئەمانەی دوایی کردۆتەوە، لەوانەیە ڤیکۆ مێژوو شارستانیەتە

کۆنــەکانی وا خوێندبێتــەوە بــەو پێیــەی کــە پێـشەوای سیاســی لەهــەمان کاتداپێشەوای ئایینیش بووە.

بــەڵام قۆنــاغی دووەم کــە بریتییــە لــە قۆنــاغی پاڵــەوانێتی کــە تیایــدا پاڵەوانەکانی شارەزاو ڕاهاتوو بە شـەڕو جەنگـەکان و فراوانخـوازی کۆمەڵگـە بەڕێوەدەبـەن، و ڕژێمـی فـەرمانڕەواییش ئەرسـتۆکراتییە کـە دەسـتەبژێری بنەماڵە فەرمانڕەواکان کە دامەزراوە سیاسی و سەربازی و ئابورییەکان لـەنێو خۆیدا کۆدەکاتەوە فەرمانڕەوایی دەکەن، پێدەچێ ئامازەیان بـۆ سـەردەقی بابەتگەلێکی وا کردبێت کە پاڵەوانانێکی لەم جۆرەی تێدا دەرکـەوتبێ وەکـو ئەسکەندەر و قەیسەرو ئاشورپانیپال و.. هی دیکە، جەنگ سوارچاکیش لـەم قۆناغەدا باڵادەبێت، پاشان قۆناغێکی نوێ کە مرۆڤەکان ڕێنورێنی دەکـات بـۆ جۆرە میکانیزمێکی شارستانی جیاواز، سەرهەڵدەدات.

لێرەدا قۆناغی سێیەم دێت "مرۆڤایەتی" کـە تیایـدا ڕژێمـی دیمـوکراتی باڵادەبێت، و بزاوتـی کۆمەڵگـەش هاوسـەنگ دەبێـت کـە ڕەمـەکی خـەڵك بـە پەیوەندیەکی سنوردار هاوبەشی تێدا دەکـەن، و ڕۆڵـی پاڵـەوان و پێـشەوای ئایینی نامێنێ، لەم قۆناغەشدا هزری باو (سەردەم) زاڵ دەبێت بەسەر ژیاندا، و هــزری مــرۆڤیش پــێ دەگــات ڕووەو ژیــری و زانیــاری، و پیــشەسازی پێشکەوتوو، هەرچەندە ڤیکۆ مێژووی دابەشکردووە بۆ ئەم فاکتەرانە، بـەڵام ئەو دەڵێت کە ئەم سێ قۆناغە قۆناغی سوڕین و خۆیان دووبـارە دەکەنـەوە، بـەڵام نـەك بەشـێوەی بزاوتێکـی داخـراوی کلۆمـدراو بـەڵکو خـۆی دووبـارە دەکاتەوە بەشـێوەیەکی پێچاوپێـچی (حلزونـی)، سـەرەڕای ئەمـەش دەڵێـت کاتێـك کـە کۆمەڵگـە دەگاتــە قۆنـاغی کۆتـایی لـە خۆشـنودی و کامـەرانی و

داهێناناکاری ئەوا کۆمەڵگە هێدی هێدی دەست بە هەڵوەشانەوە دەکات، و سەر لەنوێ لە قۆناغی یەکەمەوە کۆمەڵگە دەست پێ دەکاتەوە هەر لەڕۆڵی خواوەندەکان و قۆناغی پاڵەوانێتی و پاشان زانستی و ..هی دیکە.

جگە لەمەش ڤیکۆ نایەوێ ئەوە بڵێت کە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە بەڵکو خودی دیاردەکە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە بەشێوازی نوێ نوێ دەگوازرێتەوە، واتە سوڕە شارستانیەکان بە سیمای جیاوازەوە دووبارە دەبێتەوە، لێرەشدا ڤیکۆ شارستانیەتی بە بوونەوەرێکی زیندوو چواندووە لە لەدایک بوونەوە بۆ لاوێتی و پاشان بۆ مردن.

چەندین ڕەخنەش ڕووبەڕووی تیۆرەکەی ڤیکۆ کراوەتەوە بەوەی کە زیاتر بیردۆزەیەکی وەسفییە لەوەی کە شیکاری بێت، پاشان دیدی بۆ(وەسف) فاکتەری ئایینی زاڵە بەسەریدا، گەر زانیمان ڤیکۆ مێژووی جولەکە، ئەوەی کە لە کتێبی پیرۆزو پەیمانی کۆن (تەورات) دا هاتووە کاری تێکردووە، و وای داناوە کە مێژوو بزاوتی شارستانیەت و داهێنانە و لە بایەخی شارستانیەتی کۆنی وەکو شارستانیەتی میسری و عێراقی کەم کردۆتەوە، لە کاتێکدا ڤیکۆ بزانێ یان نەزانێ کە جولەکەکان لە ژێر کاریگەری ئەم شارستانیەتانەدا بوون ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە ڤیکۆ پێی وایە کە جولەکەکانیش لەگەڵ شارستانیەتەکانی دیکەدا بت پەرست بوون و لەکاتێکدا سروشی خواییش بەقۆناغێکی پێشکەتوو دادەنێ، و باوەڕیشی وابوو کە جولەکە لە پێشترین گەلانی سەرزەوین، ئەمەش هەڵەیەو تێک ناکاتەوە لەگەڵ دیدو تیۆرەکەیدا.

ئەمە لەکاتێکدا کە دکتۆر ئەحمەد مەحمود سوبحی وای دەبینێ کە ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی ڤیکۆ دەکرێت ئەوەیە کە ڤیکۆ تەنها لەیەکێك لە

شارستانیەتە نێونەتەوەییەکانەوە وێنەی مێژووی هەڵێنجاوەو، کەرەستەی مێژووییشی لە کتێبی پیرۆزەوە – " کەوەکو زانراویشە لە کتێبی پیرۆزدا مێژوو تەها بەدەوری عیبرانیەکاندا دەخولێتەوە"– وەرگرتووە، ڕەخنەی لە شارستانیەتەکانی وەکو میسری و بابلی و چینی گرتووەو بە لەپێشترین شارستانیەتیان ئەژمار ناکات، بەڵکو ئەوە بەنادروست دەزانێت، و بیروباوەڕەکانیشیان بە گومڕایی و ئاینەکانیشیان بە جادوو و ئەفسانە، هەروەها لە پلەپایەو شکۆیان کەم دەکاتەوە بەهەموو لایەنەکانیانەوە.

لێرەدا ڤیکۆ میتۆدەکەی لە میتۆدی زانایەکی ئەندازیاری دەچێت کە هەموو بەراییەکانی دادەنێ و پاشان بەڵگەنەویستەکانی لێ هەڵدەگوزێت، پاشان ڤیکۆ بۆچونەکانی لە میانەی پشت بەستنی بە (پەیمانی کۆن) لە ڕۆحی زانستیەوە دوورە، هەڵسەنگاندنیشی بۆ شارستانیەتە کۆنەکان دەمارگیری ئایینی ئاڵۆزو گومانـاوی دەکات، خۆگەر بێت و چیرۆکەکانی پەیمانی کۆن ڕووبەڕووی ڕەخنەی مێژوویی بکرێتەوە وەکو ئەوەی لە چەرخی ڕۆشنگەری ڕوویدا ئەوە مانای هەرەسهێنانی بیرۆکە بنەڕەتیەکانە لە فەلسفەی ڤیکۆدا .

سێیەم/ شپینگلەر :

شپینگلەر (١٨٨٠–١٩٣٦ز) لەشاری بلاکنبێرگ لەدایك بووەو لە زانکۆی بەرلین خوێندوویەتی، پاشان لەمیونیخساڵچی ١٩٠٤ دکتۆرای بەدەست هێناوەو چەند کتێبێکی داناوەو بڵاوی کردۆتەوە، لەگرنگترینیان "هەڵوەشانەوەی ڕۆژئاوا"کە لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا نووسیویەتی و بەشی یەکەمی لەساڵی ١٩٢٠ز لێ دەرچووەو بەشی دووەمیشی لەساڵی

۱۹۲۲ز، کە دەروازەی سۆشیالی نیشتیمانی لە ئەڵمانیا دادەنرێت و پێشبینی چارەنووسی شارستانیەتی ڕۆژئاوای کردووە.

هەروەها شپینگلەر چەند کتێبێکی دیکەی داناوە لەبارەی بنەمای نوێ ی رایخی ئەڵمانی، و مرۆڤ و پیشەسازی تەکنیکی و تەمەنی شارستانیەتی ئەمریکی و، وتوویەتی هەر سەردەمێك کە خواوەندەکان تیایدا باڵابن و ئاراستە دژە ئاینیەکان بەسەریدا زاڵ بن ئەوە سەردەم و چەرخی ڕوخان و لێك هەڵوەشانەوەیە.

دەشێ ئەوەی کە زۆر گرینگ بێت لە تیۆرەکەی شپینگلەردا ئەوە بێت کە هەموو شارستانیەتێك کەسایەتی و تایبەتمەندی خۆی هەیە و هەر شارستانیەتێك بەو شەقل و بنەما گرنگەی کەهەیەتی ناوزەد دەکرێت، و کەسایەتیەکەی بەردەوام شوێنکەوتەیەتی بەڕادەیەك کە وەکو بوونەوەرێکی زیندوو وایە لە لەدایك بوون و گەشەکردن و بەساڵاچوون و نەمان و مردن، لێرەدا شپینگلەر ژیانی هەموو شارستانیەتێکی بە بەدوایەکدا هاتنی چوار وەرزەکەی ساڵ چواندووە کەبریتین لە:

– بەهار، کە بریتییە لەملوەی پاڵەوانێتی کە لە ئەفسانەکان و هەڵبەستە ئەندێشەییەکاندایە.

– هاوین، بیتییە لە ماوەی دەرکەوتنی سەرکردە سمرپیوو تەماعگیرەکان و سەرهەڵدانی پەرەگرتنی دەوڵەتە شارەکان و قۆناغی پێگەیشتنی تەواوەتی لە ڕۆشنبیریدا لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرەتاکانی چوونە ساڵەوەو لە کۆتاییشدا شەکەتی لە خاوەنداریدا کە فەلسەفە بە "سەردەمی ڕۆشنگەری" ناوی دەنێت.

– زستان، لێرەشدا شارستانیەت ڕۆحی داهێنانکاری لەدەست دەدات و دەبێتە تەنها شارێك كە زانست بەسەر پیشەسازیدا جێبەجێ دەکات.وە کاتێکیش دوو شارستانیەت بەیەك دەگەن ویەکێکیان لەوی دیکەیان بەهێزترە، بەڵام ئەوی دیکەیان مەزنترە بە داهێنانکاری و ڕەسەنایەتی پتر، یان بەلای کەمەوە یەکسانە لەگەڵیدا ئیدی شارستانیەتە شکست خواردووەکە ناچار دەبێت لەڕواڵەتدا خۆی بگونجێنێت لەگەڵ زاڵبووەکەدا، لەبەر ئەوەی ناتوانێت ڕێ بکات و گوزارشت لەسروشتی پوختی خۆی بکات، لێرەدا ئەوانەی کە لە دوورەوە دەڕوانن وا گومان دەبەن کە ئیدی شارستانیەتە شکست خواردووەکە بزر دەبێ و نامێنێ، لەکاتێکدا کە ئەو بە پەنهانی لە پشت ئەو توێکڵە دەرەکییەی کە بەسەریدا سەپێنراوە ماوەتەوە، لێرەشدا شپینگلەر ئەم بارە بە پێکهاتنی درۆزنانەی شارستانیەت ناو دەبات، جگە لەمەش بارێکی دیکەش هەیە، ئەویش کاتێك کە شارستانیەتێکی ڕەسەن و زۆر بەهێز لە ئافراندن و داهێنانکاریدا دەگات بە شارستانیەتێك کە هێشتا لە قۆناغی سەرەتاییدایە وەکو هیندییە سوورەکان و شارستانیەتی مەکسیکی کە هزرو شارستانیەتی نوێ ی ڕۆژئاوا لەناوی برد.

هەروەها دەڵێت کە شارستانیەتی ئەورووپی قۆناغی ئافراندن و داهێنانکاری تێپەڕاندووەو بەرەو قۆناغی شارو سەرەرای گۆرانی فەلسەفە بۆ لایەنێکی زانستی گوزارشتکەر لەشار لە لەسەدەی هەژدە لەئەورووپا و بەمەش پیرێتی لێ ی دیاری داوەو گوزارشتی لە توندترین نائارامی لە ڕۆمانتیکیدا کردووە.

بەم شێوەیە شپینگلەری نووسەرو فەیلەسوفی ئەڵمانی ئەوەی لە ئەوروپا ڕوویدا لە کاولکاری لە جەنگی جیهانی یەکەمدا کاری تێکردبوو، و وای لێکرد بکەوێتە تێڕامان و توێژینەوەی مێژوو وەك کۆششێك بۆ دۆزینەوەی یاساکان و دانایی و پەندەکان بۆ ڕێ گرتن لەم کارەساتانە، بەڵام بابەتەکانی لەبارەی ڕووخانی شارستانیەتەوە نەخستە ڕوو، تێیدا تەنها پێشبینی ڕووخانی ڕۆژئاواو لەبەریەکهەڵوەشانەوەی شارستانیەتی ڕۆژئاوای کرد، شپینگلەر پلانەکەی یاخود تیۆرەکەی لەسەر ئەو بنەمایە داناوە کە شارستانیەت وەکو بوونەوەرێکی زیندووە واتە تێڕوانینی بۆ شارستانیەت تێڕوانینێکی ژینەگەیی بایەلۆژیانەیە، و لەم ڕووەوە خەڵکانێکی زۆرڕەخنەیان ئاراستەی کردووە بەوەی کە مرۆڤ بەدیهاتوویەکی موتەکامیلە و لەسروشت باشترە کە مرۆڤ هەڵدەستێ بە گۆڕینی، و ناکرێ لێکچوواندن لە نێوان مرۆڤی خاوەن هزرو دانایی و هۆش لەگەڵ سروشتدا بکرێت، شپینگلەر ئەمەی وا بەرپەرچ دایەوە بەوەی کە شارستانیەتەکان وەکو مرۆڤەکان، لەدایك دەبن و پێدەگەن پاشان دەمرن لە پاش قۆناغی لاوێتی و پیریی، لەم ڕووەوەش چواندوویەتی بە چوار وەرزەکە، بەهار (لەدایك بوون)، هاوین (بەهێزی)، پایز (پێگەیشتن)، زستان (سڕی و بێ هۆشی) واتە کۆتایی و مردن.

شپینگلەر پێ داگیری لەسەر وتەیەکی بەناوبانگ دەکات ئەویش (یەکێتی چارەنووس)ە واتە ئەمە بەبۆچوونی ئەو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەموو گەلێك لەگەلان داب ونەریت و ویستی تایبەت بە خۆی هەیە کە لە کەڵەکەبوونێکی ماوەیی دوورو درێژەوە هاتووە، بۆیە هەموو گەلێك ڕواڵەتێکی گشتی هەیە کە پێی دەناسرێتەوە، کە بەشێوەیەکی بۆماوەیی لە نێو نەوەکانیدا دەمێنێتەوە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار .

هاوکات ئەو گەلانەی کە سیفەتێکی دیاریکراویان هەیە بەردەوام پارێزگاری لێ دەکەن لەگەڵ تێپەڕینی مەترسیەکاندا، ئەوانە کارلێك دەکەن و لەوانی دیکە شت وەرناگرن، بەڵکو داهێنانکاری دەکەن و ئەو داهێنانەش لە نەتەوەکانی دیکەوە بۆی نەهاتووە بەڵکو گەل خۆی دای دەهێنێ.

شپینگلەر ئەوەی دووپات کردەوە کە گەلان یان گەل لەنێو بابەتی پێکهاتنی شارستانیانەی درۆزن و نابووتدا داهێنانی هەیە، لێرەشدا شپینگلەر مەبەستی ئەوەیە کاتێك شارستانیەتێك زاڵ دەبێت بەسەر شارستانیەتێکی دیکەدا، ئەوا شارستانیەتی زاڵ خۆی هەژموون دەکات بەسەر شارستانیەتی شکستخواردوودا، و گوێڕایەڵی بۆ هێزی زاڵبوو دەست پێ دەکات، لێرەشدا مەبەستی لەوەیە کە زاڵبوو خاوەنی شارستانیەتێکی بەهێزترە، و بۆچوونەکانی بۆ خەڵکی دەخاتە ڕوو، سەرباری ئەوەی کە زاڵبووە بەلام ئەوەی پێکی دێنێ لەو توێکڵە دەچێت کە دەوری شارستانیەتە شکستخواردووەکەدایە.

دکتۆر ئەحمەد مەحمود سوبحی تێبینی ئەوەی کردووە کە ئەو ڕەخنانەی کە ڕووبەڕووی شپینگلەر کراوەتەوە لەسەر چەند بنەمایەك دامەزراوە کە بریتییە لەوەی کە شارستانیەتی ڕۆژئاوایی بەبنەمای پێشکەوتنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی ئەژمار کردووە، و کاتێکیش ڕۆژئاوا دەڕوخێت واتە جیهان و شارستانیەتی جیهانییش دەڕوخێت کە بێگومان ئەمەش هەڵەیە.

هەروەها بابەتی کارلێککردنی لەگەڵ گەلاندا وەلاناوە، و پێی وایە کە شارستانیەت لەگەڵ هەموو کارەساتەکاندا بە خوودی خۆی داهێنان دەکات، کە ئەمەش هەڵەیە چونکە گەلان لەگەڵ یەکتردا هاوکاری دەکەن، و کۆشەگیر

نابن بەسەر خۆیاندا، هەندێکیش پێیان وایە کە کە شپینگلەر بەمە ڕێ ی خشکردووە بۆ دروست بوونی نازیزم و فاشیزم، هەروەها گەلی ئەڵمانیشی بەیەکەیەکی تایبەت داناوە کە داهێنانی کردووەو پێش گەلانی دیکە کەوتووە، و باوەڕی وابوو کە ستەمکاری ڕۆژئاواو لەبەریەکهەڵوەشانەوەی هاوکاتە لەگەڵ باڵابوونی فاکتەری مادیی بەسەر فاکتەری ڕۆحیدا، وە زانست و خواوەند بە بیروڕای ئەو ڕێگرن لەبەردەم ونجڕکردنی یەکێتی ڕۆحی مرۆڤەکان، لێرەشدا شپینگلەر دەیەوێ بڵێت کە خواوەند تەنها ڕێنوێن بووە بۆ کاولکاری، لەلایەکی دیکەوە شپینگلەر لایەنێکی وەکو کاولکاری ئەورووپی کە لەئەنجامی ململانێی چیانیەتی و ئابووری و داگیرکاری هاتە ئاراوە لەبیرکردووە، چەنکە دەوڵەتە ئەورووپیەکان لە پێناو ڕکابەری و دەست گرتن بەسەر گەلانی تردا جەنگاون، وە بۆ ئەو شیاوتر بوو کە دیاردەی داگیرکاری شی بکاتەوە لەجیاتی ڕووخانی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی .

پاشان شپینگلەر هەوڵی داوە شارستانیەت وا بنوێنێ کە بوونەوەرێکی زیندووەو ڕاڤەی ڕەوتی مێژووی ڕاڤەیەکی بایەلۆژیانە کردووە، و جگە لەمەش بۆچوونەکانی نابن بە شیکارێکی ژیرانەی زانستی یاخود بڕیارە باڵاکان، و کە بە بۆچوونی ئەو ئەمە میتۆدێکی زانستییە، و توێژینەوەشی بۆ مێژوو بەوە جیادەکرێتەوە کە مۆرکێکی شیعریی هەیەو بڕیارەکانیشی پوخت و گشتگیرن.

چوارەم/ تۆینبی :

مێژوونووسی ناسراوی ئینگلیزی ئارنۆڵد تۆینبی (١٨٨٩-١٩٧٦)، کە یۆنانی و لاتینی خوێندووەو، چەند کتێبێکی داناوە کە گرنگترینیان "

توێژینــەوە لــە مێــژوو" کــە کــە لــەدوو تــوێیی دە بەرگــدا داینــاوە،و "شارســتانییەتی هێلینــی" و " گێڕانــەوەکانی شارســتانییەت" و " جــەنگ و شارستانییەت" و " ئەمریکاو شۆرشی جیهانیی" و "شۆرشی پیشەسازی" و زانست و عەرەب " .

تیۆرەکەی تۆینبی بەیەکێك لە گرنگترین تیۆرەکانی فەلسەفەی مێژوو هەژمار دەکرێت، لەبەر ئەوەی تۆینبی خۆی مێژوونووسێکی هاوچەرخەو لەژیانی خۆیدا کێشە جیهانییەکانی بینیوە، و بەدرێژایی ماوەی نیو سەدە سەرقاڵی توێژینەوەی شارستانیەتەکان بووە، و لەم ڕووەوە لە هاتووچۆو گەشتەکانیدا لە گەڕاندا بووە، و هەستاوە بە هەڵسەنگاندنی سەرجەم شارســتانیەتەکان بــەبێ چــاکتر زانیینــی شارســتانییەتی ڕۆژئــاوایی، و لەتوێژینــەوە مێژووییەکەیشیدا نەتەوەپەرستی وەلاناوە، و لە تیۆری " بەرەنگاری و وەڵامدانەوە" هەر ئەمە هاتووە. کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە فاکتەری ژینگە بە تەنیا نابێتە فاکتەرێکی ئەرێنی لە بێدارکردنەوەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی و شارستانیەتەکانیش دەرئەنجامی نەژادی ڕەگەزی یان لە دەرئــەنجامی فاکتــەرە جوگرافییەکانــەوە ســەرهەڵنادەن. بــەڵکو شارستانیەتەکان لە زەمینە ڕوتەنییەکاندا سەریان هەڵداوە، لەبەر ئەوە هەل و مەرجە سروشتییە دژوارەکانە کە ئەزنەك بەمرۆڤ دەدەن بەزەو شارستانی بوون، هەل و مەرجە دژوارەکانیش لە ژینگە سروشتی و هەل و مەرجە مرۆییەکاندا خۆی دەنوێنێ کە هەردووکیان دوو بەرەنگارین کە مرۆڤ دەوروژێنن، وە بەرەنگاری کردنی نێوەندی مرۆیی کە لەهێرش و پەلاماری

دەرەکی لە دەوڵەتێکی دراوسێ یان گروپێکدا خۆی دەنوێنێ، دواتر ئەم پەلامارە داگیرکاری لێ پەیدا دەبێ کە دەبێتە هاندەر بۆ سەرهەڵدانی شارستانیەت، وەڵامدانەوەش لە میانەی وەدەرنانی داگیرکەرو داگیرکەران و خۆ دەربازکردن لە هێزی فشار هێن و تۆڵەسەندنەوە لێیان و سزادانیان دەبێت .

لێرەدا پرسیارێك دەخەینە ڕوو ئایا بۆ هەموو بەرەنگارییەك وەڵامدانەوە هەیە؟

لە راستیدا سێ جۆر یاخود شێوە لە پەیوەندی وەڵامدانەوە بە بەرەنگارییەوە هەیە، یەکەم کەم خایاندنی بەرەنگاری لایەنی بەرامبەر وا لێ دەکات کە بەتەواوی دەستەوسان بێت لە وەڵامدانەوەیەکی سەرکەوتووانە، و دووەمیش یان ئەوەتا بەرەنگارییەکە ئەوەندە توندو بەهێزە کە ڕۆحی لایەنی بەرامبەر تێك دەشکێنێ، سێیەمیشیان ئەوەیە کە بەرەنگارییەکە دەگاتە ئاستێکی شیاو و لەبار کە ووزەو توانا داهێنانکارییەکان دەوروژێنێت کە ئەمەش تەنها وەڵامدانەوەی سەرکەوتووە. کەواتە ئەی بۆچی شارستانییەت دەڕوخێ یاخو هەرەس دەهێنێ هەر وەك تۆینبی دەپرسێت؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە کەمینەی فەرمانڕەوا ووزەو توانا داهێنانکارییەکان لەدەست دەدەن، هەروەها دەڵێت هەرەس هێنانی ئەو کۆمەڵگەیە بەم شێوەیە دەبێت:

١- کەمینەیەکی خۆسەپێن کە توانای داهێنانی نەماوە ئیدی بەزەبری هێزو زۆرداری فەرمانڕەوایی دەکات.

٢- پرۆلیتاریایەکی ناوەخۆ کە زەبوون و یاخییە لە چاوەڕێ ی هەلێکدایە لەپێناو شۆڕش کردن .

٣- پرۆلیتاریایەکی دەرەکی کە لە کۆمەلگە جودا بووەتەوەو بەرهەلستی تێکەلبوونی دەکات، و چاوەڕێ ی هەلێکە بۆ داگیرکاری.

تیۆری " بەرەنگاری و وەلامدانەوە" پشت بە بەردەوامی بەرەنگاری و دووبارەبوونەوەی لەسەر شارستانیەتێك لە شارستانیەتەکان دەبەستێت، کە بەداگیرکارییەکی قولّ و درێژ خایەنی ئەو شارستانیەتە کۆتایی دێت گەر بێت و سەرکەوتوو نەبێت لە هێنانە ئارای وەلامەکان کە دەیخاتە ڕوو لەهەمبەر ئەو شارستانیەتانە. بەلام گەر بێت و ئەو شارستانیەتانە لە توانایاندا بێت کە وەلامی ئەو بەرەنگاریانە بدەنەوە ئەوا شارستانییەت بەرەو پێشەوە دەڕوات بە شێوەیەکی شارستانی، هەروەها تۆینبی پێداگیری لەسەر فاکتەرێکی بنەڕەتی لە هەرەسهێنانی شارستانیەتەکاندا دەکاتەوە کە بریتییە لە فاکتەری دابەشبوون یاخود کەرت بوون کە لە جەستەی کۆمەلگەدا ڕوودەدات، لێرەشدا دوو جۆر لە دابەشبوون هەیە، دابەشبوونی ستوونی کە لە نێوان ئەو گروپە مرۆییانەدایە کە لە ڕووی جوگرافییەوە ڕێك و گونجاون، دابەشبوونی ئاسۆیی کە لە نێوان ئەو کۆمەلگانەدا دەبێت کە لەڕووی جوگرافییەوە ئاوێتەبوون ، لەهەمان کاتیشدا گۆشەگیرو لێکدابڕاوون لەڕووی جوگرافییەوە.

تــۆینبی وای دەبێنــێ کــە دابەشــبوونی ســتوونی ڕێ خۆشــکەرە بــۆ هەرەســهێنانی شارســتانییەت، کــە مەبەســت لێ ی ئــەو تــەنگ و چــەڵەمە گەورانەیــە کــە کۆمــەڵگاکان بەخۆیانــەوە بینیویانــە کــە بــە هەڵوەشــانەوەی کۆمەڵگەو شارستانیەتەکەی بە کۆتا گەیووە.

هەروەها دابەشبوونە ئاسۆییەکانی وەکو شارستانییەتی هێلینیی کە لەم ڕووەوە هــەل و مــەرجی کــەرتبوونی جەســتەی کۆمەڵگــە ڕوودەدات، و بەدامەزراندنی دەوڵەتێکی دنیایی و ڕژمێکی ئایینی توندو تیژ کۆتـایی دێـت، لەگەڵ بوونی دەرهاویشتە بەربەرییەکان لە جەستەی کۆمەڵگەدا هـەروەکو لـە هەرەسهێنانی شارستانیەتە کۆنەکندا ڕوویدا.

بیرمەنـدی عێـراقیش " محێـدین ئیسماعیل" لـە کتێبەکەیدا "تـۆینبی و میتـۆدی مێـژوو فەلـسەفەی مێـژوو" دەڵێـت: تـۆینبی کاریگـەر بـووە بـە فەیلەسوفی ئەڵمانی شپینگلەر، بەڵام جیاوازی هەبووە لەگەڵیدا لەبەر ئەوەی تــۆینبی لــە بیــست و یــەك شارســتانییەتی جیهــانی* کۆڵیوەتــەوە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاریانـەی شـیاکارییانە، هەوڵیـشی داوە کـە چـەند یاسایەك هەڵێنجێنێ بۆ ڕێکخستن و ڕێککردنی بزاوتی مێژوویی کە لە دووتوێی چەند بەشێکی کتێبەکەیدا " توێژینەوە لە مێژوودا" کۆی کردەوەو دەیویست لە بۆچوونەکانیدا ئەوە ڕەت بکاتەوە کە ژینگە بەتـەنیا کاریگـەری هەیـە لـە سەرهەڵدانی گەلان و ڕوخانیان و هـەموو گـەلێکیش شـێوازێکی تایبەتمەنـدی خۆی هەیە، بەلام بۆچی ئەو شارستانیەتەی کە پێکی دەهێنێ دەڕوخێت؟

ئەمــەش تــۆینبی هانــدا کــە توێژینەوەیــەکی قــوڵی مێــژوو بکــات بــە پێچەوانەی شپینگلەرو ڤیکۆ، و پشتگیری لـە تیـۆری بایـەلۆژی نـەدەکرد، و ئـەوەی ورووژانـد کـە شارسـتانیەت سـەرهەڵدەدات و پـێش دەکـەوێت پاشـان دەڕوخێت لە ئـەنجامی بەرەنگارییەکانـدا، و دەری خـست کـە ژینگـەی دژوار پاڵنەرە بۆ بنیات نانی شارستانیەت بە پێچەوانەی شپینگلەرو ڤیکۆ، بەمەش تیۆرێکی بۆ ڕاڤەکردنی شارستانیەتەکان دۆزیەوە کە بە تیۆری " بـەرەنگاری و وەڵامدانەوە" ناوزەدکرا، و پێی وابوو کە شارستانیەت دادەمەزرێ و گەشە دەکات بەهۆی دەرکەوتنی شارستانییەتی گەلێك کە پێی ڕووبەرووی گەلێکی دیکە دەبێتەوە جا سەرکەتوو بێت یان شکستخواردوو.

لەم بارەوە تۆینبی لە بیست و یەك شارستانییەتی تۆژیوەتەوەو ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە ئەو شارسـتانیەتانەی کـە ماونەتـەوە تـەنها بـریتین لـە پێنج شارستانیەت** و ئەوانی دیکـە لـەناو چـوون، و هۆکـاری ئەمـەش واتـە سەرهەڵدان و ڕووخانی شارستانیەتەکان بۆ چەند فاکتەرێك دەگەڕێتەوە، لەم ڕووەوە بـاوەڕی وایـە کـە سـەرهەڵدانی شارسـتانیەت ناگەڕێتـەوە بـۆ ژینگـە بەڵکو چەند فاکتەرێك هەن بۆ بنیاتنانی شارستانیەت لەوانە فاکتەری ئایینی، ئەمــەش بــە گــوێرەی ئــەو بەرەنگارییــەی کــە ڕووبــەڕووی شارســتانیەتەکە دەبێتــەوە، زۆر جـاریش شارسـتانیەتەکان لـە ناوچـە بیابانەکانـدا سـەریان هەڵداوە نەك لـە ڕۆخـی ڕوبارەکانـدا، ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ شـێوەی ئـەو بەرەنگارییــەی کــە شارســتانیەتەکە ڕووبــەڕووی دەبێتەوە،گــەر بێتــو

بەرەنگاریەکــە بــەهێز بێـت و وەڵامدانــەوەی لێ دروســت نــەبێت ئــەوا شارستانیەتەکە لەناو دەچێ، وە ئەگەر بەرەنگارییەکە هاوسەنگ بوو لەگـەڵ وەلامدانەوەکەدا ئەوا شارسـتانیەتەکە دەمێنێتـەوەو لەشـوێنی خۆیـدا نـۆرە دەکات، بـەلام گـەر بێتـو بەرەنگارییەکـە بەشـێوەیەك هـات کـە ووزەو توانـا داهێنانکاریەکانی هاندا لە لای گەلێك ئەوا ئـەوەی ڕوودەدات لـە وەڵامدانـەوە پێی دەوترێ وەڵامدانەوەی سەرکەوتوو.

لەلایـەکی تـرەوە هۆکارەکـانی ڕووخـانی شارسـتانییەت دەگەڕێتـەوە بـۆ چەند فاکتەرێك، یەکەم کەم وکورتی و لاوازی لە توانـاو ووزەی دەستەبژێری دیاریکراو لە فەیلەسوفان و زانایان و سیاسەتمەداران، ئـەو وای دەبینـێ کـە دەستەبژێر لە بنیاتنانی شارستانیەتدا لە سەرەتادا ووزەیەکی داهێنانکارییـە بـەڵام دواتـر توانـای داهێنـانی نـامێنێ، و دوای ئـەوە لەبەرچـاوی جـەماوەدا زەبوون دەبن لە بەخشینی داهێنانکاریی نوێ بۆ گەل و لەم بارەشدا کەمینە دەگاتە ئاستی نەزۆکی و ئیـدی بـەرەنگاریی بـۆ دێـت، ئەمـەش یـان لەلایـەن داگیرکــەرێکی بیــانی کــە دەســت بەســەر شارســتانیەتەکەدا دەگرێــت و دەیروخێنێ، یاخود گـەل هـەل بەدەسـت دێنـێ بـۆ ڕووخانـدنی ئـەم کەمینـە نەزۆکەیە، یان فەرمانبەرداری کـردن لەمەبەسـتەکانی پرۆلیتاریـا*** کـە دوو جۆرە، یەکەم ناوەخۆیی کە بریتییە لەگـەل، ئـەوی تریـشیان دەرەکییـە کـە بریتییە لەچەند توێژو چینێکی کۆمەڵایەتی کە لەشەقڵ و ڕوخـساری سیاسـی وڵاتەکەیان جودا بوونەتەوە، و کەسێك یاخود چەند کەسێك لێیان پرۆلیتاریـا

ئاراستە دەکەن بۆ داگیرکردنی شارستانیەتێکی تر، لێرەدا ئەمەش هاوشێوەی ئەو بابەتانەیە کە ئیبن خەلدون باسی کردوون.

هۆکاری دووەمیش بریتییە لە ڕوخانی شارستانییەت لەو کاتەی کە خودی ئەو شارستانیەتە هەر لە سەرەهەڵدانییەوە هەڵگری تۆوی ڕوخاندنییەتی، بەڕای تۆینبی ئەم قۆناغە سەرەتای لاوازبوونی ئەو شارستانیەتەیە، و پێی وایە کە دەستەبژێری فەرمانڕەوا گەل بەرەو فتوحات و پێکهێنانی ئیمپراتۆریەتەکان دەبات لەپێناو خۆ دەربازکردن لەو کێشانەی ڕووی لێ کردووە، وە هەموو ئیمپراتۆریەتێکیش هەر لەسەرەتاوە تۆوی ڕوخانی هەڵگرتووە واتا قۆناغی ئیمپراتۆریەت قۆناغی دەستپێکی ڕوخان و لێکهەڵوەشانەوەیەتی، و ئاماژە بەوەش دەکات کە پێکهاتنی ئیمپراتۆریەتەکان لە کەمینەکان ڕێ کردنە بۆ جەنگ و شۆرشەکان و یاخی بوونەکان، ئەمەش دەبێتە مایەی لاوازی و ڕوخان، وەکو ئیمپراتۆریەتی ئاشوری و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی.

هۆکاری سێیەمیش کە تۆینبی باسی کردووە بریتییە لە فاکتەری ڕۆحی و ئایینی، چونکە گەر شارستانیەتێك بیەوێت خۆی لە ڕووخان و تیاچوون بپارێزێت ئەوا لەسەریەتی کە وەڵامدانەوەیەکی سەرکەوتووانە لە بەرامبەر ئەو بەرەنگارییەدا بهێنێتەدی، ئەم فاکتەرەش کاتێك پشتی پێ دەبەسترێ کە بەهێزی و یەکانگیریی بێنێتە ئاراوە، لەم بارەشدا وەڵامدانەوەکە بەردەوام

دەمێنێتەوە، واتە دەست گرتن بەبەها ڕۆحییەکان وا لەشارستانییەت دەکات یەکانگیر بێت.

فاکتەری چوارەمیش بریتییە لە ئامادەگی ئەو هەولانەی کە هەندێك لە شارستانییەتەکان لەپێناو وەلامدانەوەیەکی سەرکەوتوودا یاخود بۆ هەڵنان و خۆپارێزی لەبەرامبەر بەرەنگارییدا پێی هەڵدەستن، بۆ ئەمەش دوو ڕێگە هەڵدەبژێرێت، یەکەمیان پاشگەزبوونەوەو گەڕانەوەیە بەرەو رابردوو، دووەمیشیان ڕووکردن بەرەو داهاتوو، و ئەم کارەش بە گرتنەبەری وەلامدانەوەیەکی سەرکەوتوو دەبێت کە کەسێکی بلیمەت و داهێنەر و دڵسۆزی کۆمەلگە ڕێبەری بکات.

**پێنجەم/ عەلی وەردی :**

لەکۆتایی ئەم بابەتەی فەلسەفەی مێژوودا پێویستە هەڵوەستەیەك لەسەر کۆمەڵناسی عەرەبی ناودار و هاوچەرخ دکتۆر عەلی وەردی بکەم، کە بەتایبەتی لە " کۆمەلگەی عێراقی تۆژیوەتەوە" و گریمانەکانی کە خستوونیەتە ڕوو تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەیە لەگەڵ ئەوەندەی کە توانراوە بخرێتە ڕوو لەسەر کۆمەلگەی عەرەبی لەهەموو هزرە عەرەبییەکاندا، لەم ڕووەوە وەردی بەڕۆحێکی ڕەخنەگرانەوە بڕیارەکانی بوێرانە خستووەتە ڕوو لەدەست نیشانکردنی پێکهاتەی کۆمەلگەو خستنەڕووی میراتی شارستانی، و لە ڕواڵەت و نەخۆشییە کۆمەلایەتیەکانی تۆژیوەتەوەو بە "ڕەخنەگرێکی ڕۆشنبیر" دەناسرێت، لەم بارەوە ئاماژە بۆ ئەوەدەکات کە پاش ئەوەی

کۆمەڵناسی خوێندووە زۆر کاریگەر بووە بە ئیبن خەلدون کە بەدامەزرێنەری ڕاستیی کۆمەڵناسی دادەنرێت، و هەستی بەلێپرسراوی بەرامبەر بە تیۆرەکەی ئیبن خەلدون کردووەو، تەوەری بیرۆکەکەیشی بریتییە لە ململانێ لەنێوان دەوارنشینیی و شارستانییەتدا کە لەهیچ کۆمەڵگەیەکدا بەئەندازەی کۆمەڵگەی عەرەبی دەرنەکەوتووە، لێرەدا وەردی ڕەخنە لە هەندێك لە بەها خێڵەکییە عەرەبییەکان دەگرێ، کە لەڕیشەی دەوارنشینییەوە دێت و دەبنە باو، هەر وەك ئیبن خەلدون ڕوونی کردووەتەوە و هەروەها ڕێ کردن لە ڕێگەی شارستانیەتی نوێوە وا دەخوازێت ئەم پاشماوانە کە ڕێ گرن لە پێشکەوتندا کۆتاییان پێ بهێنرێت.

وەردی پێی وایە کە شارستانیەت لەسەر بنەمای دەسەڵاتی ناوەندی بەهێز کە توانای پاراستنی گیانی خەڵکی هەبێت دادەمەزرێ، و کاتێکیش شکست دێنێ لە بەدی هێنانی ئەم ئامانجەدا ئەوا خەڵکی ڕوودەکەنە بەها خێڵەکیەکان لە پێناو پاراستنی خۆیان و سامانیان، هەر وەك ئەمەش لەدوای ڕووخانی بەغدا لەسەردەمی دەوڵەتی عەبباسی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز) ڕوویدا، و وەردی پێی وایە کە هزری مرۆڤایەتی بەدرێژایی مێژووی خۆی بە سێ قۆناغدا گوزەری کردووە، قۆناغی ناژیریی، قۆناغی ژیریی، و قۆناغی زانستی. و دەڵێ ئەو شۆڕشە هزرییەی کە گریکەکان پێی هەستان سەرەتای قۆناغی ژیرێتییە لە مێژووی مرۆڤایەتییدا، و خەڵکانی پێش ئەوان لە قۆناغی ناژیرییدا ژیاون و ئەفسانەکان و شتە پڕوپوچەکان و نادیارەکان لە نێویاندا باوو بووە، پاشان

فەیلەسوفەکانی گریکی دەرکەوتن بە شۆرشەکەیانەوە کە تیایدا بانگەشەیان بۆ پشت بەستن بە ژیری و لۆژیك دەکرد، کە لە نێو گەلە جیاوازەکاندا دەستەبژێرێك لە بیرمەندەکان ئەمەیان پەیڕەویی کرد، و شۆرشی گریکەکان لەسەر بنەمای متمانەی ڕەها بە ژیری و پشت بەستن پێی ی لە لێکۆڵینەوەو وتوووێژدا سەری هەڵداوە، و ئەم شۆرشە لە قۆناغی زانستیدا کە شارستانیەتی نوێ هێناویەتە ئاراوە شۆرشە بەسەر قۆناغی ژیرێتی پێشتر هەر وەك چۆن قۆناغی ژیریی شۆرش بوو بەسەر قۆتاغی ناژیرییدا، لەبەر ئەوە هەموو قۆناغێك لە کات و ساتی خۆیدا رۆڵ و بایەخی خۆی هەیە، بۆیە زۆرێك لە زانست خوازان کاتێك لەسەر شێوازی ژیریی بیردەکەنەوە وا خۆیان لەقەڵەم دەدەن کە زانستیانەن.

وەردی لە کۆتایی تیۆرەکەیدا لەسەر " ژیریی مرۆیی" دەڵێ: ئێمە ئەمرۆ لە قۆناغی زانستییدا دەژین و ئیدی سەردەم لە قۆناغی نا ژیریی پێش خۆی تێپەڕیوەو لەسەرمان پێویستە کە لەمە تێ بگەین بەر لەوەی کار لەکار بترازێ.

---

* کە بریتین لە : شارستانیەتی میسری – سۆمەری– بابلی– ئاشوری – حیسی– سریانی– مەینەوی– هێلینی– ئێرانی– عەرەبی– هیندۆکی– بوزی هیندی– چینی– رۆژهەڵاتی دوور (کۆری – یابانی)– ئەندیانی– یۆنانیفی–

مابـانی- مەکـسیکی- ئەرسەدۆکـسی بێزەنتـی- ئەرسەدۆکـسی ڕوسـی- شارستانیەتی ڕۆژئاوایی .

** ئـەم پێـنج شارسـتانیەتەش بـریتین لـە : ١- شارسـتانییەتی مەسـیحی ڕۆژئـاوایی (ئـەوروپا و ئـەمریکا). ٢- شارسـتانییەتی مەسـیحی ڕۆژهـەڵاتی "ئەرسەدۆکسی" (ڕوسیاو وڵاتانی بالکان). ٣- شارستانییەتی ئیسلامی. ٤- شارسـتانییەتی هینـدی (هینـدۆکی و بـوزی و هینایانـا). ٥- شارسـتانییەتی ڕۆژهەڵاتی دوور یاخود بوزیەتی ماهایانا .

*** چـەمکی پرۆلیتاریـا لـەلای تـۆینبی واتـا ڕەمـەکی خـەڵکی لـە بەرامبـەر کەمینەیـەکی فـەرمانڕەوا چ داهێنانکـار یـان خـۆ سـەپێن بێـت، لێـرەدا ڕووبەڕووبونـەوەی پرۆلیتاریـا بـۆ کەمینـە وەك ڕووبەڕووبونـەوەی پرۆلیتاریـا نییە بـۆ سـەرمارییەدارەکان لـە لای مـارکس لەسـەر بنـەمای خاوەنـداریتی ، بـەڵکو لەسـەر بنـەمای جیامەنـدیی ڕۆحـی و هـزری کەلـەباری کەمینـەی خۆسەپێندا مۆرکی جیامەندی کۆمەڵایەتی هەیە.

سەرچاوە: المدخل الى فلسفة التاريخ، د.مفيد كاحد الزيدي، الطبعـة الاولى،دار المناهج للنشر والتوزيع، (عمان-الاردن)، ٢٠٠٦م.

# محمد فريد ابوحديد
# ١ يوليو ١٨٩٣- ١٨مايو ١٩٦٧

نووسەرو شاعیرو مێژوونووسە. لە قاهیرە لەدایك بووە، لە (دمنهور) پەروەردەکراوەو خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە، چووەتە قوتابخانەی (العباسیە)ی سانەوی لە (اسکندریە)، ئینجا چووەتە قوتابخانەی بالاّی مامۆستایان لە قاهیرە، لەساڵی ١٩١٤ دبلۆمی ئەدەبیات و پەروەردەی وەرگرتووە. وە لەهەمان ساڵدابووە بەئەندام لە (لێژنەی دانان و وەرگێڕان و بڵاوکردنەوە) کە (احمد امین) دایمەزراندبوو، وتاری دەربارەی شیعری ئازادی بێ قافیە بۆ رۆژنامەی (السفور) نووسیبوو و هەروەها بۆ رۆژنامەی (السیاسة الاسبوعیة) و (الهلال)ی نووسی بوو. لەساڵی ١٩٤٢ کاتێك کاری وانە وتنەوەی ئەنجام دەدا بڕوانامەی لیسانسی لە قانون وەرگرتبوو. و لەساڵی ١٩٣٧ ئەندامێکی دامەزرێنەری کۆمەڵەی زانستە کۆمەلاّیەتیەکانی میسری بوو. لەو کاتەدا چووەتە سلکی سڤیلی لەساڵی ١٩٤٢ بووە بە سکرتێری زانکۆی ئەسکەندەریە (فاروق) و لەساڵی ١٩٤٣ بووە بەو وەکیلی خانەی کتێب، و لەساڵی ١٩٤٥ بووە بەراگری کۆلێجی بالاّی مامۆستایان، لەساڵی ١٩٤٧ بووە بە بەڕێوەبەری فەرمانگەی کاروباری رۆشنبیری، لە کۆتایشدا لە ساڵی ١٩٦٣ بوو بە بریکاری وەزارەتی مەعارف. کاتێك لەساڵی ١٩٦٣ گۆڤاری (الثقافة) زیندوو کرایەوە ماوەیەکی کورت بووە بە سەرنووسەری گۆڤارەکە. هەروەها

وەکو راوێژکاری وەزارەتی خوێندنی لیبی کاری کردووە. (ابو حدید) رۆمانی مێژوویی نووسیوە لە بەناوبانگترینیان (عنترەی کوری شداد) و رۆمانی بەناوبانگتریش وەکو (جحا) پاڵەوانی میللی عەرەبی. لەساڵی ١٩٤٦ بووە بە ئەندامی (کۆڕی زانیاری عەرەبی)، و لەساڵانی ١٩٥٩ و ١٩٦٤ خەڵاتی دەوڵەتی لە بواری ئەدەب پێدراوە، لەساڵی ١٩٦٥ بووە بە ئەندامی ئەنجوومەنی باڵای هونەرەکان و ئەدەبیات و زانستە کۆمەڵایەتیەکان. ساڵی ١٩٦٧ لەناکاو لە قاهیرە مردووە .

سەرچاوە:

آرثر جولد شمیت" الابن" قاموس تراجم مصر الحدیثة، ترجمة وتحقیق: عبدالوهاب بکر.

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی : د.محمد عبدالله کاکەسوور .

# جەمالەدینی ئەفغانی
# ئەو فەیلەسوفەی بەرەنگاری پاشاکان بووەوە

سلیمان مظهر
وەرگێڕانی: زێوەر ئەنوەر

ڕقی لە دوو شت بوو... داگیرکاری وستەمکاری، بۆ هەرکوێ بچووبا، ئینگلیز بەدوایەوە بوون، لە میسر، لە ئێران، لە هندستان، بەڵام کاتێک بۆ ئینگلتەرا دەچوو، پێشوازییان لێدەکرد!، هەروەها سەردانی ئەڵمانیا و پترسبۆرگی کرد و چاوی بە قەیسەر کەوت، گفتوگۆیەکی سەرزارەکی لەگەڵ کرد، بووە هۆی دەرکردنی لە ڕووسیا.

مێژوونووسان دەڵێن، کاتێك شای ئێران هەراسان بوو، پێشنیازی بوونی بە سەرۆك وەزیران لێکرد، بەڵام ئەو شۆڕشگێڕەی خەباتی بۆ گشت خەڵکی هیندستان و میسر و ئێران و تورکیا بوو، نەیویست ڕێکەوتن لەگەڵ پاشایەکی ستەمکار ئەنجام بدا، گەلەکەی دەچەوسێنێتەوە، بەڵکو بانگی بۆ شۆڕشێك دەکرد، دژی هەموو ستەمکارێك چ ئێرانی بێت یان میسری.

جارێکیان لەو کاتەی لە هیندستان گەڕایەوە، لێیان پرسی: بارودۆخی موسوڵمانان لە هیندستان چۆنە؟ گووتی: دەربارەی ئاینەکەیان هیچ شتێك

نازانن، تەنیا دەڵێن سوپاس بۆ خودا، ئێمە گۆشتی مانگا دەخۆین!، واتە ئێمە موسوڵمانین مانگا پیرۆز راناگرین.

ئەلئەفغانی لە قسەکانی بەردەوام بوو، دەربارەی مێژووی داگیرکاری هیندستان و گووتی:

– ئینگلیز زانیان لێرەدا موسوڵمان لە هەموویان ترسناکترن، چونکە ئاینی ئیسلام داوا لە پەیڕەوکارانی ئەکات، خاوەن دەسەڵات بن بۆ ئەم مەبەستە، هەوڵیاندا بیروباوەڕ لە دڵی چەندین ملیۆن موسوڵمانی ئەم وڵاتە لاواز بکەن، دەوڵەمەند و کوڕە میهراجاو میرو شازادەکانیان کۆکردەوە وکۆمەڵەیەکیان بۆ دامەزراندن بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێبازی (التبشیریة)، ئەم ڕەوتە بریتی یە لە سڕینەوەی گشت ئاینەکان و گومان دروست کردن بۆ ڕاستی پێغەمبەران و گشت بیروباوەڕێك، بەم ڕێگایە وەی تریش، ئینگلیز توانیان دەست بەسەر هیندستاندا بگرن و داگیری بکەن.

(لە ململانێدا لەگەڵ ئیمپریالیزم لە میسر و هیندستان و تورکیا، توانی دەیەها ئازادیخواز لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە. قسەی ڕواڵەتی و شیرینی بەرامبەر خەڵك نەدەکرد، لەسەر حسابی ماف وئازادییان، بە ئاشکرا و ڕوون قسەی دەکرد، ستایش و پیاهەڵدانی بەرامبەر کەس نەدەکرد. دە ساڵ لە میسر مایەوە، تیایدا ئاریشەی لەنێوان زانایانی ئەزهەر دروست کرد، پێی ڕاگەیاندن ئاین فەرمانی خۆبەدەستەوەدان و ڕازیبوون و سەرشۆڕی تیا نیە، وەکو موسوڵمانی هیند مەبن.)

کاتێك قسەی بۆ قوتابیان دەکرد، وەکو شێرێکی خرۆشاوی ئامادە بۆ هێرش بوو، دەربارەی ئازادی و فیداکاری و خۆنەویستی و خۆبەخت کردن،

هەموویان باوەڕیان بە قسەکانی دەکر، چونکە هەرگیز درۆی نەکردووە و بۆ کەسیش کاری نەکردووە.

لە تورکیا کاتێك باسی ستەمکاری و داگیرکردن و ناپاکی کرد، شێخی ئیسلام لە تورکیا (حەسەن فەهمی) لە ئەستانە چاوی بە ئەلئەفغانی کەوت، پێی گووت: "داوات لێدەکەم چیتر ووتار مەدە، وازبێنە لە یاخی کردنی خەڵك". بەڵام ئەو بۆ بەیانی لە (خانەی هونەرەکان) لەنێوان سەد کەس، باسی ئازادی و ئەدەب و مافی میللەتانی بۆ کردن، شێخ حەسەنە فەندی تورە بوو، بۆ پارێزگاری لە ئاسایشی نەتەوەیی، هەوڵی دەرکردنی دا، جەمالەدینیش بە توندی بەرپەرچی دایەوە، بەهۆی ووتار و ڕاو قسەکانی توانی هۆشیاری نەتەوەیی لە وولاتەکە دروست بکات.

مێژوونووسی ئینگلیز (بلنت) دەربارەی کودەتای عوسمانی دەڵێت "بەهۆی جەمالەدینەوە، عوسمانیەکان هوڵیان دا حکومەتەکەیان بکەنە حکومەتێکی خاوەن دەستوور چونکە هاندەریان بوو زۆریش لە پایتەختەکەیان مایەوە". بەشداری لە شۆڕشی گەلانی میسر کرد، خەباتی بەردەوام بوو لە پێناو ئازادی میللەتان، داوای حکومەتی یاسایی دەکرد.

ئینگلیز هانی دەسەلاتدارانی دەدا، بۆ ئازاردان و لەناوبردنی هەموو خاوەن قسەو ڕۆشنبیران. ووتاری درێژی دەنووسی دەربارەی ڕاو بۆچوونە سیاسیەکانی، (گلادستۆن) ناچاربوو وەڵامی بداتەوە. لەو سەردەمەدا خدێوی میسر دەیزانی میللەت رقی لێیەتی، بەڵام کاتێك هەستی کرد، جەمالەددین دژی خۆی و ئینگلیز خەڵك هاندەدا، فەرمانی دەرکرد لە میسر نەمێنێت، ڕۆیشت بۆ هیندستان، خەڵك هەمان گوزەرانیان هەیە، برسیەتی و ڕووت و پێ

خـواس، ئینگلیـز لـەوێش تـەنگیان پـێ هەڵـچنی، بـۆ ئێـران سـەفەری کـرد، دووبارە خەڵکی دژی شاه هاندەدا، ئەویش سەبری نەگرت، بێ گوێدانە ڕێـزی خەڵك بۆ ئەفغانی، پۆلیسی ناردە سەر و بە نوێنەوە تـا سـنووری تورکیایـان بـرد. سـوڵتانی عوسمـانی ڕوتبـەی (دادوەری سـوپا)ی پـێ بەخـشی بـۆ دەم کوتکردنی، کاتێك پیاوانی کۆشك ڕوتبە ونیشانە و جلەکەیان بۆ ماڵی ئەفغانی برد و ئاگاداریان کردەوە ئەم بەخششە بە فەرمانی سـوڵتانە، داوایـان لێکـرد لەگەڵ ئەم کڵاوە زێرییە بیپۆشێ، بەڵام ڕەتی کردەوە و گوتی: "بە سـوڵتان بڵێن پلەو پایەی زانست بـەرزترین پلەیـە، نـاتوانێ ببێتـە بـارگیرێکی جـوانی پلەپلە ڕەنگین".

کاتێك ئەم هەواڵە بە سوڵتان گەیـشت فـەرمانی دەرکرنـی لـە تورکیـا دا، بەم شێوەیە ئەفغانی بەردەوام ڕق و کینەی بۆ هەبوو، چـونکە داوای ئـازادی بۆ گشت خـەڵك دەکـرد. نیـشتمانی نـەبوو، کـەس وکـار و هاوسـەر و منـداڵی نەبوو، لەپێناو خەڵکی ژیا، بەلانەوازی لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا، لە ساڵی ١٨٨٧ لە ئەستانە کۆچی دوایی کرد.

ئینجا گوتیان ئێرانیە، دواتر ووتیـان ئەفغانیـە، بـەڵام هومموویـان لەسـەر ئەوە کۆکن مرۆڤێکە، بـاوەڕی وایـە، پێویـستە هـەموو مرۆڤێـك لەسـەر گـۆی زەوی بە ئازادی بژی.

سەرچاوە :

سليمان مظهر، كتاب العربي (منمنمات تأريخية)، الكويت، ٢٠٠١، ص١٦١– ١٦٣.

# هەڕەمەکان

لە ٤٥٠٠ ساڵەوە هەڕەمەکان بەسەر دۆڵی نیلدا زاڵن ئەو ئاپارتمانە عیملاقانە گۆڕی فیرعەونەکانیان پێکدەهێنا.

- سەردەمی زێڕینی هەڕەمەکان دەکەوێتە سەرەتای شارستانیەتی میسری، لەژێر سێبەری شانشینی کۆن (٢٦٥٠- ٢١٥٠پ.ن) جوانترینیان لە "منف"ی پایتەخت لە باکوری وولآت دروست کرا، لە شانشینی ناوەڕاست (٢٠٠٠ تاکو ١٦٥٠پ.ن)، هەندێ هەڕەم لە باشوری وولآت دروست کران، کە بە قەبارە بچووکتر و کەمتر گرنگیان پێدرابوو، ئەمەش لە نزیك "لیشت" پایتەختی نوێ. ئینجا هەموو شتێك وەستا. مێژووی هەرەمەکان تەنیا هەزار ساڵی خایاند.

- بۆچی هەموو هەڕەمەکان لە کەناری چەپی ڕووباری نیل دروست کران؟

لەبەرئەوەی ئەو لایەیە کە خۆر لێیەوە ئاوا دەبێت. سەبارەت بە میسرییەکان، کاتێك خۆر لە پشت ئاسۆ وون دەبێت، دەچێتە شانشینی مردووەکان. و کە فیرعەن لە ڕۆژئاوی نیل دەنێژرێت، بۆی ئاساندەبێت بەرەو جیهانی تاریکی بەدوای خۆر بکەوێت. و لای چەپی نیلیش گۆڕستان هەیە.

- بۆچی قەبارەی هەرەمەکان گەورەیە؟

لەئاینی کۆنی میسر، ژیانی هەتاهەتایی نەدەبوو ئەگەر لەدوای مردن لاشە بەشێوەیەکی باش نەپارێزرابایە. بۆیە وای لێهات پاراستی مۆمیای

فیرعەون تائەوپەڕی پێویست بێت، بە بڕێکی زۆر لە بەرد دادەپۆشرا. ئەهرامەکان مسۆگەرکەری مانەوەی فیرعەون بوون.

– بۆچی هەرەم شێوەیەکی جیاکەرەوەی هەیە؟

هێشتا زاناکانی‌شوێنەوار وەڵامی تەواویان دەست نەکەوتووە! ئەوەتا زۆربەیان پێیان وایە کەشێوەی هەرەم ئاماژەیە بۆ گۆشەی تیشکی خۆر کە دەکەوێتە سەرزەوی. فیرعەون کوڕی خودای خۆر بوو، بەسەر تیشکەکانی‌خۆر دەکەوت بۆئەوەی لە ئاسمان باوکی ببینێت. هەرەمیش وەکو سەکۆی دەرپەڕین وابوو!

– بۆچی هەرەمە یەکەمینەکان وەکو پێبلکە وابوون؟

بەهۆی ئەندازەکەی ئەو هەرەمە "پێبلکانە" لەچەند سکۆیەك پێکدێت کە یەك لەسەر ئەوی تر دادەنرێت، چەند پلەیەك پێکدەهێنن بەرەو ئاسمان، لەو ماوەیەدا، هێشتا پەرستنی خواوەندی خۆر لە گۆڕێدا نەبوو. خەڵك پێیان وابوو فیرعەون لەکاتی مردنی دەچێتە پاڵ بوونەوەرە نەمرەکان ئەوانیش ئەستێرەکانی باکورن بۆ ئەوەی ببێتە یەکێك لە ئەوان. هەرەم پێبلکەیەك بوو بەرەو ئاسمان.

– چۆن هەرەمەکان لووس بوون؟

بەهۆی فیرعەون "سنفرو" و ئەوەی لە ساڵی ٢٦٢٠پ.ز تاکو ساڵی ٢٥٩٠پ.ز فەرمانڕەوای میسری کرد. لەسەرەتای فەرمانڕەواییدا، فەرمانیدا بە دروست کردنی هەرەمێك پلە پلە بێت لە "میدوم" لە ئەوپەڕی باشووری وڵات. هەرەمەکە لە ٨ چین پێکهاتبوو بڵندییەکەی ٩٢ مەتربوو. لە کۆتایی

سەردەمەکەی، ڕای خۆی گۆڕی و بڕیاریدا بەردێکی بەبەردا بکات بۆئەوەی شێوەی جوانتر و نیان تر بێتە بەرچاو. ئای کە فیرعەنێکی دووربین بوو!

– ئای کە سەیرە!

تاکو مێژووی دروست کردنی تاوەری "ئیڤل" لە باریس ل سالآنی ١٨٨٧و ١٨٨٩ هێشتا هەرەمی گەورەی "جیزە" کە لەسالّی ٢٥٩٠پ.ز بنیات نرا، بەرزترین بینابوو لە جیهان.

– بۆچی شێوەی هەرەمی "دحشور" سەیر دیارە؟

ئەویش بە فەرمانی فیرعەن "سنفرو" بنیات نراوە. لە خوارەوەی هەرەمەکە شۆڕبوونەوەیەکی زۆر قوورس هەیە، بەلآم لەلای ناوەڕاستی بەرزبوونەوەدا دەنووشتێتەوە بۆئەوەی شێوەیەکی چوارگۆشەیی کورت وەربگرێت. ئەمەش بەهۆی ئەو کرێکارانەی بەردیان لە ئاراستەی هەڵە دانابوو! ئەم هەرەمە معینی شێوەیە "ڕەشنووسی" هەرەمە لا لووسەکانی ئایندەییە.

– بۆچی هەرەمەکان بەتەنیا نەبوون؟

ڕاستە ئێستا هەرەمەکان بەتەنیان کەچی لە ڕابردوودا بە پەرستگاو هەرەمی بچووك، سەکۆو هەیوانی گەورە دەورەدرابوو، کە ئاهەنگی تیا دەگێڕدرا، هەموو ئەو شتانە ڕیزبەندی ئەندازەیی کۆشکی فیرعەونی دەنواند. بەم شێوەیە فیرعەون دوای مردنی هەستی بە غەریبی یان تەنیایی نەدەکرد.

– چۆن مۆمیای هەرەمەکان وون بوو؟

لە هەرەمەکاندا هیچ مۆمیایەك نەدۆزراوەتەوە. بەلآم دزەکان تەنیا گەنجینەکانیان دەدزی تەنانەت هەرەمی "سنفرو" ئەوی کە هیچ پۆژێك تالآن

نەکراوە، هیچ مۆمیایەکی تیا نەبوو. بۆیە زانایانی شوێنەوار پرسیار دەکەن: ئایا بەڕاستی فیرعەونەکان لە هەرەمەکانیان دەنێژران؟ لەم بارودۆخەدا، سوودی چی بووە؟ و مۆمویاکان لە کوێن؟ هێشتا دەبێت مەتەڵی زۆر وەڵام بدەینەوە...

– بۆچی نزیکەی زۆربەی هەرەمەکان تالانکران؟

سەرەڕای ئەو ڕێوشوێنانەی لەکاتی دروست کردنی هەرەمەکان گرتراونەتەبەر، لەکۆنەوە دزەکان چوونە ناویەوە و لە گەنجینەدڵ ڕفێنەکانی بەتاڵیان کردوونەتەوە لەڕاستیدا زۆربەی کات ئەو دزانە خودی کرێکارەکان بوون، ئەوان نهێنییەکانی بیناکەیان دەزانی.

– بۆچی بەتێپەڕبوونی کات قەبارەی هەرەمەکان بچووك بووەتەوە؟

پارەی پێویست لە خەزێنەی دەوڵەت نەماوە، دەستیان بەوە کردووە بە بەردی بچووکتر و بچووکتر بینای بکەن. و لە شانشینی ناوەڕاست، ناوەوەی هەرەم لە خشتی سوورکراوەی دروست کراو لە قووڕاوی ووشك کراوەی نیل چاك دەکرا لەبەرئەوەی بەرد گران بەها بوو. تەنیا ڕووی دەرەوەی گەچ کراوە ئەو هەرەمانەی بە قووڕاو دروست کراون ئەمڕۆ کەلاوەن.

– بۆچی "أمحوتب" بەزانا دادەنرا؟

ئەو داهێنەری هەرەمەکانە، بەڵام هەروەهاداهێنەری ئەندازەی بەردینیشە. ڕاوێژکار وزانای فەلەکناسی و زێوان و پزیشك ونووسەر بووە...وەکو ئەوەی "لیۆناردۆ دافنشی" میسری بێت!

– بۆچی میسرییەکان لە دروست کردنی هەرەم وەستان؟

لەبەرئەوەی هەرەمەکان تالآن کران، و گۆڕی فیرعەون وەکو پێویست نەدەپارێزران. لەساڵی ١٥٥٠پ.ز میسرییەکان بڕیاریاندا فیرعەنەکانیان لەگۆڕی پتر نهێنی ولەژێر چیاکان هەڵکۆڵراو لە باشووری وولآت بنێژن. ئەوە و ئەو جێگایە هەڵبژێردرا کە ناوی دۆڵی شایەکان بوو لەبەرئەوەی چیاکان شێوەیان سروشتی بوو.. وەکو شێ،ەیی هەرەمەکان! لەوێ "توت عنخ امون" نێژرا.

– ئای کە سەیرە!

بەیۆنانی بە هەرەم دەووترێت "پیرامیس" و ماناکەی قالبی بچووکی شیرنەمەنییە! ئەغریقیەکان دەیانویست بە ناونانی ئەو بینا عیملاقانە بەوناوە گاڵتە بە میسرییەکان بکەن!

سەرچاوە :

ایمانوال باروسیان، مجموعتي لماذا كيف للإجابة عن أسئلة الأولاد مصر، دار المجاني، الطبعة الأولى، ٢٠٠٧.

وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە بۆ کوردی: د. محمد عبدالله کاکە سوور.

# هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤێت
# سەرەتاکان – هۆکارەکان – شوێنەوارەکان

ن: د. حوسێن شەریف
و: هەوراز جەوهەر مەجید

یەکەم: سەرەتاکان

١– سەرەتای دیارو ئاشکرای داروخانی یەکێتی سۆڤییەت، دەرکەوتنی ئەو ڕێبازە نوێیە بوو کە لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی سۆڤییەتی لە یونیۆی ١٩٨٥ گفتوگۆیان لە بارەوە کرد– واتا لەو ساڵەی گۆرباتشۆف دەسەڵاتی گرتە دەست، کە لە پاشاندا کتێبێك بە ناونیشانی( البیروسرویکا) دەرکەوت– واتا دووبارە بنیادنانەوە" بەم شێوەیە هەرەسهێنان بەکۆتا هاتنی فۆرمی فیدراڵی لە یەکێتی سۆڤییەت و دەست لە کارکێشانەوەی گۆرباتشۆف لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩١ کە دەست لە کارکێشانەوەیەکی بڕیاردراو بوو تۆمارناکرێ، لە بەر ئەوەی هەموو بەشەکانی یەکێتی سۆڤییەت بەرەو بارودوخی خۆی هەنگاوی نا.

بەم شێوەیە ئەم ڕێبازە نوێیە تەنها دەستکرد و دروستکراوی گۆرباتشۆف نەبوو، بەڵکو تێڕوانینی کۆمەڵێك لە سەرانی حزب بوو، کە

لە پاشاندا لە نێویاندا ناوێك سەری هەڵدا كە ئەویش ((یلتسن)) بوو " ڕێبازە نوێیەكە گوزارشتی دەكرد لە تێڕوانینی كۆمەڵێكی تاڕادەیەك بچووك بەڵام ئەودینامیكیەتە ناخۆشی و نالەباری ناوخۆیی قۆستەوەو بەگەرخست بۆ پێشكەش كردنی خەونێكی نوێ بەو ئاراستەیەی دەیبینین.

رەنگە راستر بێ ئەم سەرەتایانە لە ووشەكانی بیروسترویكا هەڵێنجین كە گۆرباتشۆف وەسفی كرد بە چەندین وەسفی جیاجیا، كە بەگشتی دەبێتە هۆی تێگەیشتنی ئەم سەرەتایانە:

(أ) بیروسترویكا پێویستییەكی بەردەوامە لە كۆمەڵگای سۆڤییەتی سەركەوتوو بۆ گۆڕانكاری، هەر دواكەوتنێك لەمەدا دەبووە هۆی خێرا تر كردنی ئاڵۆزی و شلۆقی بارودۆخی ناوخۆ، ئەمەش دەبێتە هۆی تەنگژەی كۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی ترسناك لە وڵاتدا كە وێنەی نییە لە مێژوودا، لە ماوەی حەوت دەیەی ڕابردوو. ئەوەش ماوەیەكی كورتە لە تەمەنی مرۆڤایەتیدا. یەكێتی سۆڤیەت چەندین سەدەی دوور و درێژی تێپەڕاند و بوو بەیەك لە بەهێزترین دەوڵەت لە جیهاندا كە شوێنی ئیمبراتۆرییەتی ڕوسی دواكەوتوو– نیمچە دەرەبەگ، نیمچە داگیركەری گرتەوە، یەكێتی سۆڤیەت خاوەن هێزێكی بەرهەم زەبەلاح و توانای فكری گەورەو ڕۆشنبیری باڵایە، كۆمەڵگایەكە كە زیاتر لە سەد نەتەوەو ئومەت چاودێری كۆمەڵایەتی بەرفراوان بۆ ژمارەی ٢٨٠ ملیۆن مرۆڤ لە سەر ڕووبەری ١/٦ گۆی زەوی لە خۆدەگرێ.

(ب) سەرکردەکانی یەکێتی سۆڤییەت لە نیوەی کۆتای هەفتاکاندا تێبینیان کرد کە وولات هێزی بەرگری لە دەستداوە و نشوستی ئابوری دووبارە دەبێتەوە، و کێشەکانیش دەستیان بەکەڵەکە بوون کردووە، و رەگەزەکانی بێبزوتی ئابوری دەست پێدەکات لە کاتێکدا شۆڕشی زانستی و تەکنەلۆژیا ئاسۆیەکی نوێی دەدا بەپێشکەوتنی ئابوری و کۆمەلایەتی.

(ج) تێکرای گەشەسەندنی داکشاو و بێبزاوتی ئابوری کاریگەری لە سەر لایەنە جیاوازەکانی کۆمەلایەتی لە یەکێتی سۆڤییەت کرد، فەرماندەکانیش تێبینی داڕوخانێکی لە سەرخۆیان لە بەهای ئایدۆلۆژی مەعنەوی گەل کرد.

(د) دیسان پێویستی بە گۆڕانێك هەبووکە هەوێن بێ لە هۆشیاری گەلدا، هەروەها رێکەوتنێکی گشتی هەبوو لە سەر ئەوەی ناکرێ کاروبارەکان بەو شێوەیە بڕۆن کە هەیە، ئەمە شپرزەی وتوڕەیی لەناو جەماوەردا دەتەقێنێتەوە .

فەرماندەکان گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە پێویستە هۆکاری مرۆیی چالاك بکەن و خەڵك بەرکێش بکەن بۆ بەشداری کردن لە دووبارە بنیادنانەوە، چونکە خەڵك بەهەموو جۆرە داهێنانەکانیان دروستکەری مێژوون .

٢- مانای بیروسترۆیکا:

گۆرباتشۆف لە کتێبەکەیدا دەربارەی مانای ڕێبازی نوێ لە (دووبارە بنیادنانەوە)دا بەم شێوەیەی خوارەوە ڕافەی کردووە:

ا- مانای زاڵ بوون بەسەر بێبزاوتی لە پێناو خێرا کردنی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابوری، و پێدانی دینامیکیکی زیتر.

ب- دەست پێشخەری جەماوەر و پێشخستنی گشتگیرانە بۆ دیموکراتی و حوکمی ئۆتۆنۆمی هاوبەش و هاندانی دەسپێشخەری.

ج- چڕکردنەوەی گشتگیرانە بۆ ئابوری سۆڤییەت و وازهێنان لە کارگێری فرماندەر.

د- وەرچەرخانێکی تەواو بۆ شێوازەکانی زانستی.

هـ- پێشینە (ئەولەوییەت) بدرێت بە پێشخستنی بواری کۆمەڵایەتی.

و- نوێ کردنەوەیەکی وورد بۆ هەموو لایەنەکانی ژیانی سۆڤییەتی.

ز- یەکخستنی سۆشالیستی لەگەڵ دیموکراتییەتدا.

ح- بیروسترۆیکا شۆڕشە، بەواتای بنیادنان دێت بەڵام دیسان پێویستی بەکاول کردنی هەموو کۆنی و بێبزاوتی و ئەوەی کۆسپ دەخاتە بەردەم پێشکەوتن هەیە و لە خۆ دەگرێت، و بەبێ کاول کردن ناکرێت شوێنە نوێیەکە بۆ بنیادنان خۆش بکرێت.

٣- بیروستروێکا لە دیدگای ڕۆژئاوادا :

گۆرباتشۆف گوزارشتی لەو دیدگایە کرد بەو وتەیەی کە لێرەدا پێشنیاری سەیر هەیە- هەندێکیان ناوخۆین- دەڵێ : گۆڕینی

سیستەمی کۆمەلآیـەتی بەئاڕاسـتە کردنـی بـۆ شـێوە و شـێوازەکان لـە بارودۆخی کۆمەلآیەتی جیـاوازدا، ئـەم تێروانینـە لـە دیدی گۆرباتـشۆف مەحالّ بوو، تەنانەت ئەگەر هەر کەسێکیش ئـارەزووی گـۆڕینی یـەکێتی سۆڤییەت بکات بۆ سـەرمایەداری بـەلآم چـۆن ((رازیـن لەسـەر ئـەوەی ساڵی ۱۹۱۷ هەڵەیەك بوو هـەروەها هـەموو ئـەو هـەفتا ساڵە لـە ژیـان و کارو تێکۆشان و شەرەکانماندا دیسان هەڵەیـەکی تـەواو بـوو، ئێمـە بـە ئاراستەیەکی هەڵە دەڕۆیشتین؟)).

لێـرەدا تێبینـی دەکرێـت تێروانینـەکانی گۆرباتـشۆف ئەگـەر بەراسـتی دڵسۆزانەش بووبێ، و نەك بـەتاکتیك و چەواشـەکارانە، ئـەوا بۆچـونەکان بەو ئاڕاستەیە هەڵە بوو، کە لەپاشتردا روونی دەکەینەوە.

٤- سیاسەتی بازدان بەچاکسازی کێشە گەلێکی لە جۆری نوێ لێدەکەوێتەوە وەکو :

ا- ئۆپۆزسیۆن لە هێزی پارێزگاران .

ب- بەرهەڵستی لە لایـەن هێـزە داواکارەکـان بـەخێرا کردنـی چاکسازی بەرەو ئابوری بازاڕ و فرە حزبی لە سەرویانەوە ((یلتسن))

ج- ئـەو نەخۆشـییە ناسـراوانەی ولآتـانی رۆژئـاوا وەکـو بـێ کـاری و هەلآوسان ، کار دەکاتە سەر پێـوەری تواناکـانی بەرهـەمهێنان و باشـی کەل وپەلەکان و کەمی بەرهەمهێنان.

د- نەخۆشی پێشبینی کراوی زیاتر لای جەماوەر و سەرکردەکان.

ه- ژمارەیەك لە نەخۆشی كۆمەلایەتی ترسناك لەوانە ئارەزووی بەكاربردن و جیاكاریيە كۆمەلایەتییە لە ناكاوەكان و بلاوبوونەوەی گەندەلی و تاوانكاری.

٥- لە وانەیە گۆرباتشۆف هەر لە سەرەتاوە دەركی بە گەورەی و ترسناكی پەلەكردن لە چاكسازی نەكردبێت و هەروەكو خۆی باسی كرد، روخان ولابردن دەخوازێت، خەمی یەكەمی خۆ دوور گرتن بوو لەو تەقینەوەیە تاوەكو جیهان دوورخاتەوە لە مەترسیەكانی ئەو تەقینەوانەی كە لە ناوخۆدا دەخولقا كە دەشیا سەر بكێشێ بۆ جەنگێكی ئەتۆمی وێرانكەر. كێشەكە یاریيەك نەبوو لە نێوان دوو سیستەم بەلكو چۆنیەتی رەفتارو هەلسوكەوت كردن بوو لەگەل سیستەمێك كە لە ناوخۆ دەتەقێتەوە .

٦- ئەوەی جێی باسە چین یەكەم ولات بوو سووسەی شكستی روسیای كرد، بەلام بە رێگای خۆی دەیروانیە لادانی سۆڤییەت و ئیمپرالیزمی سۆشیالیستی، وە پێشبینی روخانی یەكێتی سۆڤییەتی كرد.

٧- لێرەدا پرسیارێك دەورووژێ كە بۆ ماوەیەكی درێژ بێ وەلام دەمێنێتەوە ئەویش:

بۆچی ئامرازی سۆشیالیستی لە یەكێتی سۆڤیەت شكستی هێنا بەلام لە چینی میللی شكستی نەخوارد؟!

<u>دووەم:</u> هۆكارەكان :

هۆکارە بینراوەکانی داڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت زۆرە، بۆیە کورتی دەکەینەوە لە دیارترین ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١- فاکتەری ئابوری لە پێشەوە دێت، دەوڵەتە سۆشیالیستەکان و یەکێتی سۆڤیەت بە تایبەتی گەشەیەکی روونی بەخۆیەوە بینی لە پەنجاکان و شەستەکان و، دوای دەیەی حەفتاکان دابەزینێکی بە خۆیەوە بینی لە تێکڕای گەشەکردن پاش پڕاندنی هەموو تواناکانی شۆڕشی پیشەسازی یەکەم و دووەم. ئابوری سۆڤیەت- سۆشیالیستی بەگشتی - لە هەشتاکاندا گەیشتە باروئۆخێك کە نەدەگونجا لەگەڵ تێڕوانینی سۆشیالیستی لە دروست کردنی نمونەیەك لە پێشکەوتنی ئابوری و کۆمەلآیەتی. ئنجا پاشەکشەو گەڕانەوە بەڕوونی دەرکەوت. لەگەڵ دەرکەوتنی شۆڕشی تەکنەلۆژیا لەبواری (الحاسبة الالية) ئەلکترۆنیدا و گەیاندن و ئەندازەی بۆ ماوەیی (شۆڕشی پیشەسازی سێیەم) وە بلأوبوونەوەی لەژاپۆن و ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و ولأتانی ئەورووپای ڕۆژ ئاوا و، ئەوەی شۆڕش بۆ پرۆسەی بەرهەمهێنان و کارگێری دۆستانە خولقاندی ئەوا کەلێنی نیوان ئەم دووهێزەی زیاد کردوو بوو بە تەنگژەیەکی(قەیران) ئاسایشی لەپال کیشە کۆمەلایەتی و ئابووریەکاندا .

٢- بیروسترۆیکا خۆی فاکتەرێك بوو لەفاکتەرەکانی هەرەسهێنانی یەکێتی سوفیەت " لە بەر ئەوەی بەرهەڵدانی وزەو توانا جەماوەرییەکانی لە رەخنەگرتن و بێزاری و ئارەزوو لە چاکردنی ئاستی

گوزەران لە خۆ دەگرت لەو کاتەوە بەپێی تێروانینەکانی گرۆپی گۆرباتشوف . تێروانینێکی کاول کاری لە پێناو دووبارە بنیادنانەوە دەست پێ دەکات لەکۆتایدا ئامرازی رووخانەکە گۆڕا بۆئامرازێکی نەوەستاو و نەپساو !! .

٣- کەلێنی نیوان ئەو دووسیستەمە چەندین شوێنەواری لێ کەوتەوە " لەوانە هەست کردنی سەرکردەکانی سۆڤیەت بە هەرەشەیەك کە رووبەرووی ئاسایشی وولات دەبێتەوە دولجار ئەو خۆبەدەستەوە دانە کەلەسەر شێوەی سازش کردنە یەك لەدوای یەکەکان وەك جێگرەوەیەك بوو بۆ ئەوجەنگە وێرانکارە .

٤- ئەم داروخانە دەگەڕێتەوە بۆنابووت بوونی ئایدۆلۆژی یان بۆ ئەو ئالوگۆرانە یاخود بۆئەو هەڵسوکەوتە هەڵەیەی لە گەڵ ئایدەلۆژیاکە دەکرێت، لە دیدی جەماوەردا بوو بە پاساوێك بۆ بنیادنانی ( دامەزراوێك ) کە ئەندازێکی زۆر لەسەر کورت کردن وپەیوەندیە نادیموکراتیەکانی لەخۆ دەگرێت، هەروەکو ئامرازی بنیادنانی سۆشالستی توانیی " چونکە لە سیستەمی سوشیالستی پێویست بوو توانایەکی لەمەر دەستەبەر کردنی ژیانی چاکتر بۆ جەماوەر، کە دەبوایە ئەم کارە روویدابا بەلام پێچەوانەکەیمان بینی .

٥- هەروەها کۆمەلگای سۆشالستی سەری هەڵدا لەکۆمەلگایەك کە سەرمایەداری یەکەمجار تێدا بەدی هاتبوو لەسەر بنەڕەتی ئەوەی کە سۆشالستی بەرهەمی سەرمایەدارییە " روسیا پالێوراو بوو بۆبنیادنانی

سۆشالستی " بەڵکو کۆمەڵگایەکی دەرەبەگایەتی دواکەوتوو" لەبەرئـەوە سیستەمی سۆشالستی لەم سەدەیەدا بەدیهێنرا کە لە نێو خۆیدا شکست وداڕوخان لەبەر ئەو هۆیانە بوو کە پەیوەستە بەشێوازی دروست بـوونی بنچینەدا.

٦- بزاوتێکـی چـالاك ودوژمنانـەی سـەرمایەداری هـەبوو بەپێـشەوایەتی وولایەتە یەکگرتوەکانی ئـەمریکا کـە دژایـەتی وسـوکایەتی بـە ئـەزمونی سۆشالیستی دەکردوو ماندووی دەکرد وپەلکێشی دەکردە نێـو ململانـێ لاوەکییەکان .

٧- ئـەم شکستە کەدەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو بارگرانییـەی کـە سیـستەمی سۆشالستی نۆی هەلیدەگرێ، نمونەی ئەمـەش : بەرزکردنـەوەی ئاسـتی فرەگەلەکانی ناوخۆی یەکێتی سۆڤیەت " وبلاوکردنەوەی چەتری دەستە بەری کۆمەلایەتی بەسەر زیاتر لە ٢٨٠ ملیون مرۆڤی دانیشتوی یـەکێتی سـوڤیەت - ویارمـەتی دانـی دەولەتـە ئەورووپیـە سۆشیالیـستەکان و دەوڵەتـە سۆشیالیـستەکانی ئاسـیا وەدیارترینیـان چـینی میللـی " وەبارگرانی توندی بزاڤەکانی ئازادیخوازی نیشتمانی لەجیهاندا .

٨- واباشە هۆکاریکی دیکـە بهێنـرێ بـۆ تـەواوکردنی ئـەم رونیـە لەگـەل ئـەوەی کەپـشت بەراسـتیە زانـستیەکان نابەسـتێت ئـەویش پـیلانگێری رۆژئاوا بوو لەگەل ڕەگەزە بەکرێگیراوەکانی ناوەخوی یـەکیتی سـۆفیەت کە ئەونەخۆشیە ڕاستەقینەیەیان قۆستەوە لەوانە دەردەسەری جەماوەر ونەبونی دیموکراتی، تەقینـەوەی یـەکێتی سـۆڤیەت لـەناخۆدا بەدەست

والآکردنـی جـەماوەر بـە ڕابەرایـەتی شۆڕشـێکی ڕاسـت کردنـەوەی نـویٚ بـەپێی ڕێنماییـەکانی لیـنین، کاتێـک ئـامرازی وێـران کـردن جـۆلا ئیترنەوەستایەوە!

سیٚ یەم: شوێنەوارەکان:

لەپێشداو تائێستاش ئەو ئەنجامانەی لەداڕوخانی یەکێتی سوڤیەت کەوتەوە گەورەبوو بە ئەنـدازەی گـەورەیی یـەکێتی سـوڤیەت و ڕۆڵـە جیهانیەکەی و وێنـە زەبەلاحەکـەی بەوپێیـەی کەیەکێکە لەفەرمانـدەی گلۆتی نێودەولـەتی، نـاکری لێکۆلینـەوە لەهـەموو ئەنجامـەکانی ئـەم داڕوخانـە بەشـێوەیەکی ورد و بێلایـەن بکـەین تـەنها پـاش تێپـەڕبوونی ماوەیـەکی درێـژ نـەبێت کـەرۆڵی هـەر یەکـە لەوانـەی بەشـداری ئـەم داروخانـەیان کـردووە روون دەبێتـەوە، هەوڵـدەدەین دیـارترین ئـەو دەرئەنجامانەی لە داڕوخانی سۆڤییەت کەوتەوە لەم خالآنـەی خـوارەوە کورت بکەینەوە :

١- سەبارەت بەجیهانی عەرەبی :

أ- نمونەی تەنگژەی کەنداو - کەلەدوایدا بەگەردەلولی بیابان ناسرا- تاقیکردنەوەیەکی راستەقینە بوو بۆ سیستەمی نوێی نێودەولەتی دوای کەوتنی یەکێتی سۆڤیەت، لەگەڵ ئەوەی ئەم تەنگەژەیە لەکاتێکدا پەیدابوو بنەماو ئامانژەکانی سیستەمی نوێی نێودەولەتی فورمەلە نەبوو بوو لەبەر ئەوەی تەنگەژەی کەنداو - داگیرکردنی عێراق بۆ کوێت لەنیوەی دووەمی ساڵی ١٩٩٠ ڕوویدا، کەچی بەلگەنامەی مردنی یەکێتی

سۆڤیەت بەدەست لە کارکێشانەوەی گۆربا تشوف لە کۆتاییەکانی ١٩٩١ ڕاگەیانرا .

سەرباری بەرزکردنەوەی درشمەکانی گۆرینەوەی متمانەو رەت کردنەوەی بەکارهێنانی هێز و هاوسەنگی بەرژەوەندییەکان و بلاوکردنەوەی دیموکراتی بەلام هەندێ وولات – فەرماندەکانی ولاتانی جیهانی سێیەم سەرکەوتوو نەبوون لە تێگەیشتنی ئەوەی روودەدا بەتایبەتی دەرکەوتنی بالا دەستی ئەمریکا کە ئامرازێکی جەنگی زۆر وێرانکەری کۆکردەوە ، ئامادەبوو بۆ بەکار هێنانی وەکو زامنێك بۆ بەرژەوەندیەکانی ، هەروەکو ژمارەیەکی زۆر لە فەرماندەکانی ولاتانی جیهانی سێیەم تێ نەگەیشتن کە هاوسەنگی هێز کۆتایی هاتووە تەنانەت هاوسەنگی بەرژەوەندییەکانیش دروشمێکی بۆشە ، ئەوە گونجاو بوو کەسیستەمی نێودەولەتی راوەستێ لەسەر لوتکەی دەولەتە بالا دەستەکان ئەوێش ولاتە یەکگرتووەکان بوو کە خواستێکی سەربازی دوژمنایەتی هەبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان کەگرینگی دەدا بە چارەسەر کردنیان .

هەروەکو دەولەتانی جیهانی سێیەم تێ نەگەیشتنی ئەو هەرێمایەتیانە لەوانە رژێمی عەرەبی ووتەی یەکلاکەرەوەی نەبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشە هەرێمییەکان لەبەر ئەوەی جەمسەر کۆتایی هاتبوو – یەکێتی سۆڤیەت – وەکو ( دیکۆرێك ) لەپاڵ دەسەلاتی راستەقینەی نێودەولەتی راوەستا .

بەدرێــژایی قۆناغــەکانی تەنگــەژە ، دوو ئاراســتەی ســەرەکی نێودەوڵەتی دژ بەیەك دەرکەوتن :

یەکەمیان شێوازی سۆڤیەتی: بەپاڵپشتی هەندێك لە وولاّتـانی ئەورووپا داوای چارەسەرکردنی تەنگەژەکەیان دەکرد بە رێگە چارەی ئاشـتیانە وهانی ئێراقیان دەدا بۆ ڕازی بوون و خۆبەدەستەوەدان بە بریارە نێو دەوڵەتیەکان .

دووەمیــان شـێوازی ئـەمریکی: چارەسـەری سـەربازی شـان بـە شـانی فشارەکانی دیکەی سیاسی و ئابووری و مەعنەوی بەباشتر دەزانی .

گەر چـی تێروانینـی سـۆڤییەت وەکـو کۆتێك بـوو لـە سـەر جوڵـەی ئـەمریکا بـەلاّم ئەمـە لـە کۆتایـدا نـەبووە ڕێگـر لەبـەردەم ولایەتـە یـەککگرتووەکان بـۆ بـەکارهێنانی هێـزی سـەربازی دژی عێـراق، ئەمـەش بـووە هـۆی وەدەرنـانی عێـراق لـەکوێت و لێـدانێکی تونـدی سـەربازی و ئـابوری و سیاســی لــەعێراق کــە بۆســالأنێکی درێــژ گەڕاندیــەوە دواوە وبەشێوەیەك کەمەبەستی تەنها کۆتای هێنان نەبوو بەداگیرکاری، بـەڵکو کۆتای هێنان بوو بەتواناکانی عێراق .

ب – هـەرەس هێنـانی یـەکێتی سـۆڤیەت وشـێوازی تاکگـەرایی رۆژئـاوا بەکاروباری جیهـانی عەرەبیـەوە بـووە هـۆی زیـاتر بەسـتانەوەی وولاّتـە عەرەبیــەکان بــەبازاری جیهانیــەوە، و ناوچــەی عــەرەبی بــۆ ناوچــەی رۆژهەلاّتی ناوەراست گۆڕی، ئەمەش هەڕەشەیەك بوو لەمانـەوە وکـارایی وچالاکی سیستەمی عەرەبی.

ج – هەرەس هێنانی سۆڤیەت کاریگەرییەکی روونی هەبوو لەسەر کێشە سەرەکییەکان لەجیهانی عەرەبیدا، بەتایبەتی کێشەی فەلەستین وچارەسەرکردنی کێشەی رۆژهەلاتی ناوەراست، بەشێوەیەکی گشتی لەم لایەنەوە هەموو کارەکتەرەکان لەدەستی ولآتە یەگکرتووەکاندا بوو، لە لایەکی دیکەوە ئیسرائیل زۆرێك لەو رۆلأنەی کە ولأتە یەککرتووەکان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لە رۆژهەلاتی ناوەراست پێی سپاردبوو لە دەستیدا، بەلکو ئیسرائیل گۆرا بە بارگرانییەکی ئابووری و سیاسی لە سەر شانی وولأتە یەککرتووەکان ، لێرەدا بالأ دەستی نویێ جولأ و فۆرمی مەدریدی ئۆکتوبەری ١٩٩١ سەپاند و ئامـاژەی بە مردنەکەی یەکێتی سۆڤیەت کرد. دوای ئەم مێژووە بەچەند مانگێك راگەینرا. ئەمەش ناکرێ وا لێکبدەینەوە کە رووخانی سوڤیەت زیانە لەسەر پرسە عەرەبیەکان چونکە دەکرێت ئەوە والێك بدەینەوە کە کەوتنەکە هەلوێستەکەی راست کردەوە لە بەرژەوەندی خێراکردنی چارەسەرکردنی تەنگژەکە، لەبەر ئەوەی وولایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا دەستی گرتبوو بە هەلوێستە گەرم و توندەکەی بۆ لێدانی یەکێتی سوڤیەت، ئەمەش هۆکارێکی شاراوە بوو کە گۆرانکارییەکانی تر شوێنی گرتەوە .

د- رەنگە لەئەنجامەکانی ئەم هەرەسهێنانە ئەوە بێ رۆژئاوا نەگەرێتەوە بۆ رووبەروو بونەوەی دووژمنێك کە نەتوانێ لەچوارچێوەی ستراتیژی

ئــەودا هــەڵبکا کــە تــەنها بــەبوونی دووژمــن ڕاهــات بــوو، لێــرەدا لێکۆلینــەوەکان هــەوڵیان دەدا کــە (ئیــسلامی ئوصــولی ) بــەو پێناســەیە پێشکەش بکەن کە دووژمنی شارســتانییەتی رۆژئاوایــە ئەمــەش کــارێکی ساویلکانەو هەڵە بــوو، زۆربــەی وولاتــانی ئــەورووپی دەرکیــان بــە هەڵــەی خۆیان کرد . بەلام تاوەکو ئێستا لە بیرەوەریاندایە و هەڵسان بەگۆڕین و دانانی بزاڤی فەندەمینتالیستەکان کە بــەتیرۆر وەســفیان دەکــردن .نــەك جیهانی ئیسلامی وەکو دوژمنێك ، ئەمەش کاریکی هەڵەو گومڕایانە بوو.

٢- کاریگەری لەسەر وولاتانی ئەورووپایی :

سەبارەت بەئەورووپا بەگشتی، رۆژئاوا بینی کەنموونە وبنەماکانی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، سیستەمی سۆشالیستی لەرۆژهەلاتی ئەورووپا هەرەسی هێناوە ، ومل کەچی ئەو پێشکەوتنانە بوو، بەپێی تێڕوانینەکانی ڕۆژئاوای سەرمایەداری کە لەسەر ئامرازی بازاروفرە حزبی وڕێزگرتنی مافی مرۆڤ بەند بوو .

لەســەر ئاســتی ئــەڵمانیا دیــواری بــەرلین لەنۆڤەمبــەری ١٩٨٩ ڕوخــا لەگــەڵ کۆتــای هــاتنی جــەنگی ســارد، وبــەکۆتایی هــاتنی ســاڵی(١٩٩٠) ئەڵمانیا دووبارە یەکیگرتەوە ویەکێتی سۆڤیەت ڕازی بوو کــە ئــەلمانیای یەکگرتوو بچێتە ناو هاوپــەیمانی ئەتلــەنتی .هــەروەها ئــەورووپای ڕۆژئــاوا پێویستی بەپارمەتی وبەرگری ئەمریکا نەما، وئەمــەش ئاســۆیەکی نــوێی لەداهاتوودا بۆ سیستەمی ئاسایشی تایبــەت بــە ئــەورووپا کــردەوە پــاش ئــەوەی وولاتــانی ئــەورووپای ڕۆژهــەلات ئامــادەبوون بــۆ چــوونە ئــەم

کۆمەڵەیـەوە، ئـەم داروخانـە گریمانـەی ناسـەقامگیری لـە رۆژهـەلآت و باشوری ئەوروپا خولقاند و بووە هۆی زیاد بوونی مەترسی دووژمنکارانـە لـە ئـەڵمانیای یـەکگرتوو لـە داهـاتوودا دوای لەناوچـوونی ئـەو بەنـدو بەستەی کەبوونی هەبوو بەهۆی هەبوونی جەمسەری سۆڤیەتی ، وەکـو ئـەو هەلۆەشـانەوە مەرگەسـاتەی کـە لـە یۆغـسلافیا بینیمـان بۆسـرب وکروات وبۆسنە ، وتەقینەوەی جیاوازی ئاینی و ڕەگەزی .

٣- تیۆری بۆشایی (نظرية الفراغ) :

بێگومـان یـەکێتی سـۆڤیەت بۆشـاییەکی لـەبواری نێودەولـەتی بەجێهیـشت کـە بـووە هـۆی تـاکرەوی یـان نیمـچە تـاکرەی ولآتـە یـەکگرتووەکان لـە سیـستەمی نێودەوڵـەتی، بەسروشـتی هێزێکـی نـوێ دەدەرکەوێت بۆ پرکردنەوەی ئەم بۆشایی یە و پالێوراوانی ئەم ڕۆڵەش : یابـان وچـین و ئـەوروپای یـەکگرتوو بـوو، ئـەم شـێوازە ڕاسـتکرایەوە بەیەکێتی ئاسیایی کەیابان وچین وگەلـە گەشـە سـەندووەکانی دیکـەی ئاسیایی کە بەرزدەبوونەوە بۆهاوشانی ئـەوروپا و ولآتـە یـەکگرتووەکان لەخۆدەگرت - واتا لە پێشماندا سیستەمێکی (ترویکا) فـرە جەمـسەری بەدی دەکرێت.

٤- سیستەمی نوێی نێو دەوڵەتی :

سـەرباری ئەمـەی پێشوو ، بەلایـەنی کەمـەوە لـەکاتی ئێـستادا بـالآ دەستی وزال بوونی ئەمـەریکا بـەدی دەکرێـت و کۆتـای بـوو بەجـەنگی سـارد ، وبـارودۆخێکی نێودەولـەتی کـە بەخاوبوونـەوە دەناسـرا

لەئەنجامی ئەوسازشانەی کە سۆڤیەتی پێشوو کردی بووە هۆی گەیشتن بەچارەسەرەکردنی کێشە گەلێکی زۆر دیاترینیان :
دانانی سنوریك بۆ خۆ پڕچەك کردن و مافەکانی مرۆڤ وکێشەکانی ژینگە وبازرگانی نێودەوڵەتی وینبڕکردنی مادە بێهۆشکەرەکەرەکان وتیرۆر.
بەرز بونەوەی نمونەی ڕۆژئاوا لەسەر دووهۆکاری سەرەکی بەند بوو ئەوانیش : ئابوری بازارو فرە حزبی لەگەل دیموکراسی بەشێوەی ڕۆژئاوایی و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ بوو.لەکۆتایدا وا دەبینین کە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تایبەتمەندبوو بە چارەسەرکردنی ململانیّ هەرێمایەتیەکان دوای نەمانی ڕۆڵی جەمسەری دووەم (یەکێتی سۆڤیەت) و دوای خۆتەرخان کردنی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پەخشکردنی کردارەکانی ئەمریکا .
٥- نەتەوە یەکگرتووەکان :
بێگومان نەتەوە یەکگرتووەکان شێوازێکی نوێی وەرگرت دوای لەناوچوونی گلۆتی سۆڤییەتی و لە رووی سەرەوەش بەرگەی ئەو بارگرانیە نوێیەی گرت بۆچارەسەرکردنی کێشە هەرێمایەتیەکان. ڕۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکان لەماوەی پرۆسەی گەردەلولی بیابان لەدژی عێراق ولەماوەی چارەسەرکردنی تەنگژەی صۆمالی دەرکەوت و روون بوەوە.
ئەم ڕۆڵە رەنگرێژ کراوە کە لەژێر چاودێری و بەجێهێشتنی بۆ وولایەتە یەکگرتووەکان کەفراوانکاری تێدا کرد نمونەی ئەمەش کۆنگرەی

مدریدی (ئۆکتۆبەری ١٩٩١) بەئامادە نەبوونی نەتەوەیەکگرتووەکان بەسترا لەبەر ئەوەی پەیوەندی بە پەرژەوەندی زیندەگی وولایەتە یەکگرتووەکانەوە هەبوو.

٦- کێشە ناوخۆیەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو:

ئەم شکستە چەندین کێشەی گەورەی لە نێو لایەنەکان کە بەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو ناسرابوو لێکەوتەوە وەکو:

أ- کیشە نەتەوەیی وئاینیەکان، ململانێیەکی ئیتنی ئاینی لەنێوان ئەرمەن و ئازەربێجانیەکان لە ئارادابوو هەروەها ململانێیەکی رەگەزی لەنێوان چەندین کۆمەڵی یەك ئاین هەبوو وەکو ململانێی نێوان ئۆزبەکستان و تورکەکان.

ب- کیشە سیاسیە ناوخۆییەکان وەکو جیاوازییەکانی سەرۆکی ڕوسیا لەگەڵ پەرلەمان کە کۆتایی هات بە داگیرکردنی پەرلەمان لە ١٩٩٣/١٠/٤ ئەمەش لێدانێك بوو لەدیموکراسی بەپاڵپشتی ڕۆژئاوا.

ج- تەقینەوە و پەشێوی و ئاڵۆزی کرێکاران وەکو ئەوەی لەگەل کرێکارانی سبیریا ڕوویدا .

د- ئەو پەشێوەییە ئابووری کۆمەلآیەتیە گشتگیرە لەئەنجامی ئەوداڕوخانە هەژمار بۆ نەکراوە بوو.

هـ- ئەو پارچە پارچە بوون وپەرش و بلاوییەی کە یەکێتی سۆڤیەت ڕووبەرووی بووەوە .

٧- ئایا سۆشالیستی (الأشتراكية ) ڕوخا :

پرسیاری کۆتایی ئەوەیە ئایا بە ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت سۆشالیستی ڕوخا یاخود ئەم داڕوخانە دەگەڕیتەوە بۆ ئەوسیستەمە کە شکستی هێنا نەوەکو بۆ ئەو ئایدۆلۆژیایەی کە بەرێکوپێکی جێبەجێ نەکرا.

یەکێك لەبیرمەندەکانی سۆشالیستی باسی ئەوەی کرد کەسەرمایەداری لە لایەکەوە لەگەڵ سۆشالیستی پێکەوە دەلکێن بۆ ئەوەی ئەنجامێکی ئەلتەرناتیڤ (جێگرەوە) بێت لە داهاتوودا بۆ مرۆڤایەتی بەو مانایەی کە سەرمایەداری خۆی سەرکەوت بەسەریدا بە شێوەیەکی وێرانکاری.

لێرەدا کەسانێك هەن لەسۆشایلستیەکان باس لە ڕووخانی سۆشالستی دەکەن بەلأم سەرکەوتنی ئابوری لە چینی میللیدا بەلگەیەکە ئەمە ڕەت دەکاتەوە .

سەرچاوە : ينابيع المعرفة في السياسة الدولية المعاصرة من الحرب العالمية الثانية الى غزو العراق وخريطة الطريق .

انهيار الاتحاد السوفيتي والنظام العالمي الجديد مهد الطريق للسيادة الامريكية في التسعينيات

١٩٩٠ -٢٠٠٠

الجزء الرابع

المؤلف : سفير د. حسين شريف

# الشرطة في العصر الأموي

أ.د.ارسن موسى رشيد

الفصل الاول

أولاً: ايتمولوجي* مصطلح الشرطة:

على الرغم من مجهودات علماء النحو العرب في إيجاد أصل عربي لمصطلح الشرطة إلا أن الأدلة التي يقدمها هؤلاء النحويون ليست كافية ومقنعة مما يترتب عليه تبني الرأي القائل إن هذا المصطلح مستمد من أصول غير عربية. ويقدم المستشرق شاخت[1] رأيه في الموضوع في معرض تعليقه على كتاب Tyan حول المؤسسات القانونية في الاسلام[2] . لقد رفض شاخت– وهو محق في ذلك– ما قدمه المعجميون العرب حول أصل هذا المصطلح، ويرى أن مصطلح الشرطة قد جاء الى العربية – دون أدنى شك – من الكلمة اللاتينية Cohort، التي أيضاً جاءت بدورها الى اللاتينية عبر الاغريقية. ويقول شاخت في ذلك :

(( إن كلمة شرطة، واحدة من مصطلحات عديدة، تمت استعارتها الى اللغة العربية قبل الاسلام، من اللاتينية والاغريقية، وهي كلمة تتصل بالقضايا العسكرية وما شابهها))[3] .

وعلى الرغم من أن شاخت لا يقدم دلائل كافية لتدعيم وجهة نظره، إلا أن نظريته تحتمل الكثير من الصواب حيث ان مايقترحه، يبدو أكثر اقناعاً من المقولات الكثيرة التي يقدمها النحويون العرب في فترة العصر الوسيط، وهي مقولات تعرض لها Tyan في مؤلفه السالف الذكر بشيء من التطويل[٤] .

إذا تتبعنا ما أورده الزمخشري، فإن كلمة شرطة مستمدة من الجذر شَرَطَ، الذي يمكن أن يأخذ مشتقات متعددة. حيث نجد أن كلمة شَرَطَ لا تستعمل إلا مع حرف الجر "على"، وذلك بشكل عام. كذلك فان عبارة " شَرَطَ عليه " تعني (( بعث اليه مبعوثاً ))[٥] . وفي لسان العرب، تستخدم كلمة ((أشرَطَ)) في جملة، مثلاً، ((أشرَطَ فلان نفسه لكذا))[٦].

إن عبارة ((شرطة الحرب)) قد استخدمت للتعبير عن أول فوج في الجيش القتالي[٧]، كما يستدل ذلك من الحديث المنسوب الى ابن مسعود حيث يظهر تعريف الشرطة على الوجه التالي:

(( فيشترط المسلمون شرطة للموت لا ترجع إلا غالبة ))[٨].

كما تعرض كلمة ((أشرَطَ)) بمفهوم العلاقة كأن نقول (( أشرَطَ فلان نفسه لأمر كذا أي أعلمها له وأعدّها ))[٩]. أما حين تستخدم الكلمة مع السلطان، فإنها تصبح عندئذ (( شرُط السلطان ))، التي تتمثل في (( جيش خاص للسلطان يتميز أفراده بأنفسهم عن غيرهم من الجيوش بعلامات خاصة بهم))[١٠].

وهناك بعض الأراء التي تذهب الى أن كلمة ((شرطة)) قد تستعمل للتعبير عن طبقة اجتماعية معينة تمثلها حثالة المجتمع، ذلك أن الأفراد الذين ينخرطون في الشرطة، إنما يتعاملون مع طبقات أو فئات المجرمين والخارجين على القانون

بشكل عام، وبالتالي أصبح لفظ الشرطة لصيق بأولئك الأفراد الذين يتطلب عملهم السيطرة على الجريمة من خلال التعامل مع المجرمين"[11].

إن أغلب المصادر العربية في العصر الوسيط، التي ناقشت موضوع الشرطة تتفق على أن المصطلح مستمد من ((شَرَطَ))، ولكن هذا الاتفاق تنقصه الدلائل التي تجعل منه حقيقة ثابتة ومؤكدة. وهناك من الباحثين المعاصرين من يرى أن مصطلح الشرطة قد وصل الى العربية من المصطلح اللاتيني Securitas، في محاولة للأتيان بشيء جديد حتى لو كان في ذلك هدم للمناقشات السابقة التي اعتمدها العلماء المسلمون في معاجمهم"[12].

هذه المناقشة، وإن كانت لا تعتبر حاسمة وقاطعة، إلا أنها تميل الى صالح الرأي العام القائل بعدم عروبة المصدر الأصلي لمصطلح الشرطة. فالمصطلح اللاتيني Cohort، يظل أكثر تقبلاً في دراسة اللغات من كلمة Securitas."[13]

ثانياً: الأصول التأريخية المحتملة للشرطة كمؤسسة:

قبل الولوج في مناقشة الشرطة كمؤسسة قانونية في المجتمع الإسلامي، لابد من البحث في مدى وجود هذه المؤسسة من عدمه في فترة العصر الجاهلي، وذلك حتى يكون الموضوع أكثر تكاملاً. لذلك سوف تنقسم الدراسة الى قسمين: الأول يتصل بمحاولة التعرف على مدى وجود أي شكل من أشكال النظام أو الضبط البوليسي–إن جاز التعبير– في العصر الجاهلي بما يشمله ذلك العصر من منطقة شبه الجزيرة العربية وبلاد اليمن. والثاني يتصل بمحاولة القيام بتحليل موجز للتنظيم البوليسي في الدولتين البيزنطية والفارسية.

١. فترة العصر الجاهلي وبلاد اليمن:

يمكن القول بصورة عامة إن فترة العصر الجاهلي لم تتعرف أي نظام بوليسي في شبه الجزيرة العربية. فإذا نظرنا الى شمال ووسط شبه الجزيرة لتبين أن المراكز التي يسودها طابع التمدن، مكة مثلاً- لم تعرف نظام الخدمة العامة، بمعنى وجود موظفين يؤدون واجبات محددة للعامة مقابل بدل نقدي يدفع إليهم. كذلك لم تكن هناك مؤسسات رسمية مثل الشرطة ونظام المحاكم للقيام بمهام حفظ الأمن والنظام، أو لتطبيق العقوبات المختلفة بحق المذنبين والذين يحاولون خرق القانون أو التقاليد المحلية المتعارف عليها[١٤]. ففي المجتمع المكي نجد أن زعماء القبائل مثل بني هاشم وبني مخزوم، كانوا يقومون بمهمة توفير الأمن والاستقرار لأفراد قبائلهم. وإذا حدث، ان ارتكب أحدهم جريمة قتل مثلاً، فإن على هؤلاء الزعماء مهمة حل النزاع بين جماعة القاتل وجماعة المقتول، وذلك بدفع الدية (مبلغ معين من المال أو جمال أو ما الى ذلك مما له قيمة عالية) لأهل القتيل[١٥]. أما فيما يتصل بالأجانب الذين يضطرون الى العيش في مكة، فإنهم يكونون بحاجة الى الحماية، ولا يتم ذلك إلا عن طريق الاحتماء بأحد زعماء القبائل، وهذا ما كان يعرف عند أهل العصر الجاهلي، بنظام التحالف. من الأمثلة التي يمكن إيرادها للتدليل على هذا النظام، ماحدث لياسر بن عامر، حين قدم الى مكة للعيش بها في السنة الخامسة للبعثة، حيث احتاج ياسر الى الحماية، ووجدها في جوار أبي حذيفة المخزومي[١٦].

كذلك نجد أنه عندما عاد المسلمون من الحبشة، احتاجوا الى حماية أنفسهم وأموالهم من أهل قريش المعادية للإسلام في بداية الدعوة. كما تظهر أهمية التحالف فيما حدث لأحد المسلمين الأوائل وهو عثمان بن مظعون، الذي حصل على حماية (جوار) الوليد بن المغيرة زعيم قبيلة بني مخزوم، وحدث بعد

فترة أن طلب عثمان من الوليد أن يلغي حمايته له، وحين علمت قريش بذلك، نال سفهاؤها من عثمان، بل وصل الإيذاء الى حد القتل[١٧]. هذه الأمثلة التي أوردناها على سبيل المثال لا الحصر، تبين انعدام وجود المؤسسة البوليسية (الشرطة) من المجتمع المكي، حيث يشكل زعماء القبائل الجهة الوحيدة القادرة على توفير الأمن وصد الأذى عمن يدخلون في حمايتهم.

أما الأعراب، فإنهم –كما هو معلوم–يعيشون في مجتمع قبلي مغلق، تشكل فيه القبيلة المجتمع ذاته، ولا يعرف أفراده له بديلاً. في هذا المجتمع، يتزعم الرؤساء القوة العسكرية حين يقررون القيام بغزو قبيلة أخرى. وفي وقت السلم يجتمع هؤلاء الزعماء للتشاور فيما يتصل بأمور حياتهم المعاشية من نزاع وصلح وغيرها من الأمور[١٨]. وحيث إن حياتهم تعتمد أساساً على الترحال الى مواطن الماء والكلأ، فإن أمر حماية القبيلة في الحل والترحال يعود الى أفراد القبيلة أنفسهم، فهم مدنيون وقت السلم، وجنود حين القتال، وبالتالي ليست هناك حاجة لإقامة أية مؤسسة عسكرية مثل الشرطة في هذا المجتمع.

وبما أن القبيلة ليست مقيدة بموطن معين كما هي حال الحواضر، فإن القبيلة تستطيع مغادرة المكان حال تعرضها لخطر لا قبل لها به، كأن تتعرض لاعتداء قبيلة تفوقها عدة وعدداً. ولعل الاستثناء الوحيد ما ذكره القلقشندي من قيام الأشعث بن قيس حرس خاص به لحمايته أينما يذهب، وذلك بعد أن أصبح زعيم قبيلة كندة[١٩].

وفي بلاد اليمن، فإن الوضع يختلف تماماً عما هو عليه في شبه الجزيرة العربية فالنظام السياسي يقوم على الملكية التوارثية، حيث تنتقل السلطة من الأب الى الابن. لذلك أصبح من الطبيعي أن يظهر نظام مختلف. فالملوك كانوا

بحاجة ماسة الى الحراس لتوفير الأمن الشخصي. وتبعاً لما أورده الطبري، فان ملك اليمن ويدعى ذو الشناتر، كان يضع الحراس في القصر لحمايته[٢٠].

من هذا كله يتضح أن المؤسسة العسكرية ممثلة بالشرطة، والمسئولة عن الأمن لم تظهر بصورة الشرطة، بل صورتها البدائية ممثلة بالحرس، كما حصل في بلاد اليمن، التي إقتصر دورها على توفير الأمن الشخصي للملوك وليس للعامة أو للمجتمع. وفي مقابل ذلك، لا نكاد نعثر على شيء من ذلك أو غيره في شمال الجزيرة العربية.

٢. نظام البوليس عند البيزنطيين والفرس:

قبل الحديث عن دور الشرطة كمؤسسة في المجتمع الأسلامي، نجد من الضروري، التعرض – باختصار– لنظام البوليس عند كل من البيزنطيين والفرس، وعلة ذلك ان العرب – كما أسلفنا– لم يعرفوا مثل هذا النظام في مجتمعاتهم القبيلة، وعليه يكون من المعقول الاستنتاج أنهم استعاروها إما من الإمبراطوريتين البيزنطية والفارسية أو من إحداهما، من خلال التواصل بأنواعه المختلفة كما هو معروف في التاريخ.

إعتماداً على المصادر التاريخية يمكن القول بان العصور المتأخرة للإمبراطورية الرومانية قد شهدت أنظمة بوليسية متباينة. فالنظام البوليسي في مدينة روما مثلاً، مختلف عما هو عليه في مصر وغيرها من مدن الإمبراطورية. وعلة ذلك أن مهام حفظ الأمن والنظام كانت مناطة بأكثر من جهة، فضلاً عن عدم التساوي في الكفاءة العملية في هذه الجهات، كان جنود الإمبراطورية يقومون بحفظ النظام الداخلي. إذ يظهر أن البوليس المحلي في مدينة روما لم يكن على مستوى عال من الكفاءة تؤهله لحفظ المن والنظام، مما اضطر

السلطات الى الإعتماد على الحرس الإمبراطوري، وشرطة المدن والمراقبين الداخليين. باختصار، لقد شكّلت طبقة الجند العمود الفقري للمؤسسة البوليسية الداخلية المناط بها حفظ النظام وتحقيق الأمن[٢١].

((يقوم الجنود بجميع المهام المتصلة بالأمن. فلقد كانوا يقبضون على المزورين، وفي الوقت ذاته يتسترون على هروبهم، كما مارسوا دور المخبرين، وعملوا كجواسيس سياسيين تحت مسميات مختلفة. وبذلك نالوا سمعة مقيتة بين عامة الشعب الروماني. ولم يكن الجنود يترددون في اغتصاب مدخرات الأهالي من المؤن والذخيرة والأموال في أثناء الأوقات العصيبة كالمجاعات وغيرها، كما لا ينسى دورهم في القبض على النصارى في أثناء زمن التعذيب، وكذلك كانوا يقومون بسحق كل تمرد يقوم به الشعب))[٢٢].

ويتابع مكمولن Macmullen سرده لدور الجند في الامبراطورية الرومانية بالقول، إن مصر قد شهدت – في أثناء الحكم الروماني– دوراً متعاظماً للجند، تخطى الحدود المتعارف عليها بالنسبة للمهام التي يقوم النظام البوليسي بها عادةً[٢٣]. فالجند كانوا ينصبون أنفسهم قضاة، فيصدرون الاحكام في القضايا الصغيرة التي تنشب غالباً بين العامة. وفي أحيان كثيرة لا يترددون في الأستيلاء على بعض المناصب الأدارية في الدولة[٢٤].وهناك فئة معينة من الضباط تسمى Stationstii، كانت تقوم بمهام متعددة، منها مطاردة المجرمين وإيداعهم السجن حين القبض عليهم، وتوفير الحماية لأماكن الإقامة للحكام. وتنفيذ مصادرة ممتلكات الكنيسة[٢٥]. ومن الملاحظ أنه في حين كانت القوات العسكرية تقوم بدور البوليس في المدن، كانت قوات الحرس الإمبراطوري تتولى المهمة ذاتها في مدينة روما نفسها.

هـذا التوزيـع العـسكري يعـود في الحقيقـة، الى التطـور الـذي حـدث في إدارة الإمبراطورية الرومانية. ففي مرحلة نشأة الإمبراطورية كانت التقاليـد العـسكرية راسخة حيث كانت القوات المسلحة (الجـيش) تقـوم بـدورها المعهـود في حفـظ الأمن والنظـام. ومـا أن حـلّ عهـد الإمبـارطور ثيودوسـيوس Theodosius (٣٧٩–٣٩٥م)، حتـى قـام بتقـسيم الإمبراطوريـة إداريـاً الى أربعـة مقاطعـات اسماهـا Pracfctuea، وفي كـل مقاطعـة مـسئول رسمـي Praetorion Prefect كما تمّ تقسيم كل مقاطعة الى مناطق تسمى اسقفيات، والتي بـدورها قسمت الى ولايات محلية يرأسها حكام محليون[٢٦].

أما الحرس الشخصي والمعروف بالحرس الإمبراطوري، فقد تمّ الغاؤه علـى يد الإمبراطور قسطنطين، وحل محله ما يعرف بالحرس الامبريالي ( أو الحـرس الملكي )، ظناً من الإمبراطور بأن الحرس الجديد سـوف يكـون أكثـر ولاءً ممـن سبقه لشخص الإمبراطور[٢٧]. وسرعان ما أصبح هذا الحرس الجديد أهم وأخطـر فرقة في الجيش البيزنطي، مما ترتب عليه طغيان الواجب العسكري على المهمة الأصلية التي من أجلها أُنشيء الحرس، وهـي مهمـة تـوفير الحمايـة الشخـصية وتأمين سلامة الإمبراطور. الأمر الذي دفع الإمبراطور الى اختيـار كتيبـة سميـت Palatini، تركزت مهمتها في المرافقة الدائمة للإمبراطور والسهر على حمايتـه الشخصية[٢٨]. أما رئـيس الـوزراء Magister Officiorum، فيـأتي علـى رأس الإدارة في الدولة البيزنطية، وبذلك يعمل جميع الحراس تحت إمرته، وعليه يكون رئيس الوزراء هو المسئول رسمياً عن سلامة الامبراطور شخـصياً[٢٩]. أمـا توفير الأمن للعاصمة فقد أنيطت بمسئول رسمي متخـصص لهـذه المهمـة، ولا

يوجد شبيه لهذا المنصب في جميع المقاطعات الأخرى، وذلك نظراً لأهمية العاصمة وضرورة استقرار الأمن واستتباب السلام[30] .

بعد هذا الوصف الموجز للترتيبات البوليسية في الإمبراطورية البيزنطية، يتضح أن للرومان باعاً طويلاً في التنظيم الإداري المتصل بالأمن، فالإمبراطور كان يتمتع بحماية حرس شخصي مدرب ومنظم، تحول فيما بعد الى أهم كتيبة عسكرية في الجيش، كما مارس هذا الحرس في الوقت ذاته، مهام بوليسية متعددة.

من جهة أخرى تدل الشواهد التاريخية على أن الإمبراطورية الساسانية قد عرفت الحرس الشخصي، ولكن تبقى قضية النظام البوليسي بحاجة الى شيء من التمحيص. ففي إحدى حواشي كتابه حول الإمبراطورية الساسانية، كتب كرستنسين Christensen، أن المعلومات الواردة حول النظام البوليسي لدى الساسانيين جد قليلة، كما يستدل على ذلك من أحد الكتب المتبقية من الاڤيستاAvesta وهو كتاب زرادشت المقدس، حيث تذكر الاڤيستا بعض المعلومات حول وجود ضباط من البوليس مهمتهم مراقبة قواعد البيع والشراء في الأسواق الشعبية، وكان سلاح هؤلاء الضباط عبارة عن قضيب شائك[31] . وهناك الحرس الشخصي الذي يتولى مهمة حماية الامبراطور داخل وخارج القصر. تبعاً لما أورده الطبري، فإن حراس الامبراطور الساساني من الحذر بحيث كانوا يحرسون حتى الغرفة الخاصة بلامبراطور[32] . وهؤلاء الحراس يتلقون أوامرهم من رئيسهم الذي يشكل همزة الوصل بينهم وبين الامبراطور[33] . وفي بعض الأحيان يلعب هؤلاء الحراس دوراً رئيسياً في التخلص من الامبراطور، وخصوصاً إذا لم يكن الولاء على تلك الدرجة من المتانة[34] . ومع ذلك هناك من

يحرص كل الحرص على توفير الأمن للامبراطور، ألا وهو قائد الجيش الإمبراطوري، الذي لايتردد في التدخل عند حدوث اللحظات الحرجة[٣٥]. كل ذلك لا يمنع من أن يكون للامبراطور احترام وهيبة لدى حرسه الخاص، إذ يقفون بين يديه بالرماح والسيوف، وينحنون له احتراماً عند مروره بينهم[٣٦]. هذا الحرس الخاص لا يكون إلا بأعداد كبيرة جداً. ففي عهد ابرويز مثلاً، بلغ تعداده ستة آلاف حارس[٣٧]. وكما أسلفنا، ليس بالضرورة توفر الولاء عند هؤلاء الحراس، وفي بعض الأحيان، حتى رئيس الحرس قد لايكون على درجة عالية من الولاء والاخلاص لمليكه[٣٨]. وفيما يتصل بالنظام البوليسي، فان المصادر التاريخية لا تكاد تذكر شيئاً عنه، سوى القليل من المعلومات الغامضة وغير المؤكدة حول ما يسمى برئيس البوليس، الذي يختلط منصبه بصورة أو بأخرى بمنصب رئيس الحرس الامبراطوري.

تبعاً لما أورده كريستنسين، فإن الحرس الامبراطوري يرافق الامبراطور بشكل متصل حتى حين يقوم الأخير بزيارة لأحد وزرائه مثلاً. وعلى رئيس الحرس أن يقود ما لايقل عن ثلاثمائة فارس، ومائة من المشاة ليرابطوا عند بيت المضيف حتى الغروب[٣٩]. وعلى مايبدوا أن كريتنسين قد اختلط عليه الأمر حين أورد هذا المثال للتدليل على مهام الحرس الإمبراطوري، ووضع رئيس الحرس الإمبراطوري بمكانة رئيس البوليس.

كذلك أورد كريستنسين دوراً آخر لما أسماه برئيس البوليس، وهو في حالة انتصار الجيش في إحدى المعارك مثلاً، فان الإمبراطور يقيم حفلاً عظيماً بهذه المناسبة، وفي الجزء السفلي من القاعة الرئيسية حيث يجتمع العامة، فإن رئيس البوليس يكون له المقام الأول فيها[٤٠].

مما سبق، يمكن القول إن العهد الساساني لم يعرف سوى الحرس الإمبراطوري الخاص، أما النظام البوليسي الذي يتولى مهام الأمن والاستقرار في المجتمع، فلم يكن مكتمل الأركان، وإن كان من الصعب إنكار وجوده، حيث يحتاج كل مجتمع الى قوة ما تحفظ له الأمن بالضرب على أيدي العابثين.

بالنسبة للمناطق الحدودية، فإن المصادر التاريخية تشير الى كلا من البيزنطيين والساسانيين كانا يعتمدان على الغير لحماية مناطقهم الحدودية، فيصطنعون الاتباع ويقتطعون لهم الأراضي للإستقرار في تلك المناطق. فالساسانيون كان لديهم اللخميون، والغساسنة عند البيزنطيين، وكانت العلاقة بين الطرفين علاقة تبعية بصفتهم جزءاً من الإمبراطورية، فاللخميون كانوا يقومون بزيارة أسيادهم من بني ساسان سنوياً[٤١]. وكان الساسانوين يطلقون على اللخميين لفظ عامل او حاكم[٤٢]، والوضع نفسه يسري على الغساسنة وعلاقتهم بالبيزنطيين.

خلاصة القول، إن الاحتمالات الواردة بشأن انتقال مؤسسة الشرطة الى العالم الإسلامي تتقوى كثيراً نظراً للعلاقات القائمة بين العرب والأقاليم البيزنطية كمصر وسورية. فالتشابه في طبيعة عمل هذه المؤسسة امر لا يمكن تجاهله كما سنتبين لاحقاً، كما لايخفى التأثير الفارسي في التنظيمات الإدارية في العصر العباسي.

الهوامش:

* ويقصد بها الدراسة التي تبحث في أصل وتاريخ المصطلح .

[1] ان وجهة نظر شاخت في orientalia,v.١٧,١٩٨٤,pp٥١٥-١٩

[2] E.tyan,histori de l,organization judiciaire en pays d,islam, harissa, ١٩٤٣

[3] شاخت، المرجع السابق، ص٥١٧.

[4] Tyan,op.cit, v. ii, pp.٣٦٣-٧.

[5] الزمخشري، أساس البلاغة (القاهرة، ١٩٢٢)، ٤٨٦/١.

[6] ابن منظور، لسان العرب (القاهرة، ١٣٠١هـ)، ٢٠٢/٩.

[7] الزمخشري، المرجع السابق، ٤٨٦/١.

[8] صحيح مسلم (القاهرة، ١٩٣٠)، ٢٤/١٨. ومسند أحمد بن حنبل (القاهرة، ١٩٥١)، ٩١/٦-٩٢.

[9] محمد الرازي، مختار الصحاح (بيروت، ١٩٦٧)، ص٣٣٤.

[10] ابن الأثير، غريب الحديث والأثر (القاهرة، ١٩٦٣)، ٤٦٠/٢

[11] ابن منظور، المرجع السابق، ٢٠٢/٩-٢٠٤. وقارن مع yan,op.cit, v. ii, pp.٣٦٣-٤

[12] م.جواد، مجلة الشرطة والأمن، (بغداد، ١٩٦٣)، الجلد الأول، ص١٥-١٧.

[13] يعود الفضل الى البرفسور j.d.latham في عرض هذه الملاحظة.

[14] جواد علي، المفصل في تاريخ العرب قبل الاسلام، (بيروت، ١٩٧٠-١٩٧٥)، ٢٤٦/٥.

[15] C.brockelmann,history of the Islamic peoples, London, ١٩٤٩,p٥

[16] معارف،ص٢٥٦.

[١٧] أنساب، ١/٢٢٩.

[١٨] جواد، المرجع السابق، ص٢٣٨ .

[١٩] القلقشندي، صبح الأعشى،(القاهرة، ١٩٦٣)، ١/٤١٦.

[٢٠] الطبري، مجلد ١-٢/ ٩١٨-٩١٩.

[٢١] R.macmullen, soldier and civilian in later roman empire, Cambridge, mass., ١٩٦٣, p.٥٠

[٢٢] المرجع السابق، ص٥١.

[٢٣] المرجع السابق، ص٥٤.

[٢٤] المرجع السابق، ص٥٥.

[٢٥] المرجع السابق، ص٥٥-٥٦.

[٢٦] حسين مؤنس(مترجم)، الإمبراطورية البيزنطية، د.ت، ص١٤٨.

[٢٧] G.ostrogorsky, history of the Byzantine state, (oxford, ١٩٥٦), p.٣٩

[٢٨] المرجع السابق.

[٢٩] مؤنس، ص١٥٠.

[٣٠] المرجع السابق، ص١٥١.

[٣١] .a. Christensen, l,iran sous les sassanides (Copenhagen, ١٩٤٤), p.١٢٧

[٣٢] الطبري، ١-٢/ ١٠١٣-١٠١٤.

[٣٣] المرجع السابق، ص١٠١٥.

[٣٤] المرجع السابق، ص١٠٤٢.

[٣٥] المرجع السابق، ص١٠٤٧.

[٣٦] المرجع السابق، ص١٠٦٣.

[٣٧] حمزة الأصفهاني، تاريخ سني ملوك الأرض والأنبياء،(بيروت، ١٩٦١)، ص٥٣.

[38] الطبري، ١-٢/ ١٠٦٢.

Christensen, p.٤٠٧ [39]

[40] المرجع السابق، ص٤١٢.

[41] الطبري، ١-٢/ ٩٤٦.

[42] المرجع السابق، ذات المجلد والصفحة، وكذلك على، المرجع السابق، ٥/١٩٩.

# قراءة نقدية لكتاب (الخوارج أولى الفرق في تاريخ الإسلام) لمؤلفه الدكتور ناصر العقل، الطبعة الأولى، الجزء الأول، سنة ١٤١٩هـ، عدد الصفحات ١٢٨.

الدكتور أحمد عبدالعزيز

المشكلة الأساسية التي تعرض في دراسات تأريخية كدراسة الدكتور (ناصر العقل)، عبارة عن الاتيان بالتعميمات في مظان الكتب في أكثر من الأحيان، معتمد على النقول عن المصادر والمراجع التأريخية، باعتبارها جاءت بالأصل والجديدفي دراسته، مع العلم أنه لم يأتِ بشيء جديد يستحق ذكرها، وقد تناول دراسته عن نشأة الخوارج واعتبارهم أولى الفرق في تأريخ الاسلام، ويتطرق الى تأريخ نشأتهم وعقائدهم.

ولكن السؤال التي يطرح نفسه في مثل هذه الحالات هو: هل استطاع الباحث الدكتور الناصر، ان يتجاوز الدراسات السابقة فعلاً في هذا المضمار، أم أنه رغم اسهابه بقي في نطاق ماكتب؟ وبكلمة أخرى: هل كان هناك مبرر موضوعي للكتابة عن الخوارج بالشكل الذي كتب هو به عنهم؟

يذكر الدكتور الناصر في مطلع دراسته انه لم يفرد أحد الخوارج ببحث متكامل في ما عدا (Wellhausen) ولها وزن الذي يرى هو مستنداً في ذلك الى (Sauvaget) ان كتابه الخوارج والشيعة سيء العرض ويصعب استخلاص النتائج العامة فيه. والأمر ليس كما ذكره، فالخوارج درسوا على الأقل فيما يتصل بنشأتهم مراراً وتكراراً وبشكل جاد كما يريد هو والغريب ألا يعرف

الدكتور الناصر وهو ينقل عن (Brunhow) بعض آرائه فيهم انه أول من كتب عنهم كتاباً مستقلاً[٢] بالالمانية إذ توصل فيه الى نتاءج تجاوز فيها بعض نظرات (Wellhausen) الذي كتب بعده، ولهاوزن نفسه لم يذكر الخوارج في كتابه المذكور فقط، بل تحدث عنهم طويلاً، في دراستين صدرتا له فيما بعد[٣]. وفي هذا القرن صدرت دراسات كثيرة في الموضوع نفسه، نذكر منها هنا أهمها، ففي عام ١٩٥٢م صدرت دراسة المستشرقة الايطالية المعروفة L. Vaglieri بعنوان (خلاف علي ومعاوية وخروج الخوارج في ضوء المصادر الاباضية). ثم صدرت في العامين ١٩٥٩، ١٩٦٣م دراستا (Petersen) اللتان جلبتا الكثير من المشكلات فيما يتصل بمصادر المؤرخين العرب المسلمين عن تأريخ تلك الفترة، وماهية الصورة التأريخية التي كانت تحكم المدارس التأريخية المختلفة[٤]. يضاف الى دراسات (Lewicki) القصيرة والمتعددة عن شتى النواحي في حياة الخوارج الفكرية في فترتهم المبكرة، ثم دراسة Schacht و Van Fss و Hinds، أما شاخت وفان اس، فقد تناولا مخطوطات الاباضية الموجودة في الجزائر وغيرها بالدراسة والتقيم. وأما Hinds فقد اعاد تقويم كل ماكتب حول الموضوع أخيراً في دراسات صدرت له يبدو أو يعتقد أنها فصول مختلفة من أطروحته للدكتوراه أو اعتمد على الاخرين[٥]. العنصر الجديد التي دخل الى مجال دراسة تأريخ الخوارج تمثل في تجاوز المصادر من جانب واحد. منذ دراسات فاغليري صارت الخوارج لدى الباحثين مادة كتبها الاباضية أنفسهم، كسير الشماخي، وطبقات البرادي، والورجلاني وصحيح الربيع بن حبيب، هذا فضلاً عن الكتب الفقهيه الكثيرة طبعت أخيراً. ومن خلال دراستي للخوارج وكتب هؤلاء يبدوا لي ان أبحاث Hinds الأخيرة حلت ماتبقى من اشكالات ولم تعد هناك حاجة الآن على الأقل، لكتابة المزيد فيما يتصل بنشأة الخوارج.

لقد سلط الباحث المذكور الأضواء لأول مرة على تركيب المجتمع العربي الاسلامي الناشيء في الكوفة والبصرة سواء بسواء، وحاول استناداً الى معطيات تحليل التركيب هذا أن يفهم فهماً جيداً للمشكلات التي واجهها هذا المجتمع دون أن ينسى السياق العام للتطور الذي كانت تمر به الدولة العربية الإسلامية كلها أيامئذ. كانت هناك صراعات قبلية حادة داخل المجتمع العربي الإسلامي العراقي، وصراعات بين من نزلوا المدن أولاً ومن نزلوها فيما بعد، ثم صراعات بين هؤلاء وبين السلطة المركزية التي كانت تريد تشديد قبضتها، وكان أهل الايام وأهل القادسية وأهل السابقة من ناحيتهم يريدون السيطرة على الاراضي المفتوحة وتقسيمها فيما بينهم. وذهب الخليفة عثمان بن عفان رضي الله عنه ضحية لمحاولته السيطرة بشكل أوسع على القبائل في العراق، وان نزاع من يسمون (بالقراء) مع سعيد بن العاص والي الكوفة حول ملكية السواد وهل هو (بستان لقريش) أم انه ملك (رماح الفاتحين) هو خير معبر[٦]. عما كان يتمخض عنه المجتمع العراقي من تيارات القلق والتغيير المستمر بين مدة وأخرى. وهكذا فان (القراء) والثوار أو المعارضين الذين شاركوا في قتل الخليفة عثمان (رض) ما أملوه، ولم يقسم السواد، ثم عاد الى ماشكوا منه أيام الخليفة عثمان (ر.ض) بأن عين هو أقاربه أيضاً الولاة في الأمصار، ثم يتفاوض مع معاوية حقنا للدم، عندما كان ذلك كله خرج قسم من الثوار على الخليفة أبي تراب (ر.ض) عليه، كما خرجوا على الخليفة عثمان (ر.ض) من قبل، بين هؤلاء كان قراء قليلون، لكن هؤلاءلم يساهموا بدور أساسي في الخروج إذ إنقسمو الى ثلاثة أقسام رئيسية: قسم قاتل مع معاوية بقيادة شرحبيل بن السمط الكندي، وقسم كبير قاتل مع علي بقيادة الأشتر النخص وحجر بن عدي، وقسم ثالث اعتزل القتال وحاول الإصلاح بين الطرفين[٧].

